

# ديموكراسی وەک ڕەگەزێکی نوێ لە ئاسایشی نەتەوەیی دا

لە ڕوانگەی قوتابخانەی کۆپنهاگن

(شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن)

نەجات عەلی

MUKIRYANI

ئەم کتێبە لە بنەڕەتدا  توێژینەوەی ماستەرە کە

بەسەرپەرشتی

د. موسا کەڤاڵ، پێشکەشی

کۆلێژی یاسا و زانستە سیاسییەکان

بەشی زانستە سیاسییەکانی

زانکۆی سەلاّحەددین کراوە.

پێشکەشە......

بەو کەسانەی کە خەمییان دیموکراسی و ئاسایشی کۆمەڵگەیە...

# ديموكراسی وەک ڕەگەزێکی نوێ لە ئاسایشی نەتەوەییدا

## لە ڕوانگەی قوتابخانەی کۆپنهاگن

(شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن)

نەجات عەلی

٢٠١٤

**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

- **دیموکراسی وەك رەگەزێکی نویٚ لە ئاسایشی نەتەوەییدا** لە روانگەی قوتابخانەی **کۆپنهاگن (شیکردنەوە و هەڵسەنگاندن)**
- **نەجات عەلی**
- **نەخشەسازی ناوەوە: رێدار جەعفەر**
- **بەرگ:رێمان**
- **نرخ:** (٤٠٠٠) دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٤
- **تیراژ:** (٧٥٠) دانە
- **چاپخانەی: موکریانی (هەولێر)**
- لە بەرێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٤٦١) ساڵی (٢٠١٤)ی پیٚ دراوە.

MUKIRYANI
ESTABLISHMENT FOR RESEARCH & PUBLICATION

**زنجیرەی کتێب (٨٧٠)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## پێشەکی:

لە ڕاستیدا هۆکاری بوونی دەوڵەت، پارێزگاری کردنە لە ماف و ئازادی و ئاسایشی تاکەکان، هەروەها بەرگری کردنە لە ناسنامە جیاجیاکانی تاك و گروپە کۆمەڵایەتییەکان، بەڵام تا ئێستاش دەوڵەت نەیتوانیوە بەشێوەیەکی ڕەها ئاسایش بۆ هاووڵاتیان دابین بکات. چەمکی دەوڵەت و ئاسایش بەردەوام لە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەر و بگۆڕ، گۆڕانیان بەسەر داهاتووە، دوای ئەو ڕووداو وگۆڕانکاریانەی کە بە درێژایی مێژوو ڕوویاندا بەتایبەت لە سەردەمی ئێستادا بەهۆی دیاردەی بەجیهانیبوون و پێشکەوتنەکانی زانست، تەکنەلۆژیا، هەروەها شۆڕشەکانی زانیاری، پەیوەندی، گەیاندن هەندێ هەڕەشەی نوێ بۆ سەر دەوڵەت زیاد بووە، وەك: دیاردەی تیرۆر، کۆچ، دەستێوەردانی مرۆیی، قاچاغچییەتی، نەخۆشی، هەژاری، ماددەی هۆشبەر، پیسبوونی ژینگە، هەربۆیە دەوڵەت لە هەموو کات زیاتر تووشی قەیران بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەوڵەتانەی کە خاوەنی سیستەمێکی دیموکراسین، باشتر توانیویانە ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان بپارێزن، چونکە توانیویانە لە ڕێگەی دابینکردنی ماف و ئازادییەکان وابکەن هاووڵاتیان بەشداربن لە دابینکردنی ئاسایش لە تەك دەوڵەتدا.

پێشتر تاکە سەرچاوەی ئاسایش دەوڵەت بوو و هەر دەوڵەتیش سنوورە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتوورییەکانی دەست نیشان و کۆنتڕۆڵ دەکرد و ڕەوایەتیشی بەخۆی دەدا، بەڵام لە ئێستادا چەندین ئەکتەری تر لە سیستەمی نێونەتەوەیی لە ئاستی ناوخۆ و دەرەوە ڕۆڵیان هەیە لەسەر ئەو پرس و بابەتانەی کە پێشتر تەنیا لە سنووری دەسەڵات و بڕیاری دەوڵەت دابوو. کێشەی دەوڵەت لە ڕابردوو

سەرهەڵدانی قەیران و ناسەقامگیری و نەبوونی ئاسایش و یان هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی بوو، بەڵام لە ئێستادا ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، ڕاگەیاندن، بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و ڕێکخراوە جیاجیاکانی تر، ڕۆڵیان هەیە لە چارەسەرکردنی کێشەکان لە پاڵ دەوڵەتدا، بۆیە لە ئێستادا وەك ئەوەی (باری بۆزان- Barry Buzan) دەڵێت ئاسایش تەنها بە دەوڵەت دابین ناکرێت، بەڵکو دەبێ کۆمەڵگەش لەتەك دەوڵەت ببێت بە سەرچاوەی ئاسایش، چونکە زۆربەی کێشە و هەڕەشەکانی ئاسایش کۆمەڵگەیین، کە دەرئەنجامی پێکدادانی ئابووری، ژینگەیی و ناسنامەیین، چونکە لە ناوخۆ پێکدادان و ململانێ هەیە لە نێوان هێز و گروپە جیاوازەکان، کە هەندێکجار دەوڵەت تەنیا گرنگی بە ئاسایشی لایەنێك دەدات و ئەوانی تر دەخرێنە پەراوێز، ئەمەش دەتوانێت ئاسایشی نەتەوەیی بخاتە ژێر هەڕەشە. لە دەوڵەتێکی دیموکراسیدا، لە ڕێگەی بەشداریکردنی ئازادانە و بەبێ جیاکاری هاووڵاتیان لە کاروباری گشتی، دەوڵەت دەتوانێت خاوەنی ڕەوایەتی و سەقامگیری و ئاسایش بێت، ئەمەش وا دەکات لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە، هاووڵاتیان پشتیوانی لە بڕیار و سیاسەتەکانی دەوڵەت بکەن، چونکە لە بنەمادا ئاسایشی دەوڵەت لەسەر بنەماکانی دیموکراسی دارێژراوە وەکو: یەکسانی، دادپەروەری، دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات، مافە مەدەنی و سیاسییەکان، ئازادی، سەروەری یاسا و ... هتد. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم پەیوەندییەش هەوڵ دەدەین دیموکراسی وەك ڕەگەزێکی نوێ بۆ ئاسایشی نەتەوەیی بە کەڵك وەرگرتن لە چوارچێوەی تیۆری قوتابخانەی کۆپنهاگن بۆ ئاسایش، بخەینەڕوو و شیکردنەوەی بۆ بکەین.

## ٢ـ چوارچێوەی تیۆری

كتێبی بەناوبانگی (باری بۆزان) واتە (خەڵك، دەوڵەتان و ترس)* یان بەرنامەی كارێك بۆ خوێندنەوەی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە سەردەمی دوای شەڕی سارددا بە یەكێك لە گرنگترین بەرهەمە تیۆریەكانی قوتابخانەی كۆپنهاگن لە بواری ئاسایشدا دادەنرێت. لە قوتابخانەی كۆپنهاگن ئاسایش فرە ڕەهەندە، لەم قوتابخانەیە ڕەخنە لە ڕوانگەی ریالیزم دەگرن كە تەنیا ڕەهەندێكی سەربازییە و بڕوایان وایە كە ئاسایشی تاك ڕەهەندی ئەمڕۆ بوونی نییە، بەڵكو ئاسایش بۆ ڕەهەندی سەربازی، كۆمەڵگەیی، ئابووری، ژینگەیی و كلتووری بەرفراوان بووە. هەروەها لە قوتابخانەی كۆپنهاگن دا هەڕەشە و مەترسیەكان لەسەر بنەمای كۆمەڵگە دەست نیشان دەكرێن كە وەكو دەوڵەت سەرچاوەی ئاسایشە. باری بۆزان و وەیڤەر لەزانایانی ئەم قوتابخانەیەن كە گرنگی تایبەت بە پرسی ناسنامە دەدەن (لاريجانی و اميری مقدم، ٢٠٠٨: ل١٥٣). چونكە كۆمەڵگە بە سروشتی خۆی لە چەندین پێكهاتەی جیاواز پێك دێت كە هەر پێكهاتەیەك ناسنامە و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیە. هەندێكجار پەیوەندی و كارلێكی ئەم پێكهاتە جیاوازانە بەهۆی سروشتی سیستەمی سیاسی و كۆمەڵایەتی جۆرێك لە ململانێی لێدەكەوێتەوە كە كاریگەرییان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەبێت (بۆزان، ٢٠٠٠: ص٧٧).

---

* بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە كتێبی (**خەڵك، دەوڵەتان و ترس**): بەگشتی ناوەڕۆكی ئەم كتێبە ئەوەیە كە لە حاڵێكدا بوارەكانی سیاسی، ئابووری، ناسنامەیی، ژینگەیی و سەربازی بۆتە هۆی ململانێی توندی دەوڵەتان، پرسیار ئەوەیە كە وڵاتان چۆن دەیانەوێت لەم ململانێیە ڕزگار بن، تەركیزی كتێبەكە لەسەر چۆنیەتی مامەڵەكردنە لە نێوان مەترسییەكانی ناوخۆ و هەڕەشە دەرەكییەكان، لە ڕوانگەی بۆزانەوە، زۆربەی پسپۆڕان تەنیا گرنگی بە ئاشتی و هاوكاری دەدەن و هەندێكی تر گرنگی بە هێز و كۆكردنەوەی هێز دەدەن، بۆزان و هاوكارەكانی لە ساڵی (١٩٨٥) قوتابخانەی كۆپنهاگنیان دامەزراند.

قوتابخانەی کۆپنهاگن ئەوە ڕەتدەکاتەوە کە هەرچەندە ئاسایش زیاتر بێت باشترە، بەڵکو بڕوایان وایە لە بنەڕەتدا ئاسایشی باش نەرێنییە وەك شکستهێنانێك وایە لە ڕووبەڕوو بوونەوە و چارەسەری پرس و بابەتەکان لەبواری سیاسەتی ئاسایشی دا. لەم ڕووەشەوە سیاسەت دەبێت بتوانێت لەڕەوتی ئاسایی خۆی دا بابەت و پرسەکان چارەسەر بکات یان بەڕێوەیان ببات، بەبێ ئەوەی بکەونە خانەی ئاسایشەوە (عبداللەخانی،٢٠٠٦:ل٤٩٧). چەمکی بەئاسایشی کردن (Securitization) لەڕوانگەی قوتابخانەی کۆپنهاگن بەم مانایییە کە دیاردە و بابەتەکانی لە دۆخی ئاسایی بۆ دۆخی تایبەت دەگوازرێتەوە، واتە لەبواری سیاسەتە گشتییەکان (Public politics) یان سیاسەتە ئاساییەکان ( Normal politics) دەچنە بواری ئاسایش (عبدالله خانی، ٢٠٠٦: ل٤٩٢). لێرەوە دەردەکەوێت کە بەئاسایشی کردن، پێوەرێکە بۆ هەڵسەنگاندنی نەبوونی ئاسایش، واتە تا ڕێژە و ئاستی دیاردە و بابەتەکان زیاتر بە ئاسایشی بکرێت، ئەوە نیشاندەدات کە لەم کۆمەڵگەیەدا ئاسایش بوونی نییە (ڕوی،٢٠٠٣: ص٦٩٢).

بۆ شیکردنەوەی توێژینەوەکەمان هەوڵ دەدەین سوود لە چوارچێوەی تیۆری قوتابخانەی کۆپنهاگن بەتایبەت بیروڕای باری بۆزان وەربگرین. بۆزان پێداچوونەوەی بە کتێبەیدا کردووە لە ساڵەکانی (١٩٩١ و ٢٠٠٧). هەروەها چەند پرسێکی نوێ وەکو: کردەوەی گوتاریی، کێشەیی بوونی ئاسایش، ئاسایشی کۆمەڵگەیی، سەرچاوەی سەروو دەوڵەتی ئاسایش و هەروەها "ئاسایشی بوون" یان "ئاسایشی نەبوون"ـی بابەتەکانی هێناوەتە ئاراوە.

بەگشتی بۆزان باس لە (٤) چوار پرسی سەرەکی دەکات:

١. بە ئاسایشی کردن.
٢. ئاسایشی کۆمەڵگەیی (بەرجەستەکردنی ناسنامە ـ Societal Security).
٣. سەرچاوەی ئاسایش.
٤. شیکردنەوەی هەرێمی، واتە هەلومەرجی ناوچەیی.

لێرەدا هەوڵ دەدەین بە كورتی باسیان لێوە بكەین، بۆ ئەوەی بتوانین نیشان بدەین كە چیتر ڕەهەندی سەربازی تاكە ڕەهەندی ئاسایشی نەتەوەیی نییە و هەروەها بەسوود وەرگرتن لەم چوارچێوەیە ئەوە بسەلمێنین كە دیموكراسیش ڕەگەزێكی نوێیە لە ئاسایشی نەتەوەییدا.

## ١.٢. بە ئاسایشی كردن:

دوو چەمكی (بەئاسایشی كردن) و (بەئاسایشی نەكردن)، لە چەمكە سەرەكی و بنەڕەتییەكانی هزری بۆزانە لە لێكۆڵینەوەكانی بواری ئاسایشدا. لە ڕوانگەی بۆزانەوە بابەتەكان یان پرسە سیاسییەكان لەهەر كۆمەڵگەیەك بەسەر سێ دەستەدا دابەش دەكرێت:

١- پرسی ناسیاسی (كاروباری ناسیاسی): ئەو پرس و بابەتانەیە كە دەوڵەت دەستێوەردانیان تێدا ناكات و بابەتی بڕیاردانی گشتی یان گفتوگۆ و مشتومڕی گشتی نییە.

٢- پرسی سیاسی: ئەو پرس و بابەتانە دەگرێتەوە كە بەشێكە لە سیاسەت دانانی گشتی و پێویستیشی بە بڕیاردانان و تەرخانكردنی سەرچاوەی پێویست لەلایەن دەوڵەتەوە هەیە، ئەوەی پێویستی بە چاودێری و كۆنتڕۆڵ و تەدبیری بە كۆمەڵ هەیە.

٣- پرسی ئاسایشی: بەو كاروبارانە دەوترێت كە مانەوە و بوونی دەوڵەت دەگرێتەوە، ئەم كاروبارانە پێویستی بە میكانیزم و یان ڕێوشوێنی بە پەلە و هەروەها وەرگرتنی بڕیاری پێویست لە سەرووی ڕەوتی یاساییەوە هەیە.

ئەم سێ جۆرە لە پرسەكان دەتوانرێت ئاوا پۆلێن بكرێت:

١. ئاسایی. ٢. بوارێك. ٣. تایبەت. ٤. هەستیاری دەوڵەت. ٥. لوتكەی هەستیاری دەوڵەت.

هەروەکو دەبینین کاروباری ئاسایی هەموو کاتێك ناکەوێتە خانەی ئاسایشەوە، واتە هەمیشەیی نییە، هەروەها هەر بابەت و پرسێکی ئاسایی وەکو: کلتوور و ژینگە و... هتد، لەوانەیە لە پڕێك ببێتە بابەتێکی ئاسایشی، هەروەها بابەت و پرس و کاروباری ئاسایشی پەیوەندی بە بوار و کاروباری گشتیەوە هەیە یان سیاسەتی بەئاسایشی کردن کاتێك سەرکەوتوو دەبێت کە بتوانێت لە باوەڕی گشتیدا هەڕەشە لەسەر مانەوە و بوون بە مەترسی بۆ سەریان بچەسپێنێت، قەناعەت بە هەموان بێنێت کە مەترسی لەسەر مانەوەیان هەیە، هەروەها سیاسەتی بە ئاسایشکردن کاتێك تووشی شکست دەبێت کە سیستەم نەتوانێت قەناعەت بە کۆمەڵگە بێنێت کە هەڕەشە و مەترسیەکی ترسناك بوونی هەیە یان هەڕەشەیان لەسەرە (Mitten,2008:P23).

بە ئاسایشکردن پێویستی بە تەرخانکردنی سەرچاوەی پێویست و تایبەت و گرنگی پێدانە. بەپێچەوانەی کار و بابەتی ئاسایی یان تەنانەت سیاسیش کە دەتوانێت بە سوود وەرگرتن لە سیاسەت دانان، پێویستە بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە ڕەوتی خۆیدا بەڕێوەببردرێت. کاروباری ئاسایشی پێویستی بە ئەولەویەت دانانە (بۆزان، ٢٠٠٧: ص٥٢).

لێرەدا دەتوانین بڵێین بۆزان و هاوکارەکانی لە قوتابخانەی کۆپنهاگن، دەیانویست پرسە نائاسایشییەکان لە پرسە ئاسایشییەکان جیابکەنەوە و بە ڕوونکردنەوەی پرسەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی ڕێگە لە بەرکارهێنانی ئەم بابەت و بوارانە لەلایەن دەوڵەت وسەربازەکان بگرن کە پێگەی تایبەتییان هەیە، لە ڕوانگەی بۆزانەوە هەر کۆمەڵگەیەك کە تیایدا بواری کاروباری پرسەکانی ئاسایشی بەرفراوان بێت و بواری پرس و بابەتەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی بەرتەسك بکرێت، ئاست و ڕاددەی ئاسایش لەم کۆمەڵگایەدا لە خوارەوەیە و ئەم کۆمەڵگایە بەردەوام لە بەردەم دۆخی نائاسایشی یان نەبوونی ئاسایشدایە.

بەبڕوای بۆزان، ڕیالیستەكان بە هەڵە كۆمەڵگە لە حاڵەتی كێبڕكێ دوور دەخەنەوە و كلتووری ململانێ بەرفراوان دەكەن و گەشەی پێدەدەن، لە تەنیشت ئەوەشدا بەبێ گرنگی پێدان بەهێزی ئەكتەرەكان وەكو بەها جیهانییەكان و ڕەگەز و فاكتەرەكانی خوار نەتەوەیی، دەوڵەت بە تاكە ئەكتەر و كاریگەرترین فاكتەری گۆڕانكاری دادەنێن. بۆیە بۆزان ڕادەسپێرێت كە پێویستە لەلایەك لە بەئاسایشی كردنی بوارەكانی كۆمەڵایەتی و سیاسی دوور بكەوینەوە و لەلایەكی تر لە هەوڵدان بۆ كۆمەڵایەتی و سیاسی كردنی بابەتە ئاسایشییەكانیش خۆمان بپارێزین (مەبەست سیستەم و دەوڵەتە). لە ڕوانگەی بۆزانەوە ڕەهەندەكانی ئاسایش (ئاسایشی ئابووری، سەربازی، سیاسی، ژینگەیی و كۆمەڵگەیی) پێكەوە گرێدراون، واتە ئاسایشی سەربازی كاریگەری و دەرهاویشتەی سیاسی هەیە، سیاسەتی ئابووری گرێدراوە بە ئاسایشی سەربازی و پەیوەندی و ئاڵوگۆڕی ئابووری، ستراكچەری سیاسی و كۆمەڵایەتی دەخاتە ژێر گوشاری توندی سەروو نەتەوەیی بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ یاسا و ڕێسا جیهانییەكان (Betts,1997:P8-9). لەلایەكی ترەوە لە بارەی چۆنییەتی هەڕەشە و ئاسایش، پەیوەندی نێوان تاك، دەوڵەت و سیستەمی نێودەوڵەتی هەیە و هیچ كامەیان ئەولەویەتی بەسەر ئەوانی ترەوە نییە و ئەمەش بۆتە هۆی دروست بوونی فەزایەكی ئاسایشی كە پێكەوە گرێدراوە لەسەر ئاستی سیستەمی نێودەوڵەتیدا، كە كارو كردەوە لە بوارێكدا كاریگەری لەسەر بوارەكانی تر یان ئاستەكانی تردا دەبێت (Ayoob,1984:P43).

بۆیە لە ڕوانگەی بۆزان و هاوكارەكانی نابێت دەوڵەت بە هەر هۆكارێك یان پاساوێك بێت ڕەوایەتی بەخۆی بدات دەستنیشانی ئەو بوارانە بكات كە پێویستی بە ئاسایشی كردن نییە، وەك ئەوەی سیستەمە نادیموكراسییەكان دەیانویست بە بیانووی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی هەموو كایە كۆمەڵایەتییەكان كۆنترۆڵ بكەن، بەڵكو پێویستە كۆمەڵگا دەستنیشانی ئەو هەڕەشە و مەترسییانە بكات كە لەسەری هەیە، بەم مانایە كۆمەڵگا دەبێت بە پێی ئەولەویەتەكانی بڕیار

بدات چ بوارێك پێویستە كە بە ئاسایشی بكرێت. بۆزان گرنگی تایبەت بە پرسی ئاسایشی ناسنامەیی دەدات و پێی وایە كاتێك كۆمەڵگا ڕووبەڕووی هەڕەشە و مەترسی لەناوچوون دەبێتەوە، وەك هەڕەشە و مەترسییەكانی جەنگ، بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە كوشندەكان وەكو (**طاعون**)، هەژارییەكی سەخت، كارەساتی سروشتی و هەروەها توندوتیژی سیاسی و ... هتد، دەكرێت ئەم هەڕەشە و مەترسیيانە هەڕەشە و مەترسی راستەقینە و ژیانی بن بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی هەر دەوڵەتێك.

## ٢.٢. ئاسایشی كۆمەڵگەیی:

باری بۆزان (Barry Buzan)، چەمكی (هەڕەشەی كۆمەڵگەیی) بۆ یەكەم جار لە ساڵی (١٩٨٣)ـدا و لە كتێبی (خەڵك، دەوڵەتان و ترس) هێنا ئاراوە (بۆزان، ١٩٩٦: ص١٤٧). خاڵێك كە كەمتر گرنگی پێدراوە ئەوەیە كە بۆزان لەم كتێبەدا یەكێك لە ڕەهەندەكانی ئاسایش واتە ئاسایشی كۆمەڵگەیی (بە ناوەندیەتی ناسنامە) لە تەنیشت چوار ڕەهەندی تری ئاسایش (سەربازی، سیاسی، ئابووری و ژینگەیی) هەژمار كردووە، لە هەمان كتێبدا بۆزان بڕوای وایە كە ئاسایشی كۆمەڵگەیی یان ئاسایشی ئابووری سەربەخۆ نییە لە ئاسایشی دەوڵەت، كۆمەڵگا یان گروپە پێكهێنەرەكانی كۆمەڵگا وەكو: گروپە ئیتنیكی و مەزهەبییەكان، تەنیا یەكێك لەو ڕەهەندانەیە كە دەتوانێت مەترسی بێت بۆ سەر دەوڵەت، (١٠) ساڵ دواتر واتە لە ساڵی (١٩٩٣)ـدا، بۆزان و هاوكارەكەی (ئۆلێ وەیڤەر) كتێبی (ناسنامە، كۆچ و بەرنامەی كاری ئاسایشی مۆدێرن لە ئەورووپا)ـیان نووسی (Buzan and Waever, 1993: p43).

لەم كتێبەدا گرنگییەكی زیاتری بە (ئاسایشی كۆمەڵگەیی) دا، لە ئەنجامدا بۆزان لە تیۆری پێشتری خۆی لەبارەی ڕەهەندەكانی ئاسایشی دەوڵەت چاكسازی تیادا كرد و چاوپیاخشاندنەوەی بەم تیۆریە كرد و كۆمەڵگەی لە تەنیشت دەوڵەت

كردە سەرچاوەی ئاسایش و بەرزی كردەوە و لە تەنیشت دەوڵەتی دانا. بە دیوێكی تردا، لە تیۆری پێشتری بۆزان كۆمەڵگە یەكێك لە ڕەهەندەكانی دەوڵەت و ناسنامەی گروپەكان بە یەكێك لە بابەتەكانی دڵەڕاوكێ و نیگەرانی دەوڵەت دادەنرا، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٣)ـدا و لە دەرئەنجامی جەنگەكانی نەژادی و ئیتنی لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات (پاش هەڵوەشاندنەوەی یەكێتی سۆڤیەت)، كۆمەڵگە وەكو كۆی گروپە كۆمەڵایەتیەكان لەلایەك یەكێكە لە ڕەهەندەكانی ئاسایشی دەوڵەت و لەلایەكی تریش بەرز دەبێتەوە بۆ سەرچاوەی ئاسایش، لەسەر ئەم بنەمایە، یەكەم: ئاسایشی كۆمەڵگە خۆی لە خۆیدا گرنگی هەیە، لەبەر ئەوەی كە زۆر گروپ و كۆمەڵی هاووڵاتیان هەیە كە دەوڵەتیان نییە بەڵام هەڕەشە لە دژی ناسنامەكەیان ـ وەكو واقعێكی سیاسی ـ گرنگی هەیە، دووەم: لە زۆربەی كاتەكاندا سنوورە سیاسییەكان لەگەڵ جیاوازییە كۆمەڵایەتیەكان تەریب نییە یان هاوشێوەی یەك نییە، بەهۆی ئەوەی كە گروپە جیاوازە كۆمەڵایەتیەكان لەژێر ستەمی دەوڵەتانی خۆیاندان و زۆربەی كات، توندوتۆڵ بوونی ئاسایشی زۆرینە هەندێ كات هۆی یان نیشانەی لاوازكردن و لاوازبوونی ناسنامەی كەمینەیە. (Roe, 2005: p2). سێیەم: بابەتی ئاسایشی كۆمەڵگەیی (ناسنامە) گرنگی چۆنایەتی هەیە، ئاسایشی كۆمەڵگەیی گرنگی بەو مەترسیانە دەدات كە ژیانین، واتە ئەگەر گروپێك ناسنامەی خۆی لە دەست بدەن و چیتر (ئێمە)ـیەك نامێنێت كە بتوانێت گرنگیان پێ بدەن، ئەمە لە كاتێكدا كە لاوازی ئابووری، دواكەوتوویی سەربازی، ناكارامەیی سیاسی و كارەساتی ژینگەیی، بەجۆرێك لە جۆرەكان قەرەبوو دەكرێتەوە. خاڵێكی تر كە هەندێجار لە تیۆری بۆزان دەبێتە هۆی بە هەڵە تێگەیشتن ئەوەیە كە سنووری نێوان گروپی كۆمەڵایەتی و كۆمەڵگا لە ڕوانگەی بۆزان و هاوكارانی، هەر گروپێكی كۆمەڵایەتی كۆمەڵگەیی نییە و ناتوانین بڵێین كە بابەتی ئاسایشی كۆمەڵگەیە، گروپە كۆمەڵایەتیەكان دەبێت تا ئەو ڕادەیە گرنگ بن كە بتوانن بەشێوەیەكی سەربەخۆ لە دەوڵەت ببنە سەرچاوەی

ئاسایش، ئەم گروپانە دەبێت توانای ئەوەیان هەبێت کە وەکو یەکەیەك یان ئەکتەرێك لە شێوەی دەوڵەت بەشدار بن لە سیستەمی نێونەتەوەیی، بە واتایەکی تر ئاسایشی کۆمەڵگەیی بریتییە لە ئاسایشی هەموو کۆمەڵگا، نەك تەنیا ئاسایشی ئەو گروپانەی کە لەناو کۆمەڵگادا هەن، کۆمەڵگەکان بەو دەستەیە لە گروپە کۆمەڵایەتیانە دەگوترێت کە دەتوانن شان بە شانی دەوڵەت وەکو یەکەی سیاسی گرنگ لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا ڕۆڵ ببینن. خاڵێکی گرنگ ئەوەیە کە مەبەستی بۆزان لە ئاسایشی کۆمەڵگەیی ئەوەیە کە ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانەی کە وەکو نیمچە دەوڵەتێکن و گرنگی نێودەوڵەتیان هەیە، یان ئەو یەکانەن کە بە دەوڵەت دەچن، وەکو: کوردەکان. بەڵام وەیڤەر بە گشتی گرنگی بە ئاسایشی کۆمەڵگەیی گروپەکانی ناوخۆیی دەوڵەت دەدات، کە لەوانەیە گرنگی و کاریگەری نێودەوڵەتیشیان نەبێت، بەڵام لەناو یەکەکی سیاسی دیاریکراودا گرنگ و پڕ بایەخ بن (Neocleous, 2006: P 363).

ئاسایشی کۆمەڵگەیی لە قوتابخانەی کۆپنهاگن کە بۆزان یەکێك لە ئەندامانی سەرەکی بوو، چەمکێکی ناوەندی هەیە کە ئەویش بریتییە لە ناسنامە (بۆزان و همکاران، ٢٠٠٧: ص١٤٢). هەر کاتێك گروپێك هەست بەوە بکات کە باوەڕ و ڕەوتە کلتووری ـ کۆمەڵایەتیەکانیان ئینکار، کۆنترۆڵ یان دەستکاری دەکرێت، ئەوە هەستی نائاسایشی دەکەن (Kymlicka, 2002: P 30-32). لەوانەیە ئەم هەستە نائاسایشییە ڕاستەقینە بێت وەکو بەزۆر کۆچ پێکردنی یان ڕاگواستنی گروپێك لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر، لەوانەیە ئەم هەست کردن بە نائاسایشییە تەنیا زەینی بێت، واتە لە دەرئەنجامی هەڵسوکەوتی گروپێك لە دژی گروپێکی تر بێت کە دەبێتە هۆی نائاسایشی ڕاستەقینە، ئەم کێشەیەی باری بۆزان ناو دەنێت بە کێشەی ئاسایشی کۆمەڵگەیی کە بە پێی ئەوە کردەوەکانی کۆمەڵگە لە هەوڵدان بۆ بەهێزترکردنی ئاسایشی کۆمەڵگەیی خۆی ببێتە هۆی کاردانەوەی لە کۆمەڵگەی دووەم و لە ئاکامدا ئاسایشی کۆمەڵگەیی یەکەم لاواز

بێت (Posen, 1993: P 55). کێشەیی بوونی ئەم بابەتە لە تەفسیرکردنی ئەم کردەوەیە خۆی شاردۆتەوە، هەوڵی کۆمەڵگە بۆ بەرجەستەکردنی ناسنامەی خۆی بەکارێکی ئامانجدار و بە پلان و بیر لێکراوە بۆ بەرجەستەکردنی خۆی و هەڵاواردنی ئەویتر دادەنرێت. هەروەکو چۆن دەوڵەتان لەکاتی گومان کردن لە بوونی هەڕەشە لەسەر سەروەرییان پەنا بۆ چەك دەبەن، کۆمەڵگەکانیش لەکاتی هەست کردن (نەك درك و دیتنی هەڕەشە) دژی ناسنامەکەیان (نەك سەروەرییان) دەست دەدەنە کاردانەوە، کە ئەمەش لەسەر بنەمای گومان و هەستە دەبێتە هۆی دروستبوونی ئالۆزی و کێشە.

بەگشتی خستنەڕووی بابەتی ئاسایشی کۆمەڵگەیی و پێگەی ئەم بابەتە لە سیستەمی نێودەوڵەتیدا دەگەڕێتەوە بۆ بۆزان و هاوکارەکانی، هەروەکو (کراهمان الکە) دەڵێت: ژمارەی قوربانیانی مرۆڤ لە دەرئەنجامی توندوتیژییە ناوخۆییەکان کە بەشێکی زۆری سەرچاوەی ناسنامەیی هەیە زۆر زیاترە لە ژمارەی قوربانیانی شەڕی جیهانی دووەم (کراهمان، ٢٠٠٨: ص١٥). بۆزان و هاوکارەکانی وەکو (وەیڤەر و ویلد) بڕوایان وایە هەروەکو هەڕەشە نەتەوەییەکان، هەڕەشەکانی کۆمەڵگەیی میکانزمی خۆی هەیە، تەنیا ڕێوشوێنی نەتەوەیی بۆ چارەسەری قەیرانەکانی کۆمەڵگەیی کاریگەر نین، لە ڕوانگەی ئەوانەوە هەر کۆمەڵگەیەك بەپێی پێکهاتەی ناسنامەکەی مەترسییەکانی ناوخۆ و هەڕەشەی دەرەکی تایبەت بەخۆی هەیە، بۆ نموونە:

١) ئەگەر ناسنامەی کۆمەڵگەیەك لەسەر جیابوونەوە یان گۆشەگیری و تەنیا بوون دروست بووبێت، تەنانەت زیادبوونی ژمارەیەکی بچووك لە بێگانەکانیش بە کێشەی ئاسایشی دەزانێت، هەروەکو فینلاندا.

٢) ئەو ناسنامانەی کە تەنیا بەهۆی پاڵپشتی بە زیاتربوونی ژمارەیەك بەڵام بە ڕێژەیەکی زۆر کەم، وەکو (سونەکانی لوبنان).

٣) یان لە ڕێگەی سەرکوتکردنی زۆرینە وەکو (سیربەکان لە کۆسۆڤۆ) کۆنترۆڵی دەوڵەتیان لە دەستدایە، لە بەرامبەر شەپۆڵی دانیشتوانی لایەنی بەرامبەر یان بەرزبوونەوەی لەدایکبوونی ئەوان زۆر لاوازن و هەست بە هەڕەشە و مەترسی دەکەن، وەکو ئیسرائیلیەکان لە بەرامبەر زیادبوونی ژمارەی فەلەستینییەکان لە کەرتی غەزە.

٤) ئەگەر ناسنامەی نەتەوەیی گرێدرابێت بە هەندێك داب و نەریتی کلتووری تایبەتەوە، ئەوە هەر کلتوورێکی جیهانی هاوتاکەر بۆ ئەو ناسنامەیە هەڕەشە و مەترسییە.

٥) ئەگەر تەوەری سەرەکی ناسنامەی نەتەوەیی کۆمەڵگەیەك زمان بێت، ئەو کاتە باڵادەستی زمانێك بۆ نموونە زمانی ئینگلیزی لەتەك نفوزی ڕوو لە زیادبوونی کۆمەڵگەکان لەسەر یەکتر دەبێتە هۆی کێشە، وەکو کیوبیك لە کەنەدا.

٦) ئەگەر نەتەوەیەك لە تێکەڵکردنی ژمارەیەك نەتەوە و گروپی ئەتنی و ئایینی پێکهاتبێت، بەشێوەیەك کە ژیانی نەتەوەیی هەریەك لەو گروپانە مێژوویەکی جیاوازی هەبێت، ئەوە بڵاوبوونەوەی ناسیۆنالیزم و بیرۆکەی خۆبەڕێوەبردن و یان سەربەخۆیی دەتوانێت کوشندە بێت، هەروەکو: یوگسلافیای پێشوو، عیراق، یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو.

٧) ئەگەر نەتەوەیەك پێکهاتەیەك بێت لە گروپە جیاوازەکان، کە لە ڕێگەی ناسنامەیەك گروپێکی نوێیان پێکهێنابێت، ئەوە ناسنامەی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتە لە بەرامبەر بەرجەستەبوونی جیاوازییەکان و وێکنەچوونی نەژادی و کلتووری دەکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسی وەکو: ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. (بۆزان و همکاران، ٢٠٠٧: ص١٩١).

بە لێووردبوونەوە لەو خاڵە سەرەکیانە لۆژیکی هەڕەشە و مەترسییەکانی ئاسایشی کۆمەڵگەیی شیاوی درك پێکردنە، لە هەموو ئەو خاڵانەدا نەتەوەکان و گروپەکان هەوڵی پارێزگاری و مانەوە و بەرجەستەکردنی خۆیان دەدەن، ئەم

نەتەوە و گروپانە وا هەست دەكەن و هەندێك كات بە ڕوونی دەبینن كە بوون و ناسنامەكەیان لە بەرامبەر گۆڕانكارییە ئاساییەكان و كردەوەكانی گروپەكانی تر هەڕەشەی لێدەكرێت.

لە ڕوانگەی باری بۆزان ئەم سێ كردەوەیە ئەو حەوت خاڵە مەترسییەی پێشتر دەخاتە بەرنامەی كاری ئاسایش:

**یەكەم/ كۆچ:**

ڕاگواستن و كۆچ پێكردنی زۆرەملێ، هەروەكو كۆچ پێكردنی بەشێك لە دانیشتوانی دەوڵەتێك بۆ دەوڵەتێكی تر و تێكدانی هاوسەنگی دانیشتوان لە دەوڵەتی پێشوازیكەر و یان كۆچی خۆویستی ژمارەیەك بۆ دەوڵەتانی پێشكەوتوو و سەقامگیر، هەروەك دەتوانن لە دەوڵەتی یەكەم و دووەم ببنە هۆی تێكدانی هاوسەنگی دانیشتوان وەكو كۆچی زۆرملێی عەرەب و كوردەكان لەلایەن سەددام حوسێنەوە، یان چوونی ئینگلیزی زمانەكان بۆ كەنەدا، (Yiliz, 2004 :P4).

**دووەم/ ململانێی ئاسۆیی:**

لە كێبڕكێی ئاسۆییدا، هاووڵاتیانی (A) لەناوچەی خۆیان ژیان دەبەنە سەر، بەڵام بەهۆی نفوزی كلتووری و زمانی كلتووری (B) كە جیرانی ئەوانە، شێوازی خۆیان دەگۆڕن، وەكو (ترسی كیۆبێكیەكان لە ئینگلیزی زمانەكان لە كەنەدا، یان مەترسیان لە بە ئەمریكایی بوونی كەنەدا).

**سێیەم/ ململانێی ستوونی:**

ململانێی ستوونی كاتێك بەدیار دەكەوێت كە دەوڵەتێك یان كۆمەڵێك لە دەوڵەتان بڕیار دەدەن كە دانیشتوانیان یەك بخەن و سنوورەكانی پێشتریان نەمینێت، لەم كاتەدا (هەروەكو یوگسلافیا)، دانیشتوانی كۆمەڵەی نوێ تووشی قەیرانی پێكبەستراوبوون دەبن و لە نێوان ناسنامەی پێشتر و ناسنامەی ئێستایان دوودڵ

دەبن، هەروەها ئەگەر دانیشتوانی ناوچەیەك هەوڵی سەربەخۆیی یان ئۆتۆنۆمی بدەن (وەکو کوردەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) ئەو کاتە دانیشتوانی ئەم دەوڵەتە نوێیە دەبێت ناسنامەی پێشتریان فەرامۆش بکەن و بیر لە ناسنامەیەکی تر بکەنەوە، لەو بارودۆخەدا کۆمەڵێك ناسنامەی لێکپچڕاومان هەیە.

لە ڕوانگەی بۆزانەوە لە کاتی ڕوودانی هەریەك لەم (٣) بارەی پێشتر (بە تەنیا یان لەگەڵ یەکتر)، هەوڵدان بۆ ڕێزگرتن، بەرجەستەکردن و ناساندنی ناسنامە بریندارکراو یان پەراوێزخراوەکە دەست پێ دەکات. بەرگری کلتووری لە کلتوور و ناسنامە کە (وەیڤەر) جەختی لەسەر دەکاتەوە لەم بابەتانەدا گرنگی پەیدا دەکات، لە ڕوانگەی وەیڤەر بیرۆکەی بەرگری لە کلتوور لە ڕێگەی کلتوور، لە بزووتنەوەی زیندووکردنەوە و چاکسازی ئەخلاقیدا خۆی دەبینێتەوە، ئەم بزووتنەوەیە هەوڵ دەدات، ڕەهەندە جیاوازەکانی نەتەوە دووبارە یەکپارچە بکاتەوە (Roe, 2005: P5). ئامانج لەم ناسیۆنالیزمە کلتووریە زیندووکردنەوە و چاکسازی لە کۆمەڵگای سیاسییە، لە ناسیۆنالیزمی کلتووریدا لەسەر خاڵە هاوبەشەکانی جۆراوجۆری کلتووری وەکو: ئایین، ئایدیۆلۆژیا، زمان و مێژوو جەخت دەکرێنەوە و پەیوەندییەکانی تری ناوچەیی و ئایینی کە لەوانەیە یەکپارچەیی بخاتە مەترسییەوە، بچووك و لاوەکی هەژمار دەکرێت، جەختکردن لەسەر وێکچوونەکان و بەرهەمهێنانی ئەدەبیاتی جیاوازی و نەفرەت لێکردن لە ناسنامەکانی تر کاتێك دەگاتە لوتکە کە هەست بکرێت ناسنامەی کۆمەڵگەیەك کەوتۆتە مەترسیەکی گەورە. بە ڕای "وەیڤەر" ناسنامە و هەستی بریندار کراو و سوکایەتی پێکراو لە زۆربەی کاتەکاندا دەتوانێت ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ناسیۆنالیزم و لەکاتی قەیران و کێشەی قوڵدا، شێوازێکی کارامەیە بەهۆی ئەوەی کە پەیوەندی بە ڕابردووی پڕ شانازی هەیە، هەر زۆر زوو هەستی ئارامی و متمانە و دڵنیایی دەداتە مرۆڤەکان و ئەوان لە بەرامبەر ئەم شەپۆڵە سوکایەتیە دەپارێزێت و بەم شێوەیە گەشەی ناسیۆنالیزم بە ڕوانینی داهاتوویەکی

پڕشنگدارتر دەچێتە قوڵایی ڕۆحی نەتەوەیی. لە ڕوانگەی بۆزان و هاوڕێیەکانی پرسی ئاسایشی کۆمەڵگەیی دەربڕی ئەو ڕاستیەیە کە توندوتیژی بەگشتی ڕیشەی لە هەڵاویرکردن و دەستکاری کردنی ناسنامەی گرۆپێك لەلایەن گروپەکانی ترەوەیە. بۆزان لە کتێبی (خەڵك، دەوڵەتان و ترس)دا، هەڕەشەکانی سەربازی، سیاسی، کۆمەڵگەیی، ژینگەیی و ئابووری لە دژی دەوڵەت بە جێگیر و پێوانەکراو دادەنێت، لەسەر ئەم بنەمایە بەهۆی دیتنی هەر هەڕەشە و دەست درێژییەك بۆ سەر یەکپارچەیی دەوڵەتێك لەلایەن دەوڵەتێکی ترەوە، سەقامگیری دەوڵەت تێکدەچێت و هەروەها هەستی بێ ناسنامەیی گروپە گرنگەکانی کۆمەڵگا دروست دەبێت و هەروەها (ئاووهەوا و ژینگە و پیسبوونی ژینگە و ... هتد) دەکەوێتە مەترسییەوە و بێکاری، هەڵاوسان و دابەزینی بەرهەمهێنان دروست دەبێت، لێرەوەیە کە دەوڵەت وەکو ئەکتەرێکی خاوەن عەقڵ دێتە ناو هاوکێشەکەوە و بە ئاسایشی کردنی بابەتە نائاسایشییەکان دەست دەداتە کۆکردنەوەی سەرچاوەی دارایی و مرۆیی (Wendt, 2004: P289).

لە پێناسەی بۆزان بۆ ئاسایشی کۆمەڵگەیی: ((توانای کۆمەڵگا بۆ درێژەپێدان بە سروشتی خۆی لە هەلومەرجی گۆڕاودا))، هەم گۆمەڵگە و هەم ناسنامە وەکو ڕاستیەکی هەبوو لە جیهانی دەرەوەدا هەژمارکراون، لەم ڕوانگەیەوە کۆمەڵگە بە مانای گروپەکانی کۆمەڵایەتی گرنگ کە کاریگەری لەسەر هاوکێشە نەتەوەیی و نێودەوڵەتیەکان دادەنێن، بگۆڕی سەربەخۆن و ڕاستییەکی کۆمەڵایەتین، واتە کۆمەڵگە لێرەوە تاوەکو ئاستی دەوڵەت بەرزدەکرێتەوە و دەتوانێت سەربەخۆ لە دەوڵەت بوونی هەبێت. قوتابخانەی کۆپنهاگن بڕوایان وایە کە مانەوە یان بەردەوامی کۆمەڵگە لە ڕاستیدا گرێدراوە بە ناسنامەکەی، ئەوان وا بەڵگە دەهێننەوە کە لە کاتی دروستبوونی هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ناسنامەی کۆمەڵگا ئیتر کۆمەڵگە بوونی خۆی لە دەست دەدات و لەمەو بەدواوە ناتوانین بڵێین کۆمەڵگە. هەروەها لە هەندێ شوێندا جەخت

لەسەر هەڕەشەکانی ئابووری لەسەر هەندێك گروپی تایبەت لەناو کۆمەڵگا دەکەنەوە، کە ئەمە دەتوانێت کاریگەری لەسەر کۆی ئاسایشی کۆمەڵگادا هەبێت، بەم مانایە کە ئەو گروپە بێبەشە یان پەراوێزخراوە لە ڕووی ئابوورییەوە لە ڕێگەی قاچاغ و تیرۆر و جەنگی ناوخۆ دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر هەموو کۆمەڵگا.

## ٣.٢. سەرچاوەی ئاسایش:

سەرەکیترین پرسیار لە لێکۆڵینەوەکانی ئاسایشدا سەرچاوەی ئاسایشە، بەم مانایە کە دەبێت دیاری بکرێت ئاسایشی چ کەسێك یان ئاسایشی چ شتێك دەبێت دەستەبەر بکرێت و بپارێزێت، ئاسایشی دەوڵەت، ئاسایشی ڕژێم، ئاسایشی نەتەوە و یان ئاسایشی تاك تاکی هاووڵاتیان؟ ئەمانە وەڵامی چوار ڕەهەندییان هەیە کە دەبێت بەگوێرەی پرسیاری ئاسایش وەڵام بدرێتەوە. باری بۆزان لە کتێبی (خەڵك، دەوڵەتان و ترس)ـدا دەوڵەت بە سەرچاوەی ئاسایش دادەنێت (بۆزان، ٢٠٠٨: ص٧٨).

بۆزان لە کتێبی دواتری خۆی (چوارچێوەیەکی نوێ بۆ شیکردنەوەی ئاسایش) کۆمەڵگە دەکاتە سەرچاوەی ئاسایش و ئاسایشی کۆمەڵگەیی بەهاوتای ئاسایشی نەتەوەیی دادەنێت (بۆزان و هەمکاران، ٢٠٠٧: ص١٨٣). بۆزان لە لێکۆڵینەوەیەکی تردا لەژێر ناونیشانی (ئاسایش و ئابووری لە جیهانی سێیەم) لە ساڵی (١٩٩٨)ـدا ئاسایشی ڕژێمەکان بە گرنگتر لە ئاسایشی دەوڵەت دەزانێت (بۆزان، ٢٠٠٠: ص٢٩)، بۆزان بە جەخت کردن لەسەر دەوڵەتانی دواکەوتوو کە ئامانج لە سیاسەتەکانی حکومەت تەنیا دەستەبەرکردنی ئاسایشی هاووڵاتیان نییە، بەڵکو گەرەنتی کردنی دەسەڵاتی نوخبەکانە لەسەر بنەمای هێز، بەڵام "وەیڤەر" لە بەرامبەر ئاسایشی دەوڵەت و ڕژێمدا، سەرچاوەبوونی گروپە جیاوازەکان لە کۆمەڵگادا و پێویستی بەهێزکردنیان بۆ پارێزگاری کردن لە

ناسنامەكەیان و هەروەها یەكگرتوویی و زمان و كلتووریان دەكاتە بابەت و سەرچاوەی ئاسایش و بەرگری لەم بیرۆكەیە دەكات (William, 1998: P204).

لە كۆتاییدا دەستەیەك لە لێكۆڵەرەوان ئاسایشی تاك تاكی هاووڵاتیان كە بڕیار وایە گروپێك پێكبێنن و دەوڵەت دروست بكەن، بە سەرەكیترین بابەتی ئاسایش هەژمار دەكەن، لەو زانایانە دەتوانین ئاماژە بە (كین بۆس) بكەین كە لە لێكۆڵینەوەیەكدا بەناوی (ئاسایش و رزگاری) جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئاسایش بریتییە لە ڕزگاركردنی هاووڵاتیان و جەماوەر (تاكەكان و گروپەكان) لە سنووردارییەتیەكانی فیزیكی (وەكو برسیەتی) و مرۆڤی (وەكو دەستبەسەركردنی سیاسی یان زیندانی سیاسی) كە دەبنە بەربەست بۆ هەڵبژاردنی ئازادانەی مرۆڤەكان لە ژیانیان بۆ بابەتە جۆراوجۆرەكان (Booth, 1991: p314).

لە ڕوانگەی بۆس كەسی نەخۆش، برسی، هەژار، دەستبەسەركراو و بێكار ناتوانێت هەڵبژاردنێكی ئازاد بكات، بۆیە ڕزگاركردنی تاكەكان بابەتی سەرەكی ئاسایشە. هەروەكو پێشتر ئاماژەی پێكرا، بۆزان لە بەرهەمە سەرەتاییەكانی خۆیدا بەرگری لە سەرچاوەبوونی دەوڵەت لە لێكۆڵینەوەكانی ئاسایشدا دەكرد، هەروەها ئاسایشی ئابووری، سەربازی، كلتووری، كۆمەڵگەیی و ژینگەیی وەكو بوار یان ڕەهەندە سەرەكییەكانی دەستەبەركردنی ئاسایشی نەتەوەیی هەژمار دەكرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٩٣) واتە دەیەیەك پاش بڵاوبوونەوەی كتێبی (خەڵك، دەوڵەتان و ترس) باس لە ئاسایشی گروپە كۆمەڵایەتیەكان لە پاراستنی نەریت و كلتووری خۆیان وەكو سەرچاوەیەكی تری ئاسایش لە تەنیشت ئاسایشی دەوڵەت دەكات، بەپێی شیكردنەوەكانی بۆزان و وەیڤەر بە ڕوونی بەدەردەكەوێت كە لە سەرەتای (١٩٩٠)ـەكان و لەمیانەی جەنگەكانی ئەتنی و توندوتیژیەكان لە باڵكان و هاوكات لەگەڵ شەپۆلی كۆچی بەرفراوان بۆ ئەورووپا بەتایبەت بۆ دەوڵەتانی ئەسكەندیناڤیا، پرسی ناسنامە لە ڕەوتی كۆمەڵایەتی و سیاسی دەردەچێت و دەكەوێتە خانەی بابەتەكانی ئاسایش.

## ٤.٢. شیکردنەوەی ئاسایشی هەرێمی:

باری بۆزان لە کتێبی (ناوچەکان و هێزەکان: ستراکچەری ئاسایشی نێودەوڵەتی) لەساڵی (٢٠٠٤)ـدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤیەت هێزی نوستووی بلۆکی کۆمۆنیزم گواسترایەوە شەش هێشووی ئاسیا، ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەوروپا، ئەفریقیا، ئەمریکای باکوور و ئەمریکای باشوور، بەم شێوەیە شەش هێشووی ئاسایش دروست بوو، کە بابەت و پرس و گیروگرفتەکانیان لەگەڵ یەکتری (لەناو هێشووەکە ـ ناوچەکە) وێکچوونی تێدایە (بۆزان، ٢٠٠٨: ص٢٣). بۆزان بەرگری لە ئاستی شیکردنەوەی ناوچەیی دەکات و تیۆری "گروپی ناوچەیی ئاسایش" بونیات دەنێت و لەم ساڵانەی دواییدا بەردەوام بەرگری لە توانای شیکردنەوەی ئەم تیۆریە کردووە، بۆ نمونە:

١) کەموکوڕی ئاستی شیکردنەوەی نەتەوەیی و جیهانی: بەبڕوای بۆزان ئاستی شیکردنەوەی نەتەوەیی کە ڕیالیستەکان بەرگری لێ دەکەن و ئەو بیرە بڵاودەکەنەوە، ناتوانێت هەموو بوار و بابەتەکانی ناوچەیی لەخۆ بگرێت بەڵکو هەموویان دەخاتە ژێر ویستی نەتەوەیی و ویستی دەوڵەت، کە ئەمەش ڕاست نییە. هەروەها لە ئاستی جیهاندا کۆنتێکستی ناوچەیی و خوارنەتەوەیی و نەتەوەیی، هەموویان دەکەونە ژێر هەژموونی سیستەمی نێودەوڵەتی و بەپێی فۆرمۆڵی دابەشکردنی هێز لە ئاستی جیهانی شیکردنەوەیان بۆ دەکرێت کە ئەمەش ڕاست نییە، ڕەخنەی بۆزان لەسەر ئاستی شیکردنەوەی نەتەوەیی ئەوەیە کە یەکەم: دەوڵەت تەوەرە و دووەم: ئۆبجێکتیڤە، واتە لە ڕوانگەی بۆزانەوە دەوڵەت تاکە ئەکتەر نییە و ئاسایشی نەتەوەیی لە کۆمەڵێك ڕەگەزی تر وەکو: بەرهەمهێنانی سامان (ڕەهەندی ئابووری ئاسایش)، دامەزراوەکانی زاڵ لە بواری هێز (ڕەهەندی سیاسی ئاسایش)، پارێزراوبوونی ناسنامەی گروپەکان لەهەمبەر

سياسەتی سڕينەوە و هەڵاواردن و دەستكاری و دەستێوەردان (ڕەهەندی كۆمەڵگەيی ئاسايش)، پاراستنی سروشت و ژينگە (ڕەهەندی ژينگەيی ئاسايش) و هەروەها بواری بەرگری سەربازی و هێرشی دەوڵەت بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕكابەرەكانی و بەرگری كردن لە هاوبەش و هاوپەيمانەكانی (ڕەهەندی سەربازی) پێكدێت و لە ئامادەنەبوونی ئەم ڕەگەز و فاكتەرانە، قسەكردن لە "ئاسايشی نەتەوەيی" هيچ مانايەك نادات، بەم پێيە و سەرەڕای بانگەشەی رياليستەكان، دەوڵەت پێش ئەوەی كە فەرمانپێدەر بێت پارێزەر و بەرزكەرەوەی ئاستی ئەم فاكتەرانەيە (پێنج فاكتەرەكە). بۆزان لەدوای ڕەتكردنەوەی بانگەشەی ميتۆدی زانايانی تر، بەشێكی گەورەی سەرنەكەوتوويی لە پێشبينی كردن و دەست نيشانكردنی قەيران و توندوتيژيەكان دەگەڕێنێتەوە بۆ تێگەيشتنی ناڕاستی ئاسايشی دەوڵەت تەوەر و جيهانی.

٢) گرنگی پێدان بە لايەنە ئۆبجێكتيڤ و ناماددييەكان: لە ڕوانگەی بۆزانەوە كەموكورتی سەرەكی ئاستی شيكردنەوەی دەوڵەت تەوەری (رياليستی) ئەوەيە كە ئەوان تەنيا بايەخ بە ڕەهەندی ئۆبجێكتيڤ و واقعی هێز و ئاسايش دەدەن، بە پێچەوانەی شيكردنەوەی جيهانی لە ئاسايشدا كە پڕيەتی لە خەياڵ و گۆڕانكاری. بۆزان ئاستی شيكردنەوەی ناوچەيی بەهۆی گرنگی پێدان بە كۆمەڵێك بابەت، وەكو: چالاكی، تێگەيشتنی بگۆڕ، گۆڕانكاری بابەتەكان، سروشتی مێژوويی، پێگەی جوگرافيايی بەشێوەيەكی گشتی، تايبەتمەندی ديالێكتيكی پرسەكان و بابەتەكان، لەسەرووتر لە ئاستەكانی تری شيكردنەوە دادەنێت (نصری، ٢٠٠٤: ص٣٤٣).

٣) هێزە جيهانييەكان (زلهێزەكان)، هێزی گەورە، هێزی ناوچەيی و هێزی لاواز: بۆزان بە پێچەوانەی ڕەوتی زاڵ لە سەردەمی جەنگی سارددا، بڕوای وايە كە جيهان لە سەدەی (٢١)ـدا، تاك جەمسەر يان دوو جەمسەر يان فرە جەمسەر نييە، بەڵكو ئێمە ڕووبەڕووی ئەكتەری جۆراوجۆر و فرەيين كە هەندێك لەم ئەكتەرانە زلهێزن (وەكو ويلايەتە يەككگرتووەكانی ئەمريكا)، هەندێكی تر هێزی

گەورەن (وەکو: چین و ڕووسیا)، هەندێکی تر هێزی ناوچەیین (وەکو: هیندستان و ئێران) و زۆربەی دەوڵەتانیش هێزی لاوازن (وەکو: نیپاڵ و لائۆس و ... هتد)، بەپێی ڕوانگە و بیری بۆزان هەر کام لە هێشووەکان یان گروپە ناوچەییەکان خۆیان یەك یان دوو جەمسەرن، بۆ نمونە: لە باشووری ئەفریقیا سیستەمێکی تاك جەمسەری هەیە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا دوو جەمسەری باڵا هەیە، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا سیستەمی چەند جەمسەری یان فرە جەمسەری هەیە، هەروەها لەوانەیە کە هەندێك لە هێزە گەورەکان یان هێزە لاوازەکانی ناوچەیی لەگەڵ هێزە باڵاکان یان زلهێزەکان هاوپەیمانییەتی گرێ بدەن، لە شیکردنەوەی بۆزان دا، هەموو ڕەوتەکانی هاوپەیمانی ڕیشەی ناوچەییان هەیە، واتە هێزەکانی ناوچەیی لە ترسی دراوسێیەکانیان ڕوو لە هاوپەیمانییەتی لەگەڵ هێزە گەورەکانی سەروو ناوچەکە دەکەن.

٤) ناوەندیەتی ناسنامە (مێژوو) و دراوسێیەتی (جوگرافیا) لە هێشووە ناوچەییەکان: لە ڕوانگەی بۆزانەوە دوو فاکتەری بنەڕەتی کە دەبنە هۆی پێکهاتنی هێشووەکانی ناوچەیی بریتین لە ناسنامەی مێژوویی یان کۆن و دراوسێیەتی جوگرافیایی. لە ڕوانگەی بۆزان ڕەگەزی مێژوویی و ناسنامەی دێرین دەبێتە هۆی ئەوەی کە نەتەوە ببێتە خاوەن هزرێکی تایبەت بەخۆی و ئەم وشیاری و ئاگاییەش (ئاگایی مێژوویی) و شانازی بە ڕابردوو گەرەنتیەکی ئاسایشی گرنگە کە دەبێتە ڕێگر و بەربەست لەبەردەم ڕەتکردنەوەی ناسنامەی دەوڵەت یان چوونە پاڵ ئەکتەرێکی تری فراوانخواز، بنەمای هاوسنووری و دراوسێیەتی جوگرافیایی لە شیکردنەوەی بۆزان دا، جێگەیەکی تایبەتی هەیە، لە ڕوانگەی بۆزانەوە هاوسنووری جوگرافیایی دەبێتە هۆی وێکچوونی ئاسایش و ڕادە و ئاستی وێکچوون لێکۆڵینەوەکانی ئاسایش لە نێوان دوو دەوڵەتدا (بەراورد بە دوو دەوڵەتی دوور لە یەکتر) جێگەی سەرنجە.

٥) خاڵە پۆزەتیڤەکانی ئاستی شیکردنەوەی ناوچەیی: **یەکەم:** لە شیکردنەوەی ریالیست و جیهانگەراییدا، ریالیستەکان دەوڵەت تەوەرن و هەر ئەکتەرێك یەکەیەکی جیا و سەربەخۆیە، کە هیچ پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی تردانییە تەنیا بە کۆکردنەوەی هێزی ناوخۆ و سەرکوتکردنی دژبەرەکانی دەتوانێت حەز و ویستەکانی خۆی لەسەر ستراکچەرەکانی سەروو نەتەوەیی بسەپێنێت، بە پێچەوانەی ئەمەش لە قوتابخانەی جیهانگەراییدا تەنیا بنەمای ڕێکخەری سیاسەتەکان بۆ ستراکچەری زاڵی هەژمونە، ئەکتەرەکان توانای دژایەتی یان بەرگرییان نییە، ئیتر لێرەدا ڕەگەز و فاکتەرەکانی ویستی ئەکتەری نەتەوەیی و پسپۆڕی ناوخۆ و بزووتنەوە جیاوازەکان کاریگەر نین، بەڵام بۆزان ئەوە بەباشی دەردەخات کە ئاستی شیکردنەوەی ڕیالیست زۆر سنووردارە و لاوازە و ئاستی شیکردنەوەی جیهانگەراکان زۆر خەیاڵی و ئایدیالیستییە، بۆیەش بۆزان سوود لە سەنتێزی ئاستی شیکردنەوەی ناوچەیی وەردەگرێت. **دووەم:** خاڵێکی تری گرنگی شیکردنەوەی بۆزان جەختکردنەوەی ئەو لەسەر جیاوازیەکانی ناوچەییە، واتە ناوچەکان ئەولەویەتی ئاسایشی جیاوازیان هەیە، چونکە بۆزان جەخت دەکاتەوە ڕەوتی دامەزراندنی دەوڵەت لە ئەوروپا جیاوازترە لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ئەمڕۆکە، لە زۆر ڕووەوە ستراکچەر و ڕەفتاری هاوشێوەی ئەوروپای سەدەی (١٩)ـی هەیە، بەڵام (٢) جیاوازی گرنگ هەیە:

١- ئەوروپای ئەو سەردەمە لە بەدواداچوونی ئاسایش خۆی لەبەردەم دەستێوەردانی دەرەکی نەبوو.

٢- بە پێچەوانەی هێزە ئەوروپیەکان کە لە سەدەی (١٩)ـدا دەیانتوانی هاوسەنگی هێز بپارێزن و ئەمەش سیاسەتی هاوسەنگی هێزی ناوخۆیی دەپاراست، ئەمڕۆکە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەریەکە لە ڕوانگە و ڕەوتێك جیاوازیان هەیە، کە هەندێکجار دژ بەیەکە، نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەندێك دژە

ڕۆژئاوان و هەندێکیتر دژی ئیسرائیلن یان لایەنگری لە ئیسلام و ناسیۆنالیزم و ... هتد، دەکەن کە ئەمانەش ڕەوتەکانیتر پوچەڵ دەکاتەوە.

بۆ نمونە بۆزان ئاماژە بە (سەددام حوسێن) دەکات کە لە ساڵی (١٩٩١)ـدا توانی بە بەکارهێنانی هەستی دژە ڕۆژئاوایی و دژە ئیسرائیل خۆی وەکو قارەمانی ئیسلامی و نەتەوەی عەرەبی نیشان بدات، بەڵام ئەمە بەهۆی مێژووی درێژی سەددام لە دژایەتی ئاین و هێرش بۆ سەر دەوڵەتانی ئیسلامی و عەرەبی دژ بە یەك بوو، بۆزان ئەم ئاڵۆزیە کە لە هەڵبژاردنە سیاسییەکاندا خۆی حەشارداوە بە کێشەی ئاسایش (Security Dilemma) ناودەنێت (Metzen, 2008: P3). بەپێی ئەم کێشە ئاسایشییەی بۆزان، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست تووشی مەتەڵی ئاسایشی بووە، لەکاتێکدا یارمەتی سەقامگیری عیراق دەدات ئەوا لە ڕاستیدا یارمەتی ئێران دەدات کە بەهێزتر بێت، ئەمەش ئیسرائیل لاواز دەکات کە هاوپەیمانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە.

## ٣- ديموكراسی:

ديموكراسی وەك شێوازێكی ژيانی كۆمەڵايەتی و سياسی لە جيهانی نوێ لەسەر چەند بنەمايەك دادەمەزرێت كە لە پرۆسەيەكی مێژوويی دا، لە هەوڵی دامەزراندنی سيستەمێكی ديموكراتيك هاتۆتە ئاراوە. دەتوانين كرۆكی ئەم بنەمايانە لە بنەماكانی هاوڵاتيبوون و بەشداری سياسی، ياسا سەروەری، سەروەری هاووڵاتيان، ئازادی و مافە مەدەنی و سياسييەكان، يەكسانی دامەزراوە. سيستەمێكی ديموكراسی لە رێگەی هەڵبژاردنێكی ئازاد و دادپەروەرانە و دەستاو دەستكردنی ئاشتيانەی دەسەڵات و جياكردنەوەی دەسەڵاتەكان دەتوانێت رەوايەتی هەبێت و لە ئاستی ئەو ئەرك و بەرپرسياريەتيانە بێت كە ئەركی سيستەمن بۆيە لەم جۆرە سيستەمەدا هاووڵاتيان نەك بەهۆی ترس بەڵكو بە حەز و ويست و ويستی خۆيان پابەندی ياساكان دەبن چونكە لە رێگەی بەشداری سياسی هاووڵاتيان لە دروستكردنی بڕيارەكانی سيستەم رەنگدانەوەی ويستی هاووڵاتيانە و لێرەوەيە كە كەرامەت و مافەكانی مرۆڤ دەپارێزرێت و كۆمەڵگا لە ئاشتی و سەقامگيری و ئاسايش دا دەژيت (بشيريه، ٢٠٠٥: ص٧).

لێرەوە هەوڵدەدەين لەم بەشەدا كە چەمك و پێناسەی ديموكراسی روون بكەينەوە و بيروبۆچوونی زانايان بخەينەڕوو و باس لەو بنەمايانە دەكەين كە سيستەمی ديموكراسی لە سەری دادەمەزرێت و هەروەها باس لە گرنگترين كارەكتەرەكانی ديموكراسی دەكەين كە رۆڵيان هەيە لە بەرەوپێش چوون و چەسپاندنی ديموكراسی.

## ٣-١- چەمك و پێناسەی دیموكراسی:

### ٣-١-١- چەمكی دیموكراسی:

دیموكراسی وشەیەكی یۆنانییە كە لە دوو وشە پێكهاتووە: (دیمۆس) بەواتای هاووڵاتیان، گەل و (كراتیا) بەواتای دەسەڵات دێت. چەمكی دیموكراسی لەرووی یاساییەوە بریتییە لە شێوازەكانی سیستەمی سیاسی كە بەندە لەسەر كۆدەنگی و دەستاودەستكردنی دەسەڵات و دەسەڵاتی زۆرینە و پاراستنی مافەكانی تاك و كەمینە. چەمكی سیستەمی سیاسی و دیموكراسی لەرووی سیاسییەوە، بەو چەشنە سیستەمە سیاسیانە دەگوترێت كە هاووڵاتیان بەرێوەی دەبەن لەم روانگەیەوە سیستەمی دیموكراسی دەكەوێتە بەرامبەر سیستەمی دیكتاتۆری و تۆتالیتار و یان دەسەڵاتێكی رەهای تاكەكەسی (**مصطفى** گەزنەیی و عبداللە احمد، ٢٠١٢: ص ٨٤). چەمكی دیموكراسی بریتییە لە سیستەمێكی بەهایی كە پەیوەندیدارە بە چەمكی ئازادی و بۆتە بەهایەكی بنەڕەتی و ناوەندی بۆ مرۆڤ و تاك و كۆمەڵگە و پەیڕەوكردن و بەرگری كردن لێی دەبێتە هۆی سەرچاوەی ڕەوایەتی ڕاستەقینە بۆ سیستەمی مەدەنی و لەسەر ئەو بنەمایە سیستەمی سیاسی كاردەكات و بریتییە لەوەی كە سیستەمی سیاسی هەڵقوڵاوی بەهای ئازادییە، كە دەسەڵاتی سیاسی دەبێت پابەندی ئەم بەهایە بێت (كامل محمد، ٢٠٠٨: ص ٢٩).

هەروەها چەمكی دیموكراسی بەمانای یەكسانییە لە نێو سەرجەم تاكەكانی كۆمەڵگەدا، تاكەكان لە نێو كۆمەڵگەیەك و لەناو نیشتیماندا یەكسانن لە بەرامبەر ئەرك و ماف و خاوەنی یەك دەستورن كە كاروباری ژیانیان ڕێكدەخات و خاوەنی یەك یاسان، هەروەها یەكسانی گەرەنتی ئاشتی كۆمەڵایەتیە بەتایبەت لەو كۆمەڵگایانەی كە فرەیین. ئازادی تاك بنەمای فەلسەفەی سیستەمێكی

ديموكراسييە هەروەها تاكەكان يەكسانن لە كۆمەڵگايەكی ديموكراسيدا ئەمەش يەكسانی لەبەرامبەر ياسادا بەرهەم دێنێت، هاوڵاتی بوون بوونی نابێت بەبێ دانان بەناسنامەی تاك، هەروەها هاوڵاتی بوون لەسەر ئاستی هۆشياری تاكەكان كە بريتييە لە تاك گەرايی بونياد دەكرێ، كە ماف و ئەركی دەكەوێتە سەر كە ئەمەش دوو مەرجی ديموكراسين (حرب، ٢٠٠١: ص ١٢-١٣). مانای جەوهەری ديموكراسی ئەوەيە كە هەموو هاووڵاتيان يەكسانن لە بواری سياسی و ياسايی لەلايەكی ترەوە ديموكراسی لەسەر بنەمای ڕێژەيی بوون ڕادەوەستێت بەم مانايەی كە ديموكراسی لەسەر بنەمای ڕێژەيی بوونی بەهاكان دادەمەزرێت و هيچ چەشنە پێوەرێكی رەها بۆ دياريكردنی بەهاكان بوونی نييە، واتە ناكرێت بەهايەك بەشێوەی ڕەها بسەپێنرێت بەسەر هاووڵاتيان (بشيريە، ٢٠٠٩ : ص ١١٤).

ديموكراسی ڕێگەيەكە كە سيستەم بەهێزێكی ڕەوا دەسەڵات بەڕێوە دەبات و يان دەسەڵات دەگرێتە دەست. چونكە سيستەمی ديموكراسی سيستەمێكی ويستراو و خوازراوە، بەهۆی ئەم ڕەوايەتيە جەماوەريە كە هەيەتی. هەروەها بەهۆی پرەنسيپی يەكسانی و بڵاوكردنەوەی لەنێوان تاكەكان بۆ بەشداری لە درووستكردنی بڕيار و هەروەها پاراستنی ئازادی و مافەكانی مرۆڤ ( **فؤاد عبدالله، ٢٠٠٤ : ص ٣٤**). بەگشتی چەمكی ديموكراسی لەچەند بنەمايەكی سەرەكی پوخت دەكرێتەوە: سەرچاوەگرتنی هێز و ياسا لە ويستی هاووڵاتيان، ئازادی ڕادەربڕين و پاڵپشتی سيستەم لەسەر ئەو ڕايە، هەبوونی ميكانيزمی دياريكراو بۆ دەربڕينی ڕای گشتی وەكو پارتە سياسييەكان، بنەمای سيستەمی زۆرينە بەرەچاوكردنی سازانی سياسی، سنووردار كردنی دەسەڵاتی سيستەم لە ڕێگەی ماف و ئازادييەكانی تاك و گروپەكان و فرەيی گرووپەكان و بەرژەوەنديەكان و بەهاكانی كۆمەڵايەتی، بەهێزبوونی كۆمەڵگەی مەدەنی، بنەمای ڕێژەيی بوونی بەهاكان، ئاسانگيری لە هەمبەر بيروڕای جياواز و دژ، يەكسانی سياسی گرووپە كۆمەڵايەتيەكان لە بواری دەستپێڕاگەيشتن بە دەسەڵات،

بواری بوون بە زۆرینەی کەمینە فکریەکان لە ڕێگەی بانگەشەی بیر و ڕاکان، سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری، دابەشبوونی دەسەڵاتەکان و سەربەخۆبوونیان، بوونی ئۆپۆزسیۆنی یاسایی (بشیریە، ٢٠٠٩ : ص ٢٧).

**٣-١-٢- پێناسەی دیموکراسی:**

(جێرمی بێنتام) بڕوای وایە کە کرۆکی دیموکراسی بریتییە لەتوانای هێنانەدیی یەکسانی لە داواکاریەکان و ڕازیکردنی هاوولاتیان، ناوبراو بڕوای بە هێنانەدیی بارودۆخێکە کە تاك بتوانێت بەزۆرترین ئاست و ڕێژەی خۆشی بگات، ناوبراو خێر بە پێوەری خۆشی و شەر بە پێوەری ناخۆشی دەزانێت، (بێنتام) ئابوری و سیاسەت وەکو ئامرازی دەستەبەرکردنی خۆشی بۆ کۆمەڵگە و تاکەکان دەزانێت. (یحیی صلاح، ٢٠٠٨: ص ٥٧). (جۆن دیویی) بڕوای وایە کە پەرەپێدانی دیموکراسی پێویستی بە پەروەردەی دیموکراسی هەیە و دیموکراسییەتیش زەمینەی پێشکەوتنی زانست دەرەخسێنێت، بەبڕوای (دیویی) یەکسانی بنەمای دیموکراسییە، چونکە دیموکراسی بەبڕوای ناوبراو لەسەر ئەم ڕایە دامەزراوە کە مرۆڤەکان خاوەن عەقڵن و کەس لەسەر ئەوی ترنییە، هەروەها (دیویی) ئازادی پۆزەتیڤ بە مەرجی دیموکراسی دەزانێت. (بشیریە، ٢٠٠٥: ص ٥٨). (مۆنتسکیۆ) پێی وایە کە لە سیستەمێکی نادیموکراسی ترس و تۆقاندن بنەمای ژیانی سیاسی پێك دەهێنێت و ژیانی هاوولاتیان تا ئاستی ئاژەڵان دادەبەزێت و ئەم جۆرە سیستەمە بەردەوام هاوولاتیان دوورە پەرێز و پەراوێز دەکات و ترس و ڕەشبینی و گومان و نەزانی و دڵەڕاوکێی بلاودەکاتەوە و لێرەدا سیستەم وەکو دڕندەیەکە کە بەردەوام هەوڵی بەهێزکردنی خۆی دەدات لە ڕێگەی سەرکوتکاری و زوڵم و ستەم (بشیریە، ٢٠٠٥: ص ٤٩). (ژان ژاك رۆسۆ) بەم شێوەیە باسی لە دیموکراسییەت کردووە کە پێی وایە دیموکراسییەت بریتییە لە

گرنگترين ميكانيزم كە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە دەتوانێت ئازادی و ئۆتۆنۆمی خۆی بەردەست بكات (هێيود، ٢٠٠٧: ص٣٦٠).

(جۆزيف شۆمپيتەر) بەم شێوەیە پێناسەی ديموكراسی دەكات كە بريتييە لە: ((سيستەمێكی ڕێكخراو كە ئامانجی دروستكردنی بڕياری سياسييە لە ڕێگەی بەشداری تاكەكان و لە پڕۆسەی دەنگدان و هەڵبژاردن و كێبڕكێ و گرتنەدەستی دەسەڵات ئەم ئامانجە دێتە دی)). **(فؤاد عبدالله، ٢٠٠٤ : ص ١٦).** (جيمس برايس) مامۆستای ماف لە زانكۆی ئۆكسفۆرد (١٩٢٢-١٨٣٨) ديموكراسی بە سيستەمێك دەزانی كە تيايدا ويستی زۆرينەی كۆمەڵگە سەروەر بێت برايس بڕوای وابوو كە ديموكراسييەت سێ تايبەتمەندی هەيە، كە سيستەمی ديموكراتيك لە سيستەمە ناديموكراتيكەكان جيا دەكاتەوە:

١- ئامانجەكان لە ڕێگەی ڕای گشتی دەستنيشان و دياری دەكرێت نەوەك لە ڕێگەی گرووپەكانی ئەشراف و خانەدانەكان.

٢- ڕێبەران لە لايەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن و جگە لە هەڵبژاردنی گشتی هيچ ڕێگەیەكی تر بۆ گەيشتن بە پۆستە حكوميەكان نييە.

٣- هەموو هاووڵاتيان ئەو مافەيان هەيە لەگەڵ سياسەتەكانی كەسانی هەڵبژێردراوی خۆيان دژايەتی بكەن (بشيريە، ٢٠٠٩ : ص٤٤).

(ڕۆبيرت داڵ) بڕوای وايە كە لە ئەنجامی پڕاكتيزەكردنی ديموكراسی، ئەوا ديموكراسی چەند دەرئەنجامێكی باشی لێدەكەوێتەوە كە خزمەت بە كۆمەڵگا دەكات و دووری دەخاتەوە لە توند و تيژی و نا سەقامگيری وەكو:

١-دووركەوتنەوە لە دەسەڵاتێكی ديكتاتۆری و پاوانخواز و ملهور.

٢-دابينكردنی مافە بنەڕەتی و سەرەتاييەكانی مرۆڤ و هاووڵاتيان.

٣-دابينكردنی ئازادييە گشتييەكان.

٤-دەستەبەرکردن و ڕەخساندنی بوار و هەوڵ بۆ دیاریکردنی ماف و چارەنوس چ بۆتاك و چ بۆ گرووپە جیاوازەکانی ئەتنیکی، ئاینی، زمانی، کەلتووری و ...هتد.

٥-سەربەخۆیی و ڕێزگرتن لەبەها ئەخلاقیە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگە.

٦-پارێزگاریکردن لە بەرژەوەندیەکانی ماددی و مەعنەوی تاکەکەسی.

٧-دەستە بەرکردن و پارێزگاری لە یەکسانی سیاسی.

٨-هێنانە کایەی ئاشتی کۆمەڵایەتی.

٩-ڕەخساندنی دەرفەت بۆ پەرەپێدان و پاڵپشتی کردن لە هەموو بوارەکاندا. (داڵ، ٢٠٠٣ : ص ٤٨).

بە بڕوای "ئانتۆنی گیدنیز" مەبەست لە دیموکراسی، سیستەمێکی سیاسییە کە خاوەنی سێ تایبەتمەندی بێت: یەکەم، فرە حیزبی، واتە پارتەکان لەڕووی ژمارە و ئایدیۆلۆژیاوە فرە جۆرن. دووەهەم، هەڵبژاردنی ئازاد و مافی ڕاستەقینەی بەشداری کردن تیایاندا بۆ سەرجەم ئەوانەی مەرجەکانی دەنگدان دەیانگرێتەوە پارێزراو بێت. سێیەمیش، دەسەلاتێکی یاسایی (ئانتۆنی گیدنیز، ٢٠٠٩: ل١٨٦).

لە لایەکی تر زانایان بڕوایان وایە کە دیموکراسی تەنها بەهۆی یاساکانەوە نایەتە دی بەڵکو دەبێت لە ڕێگەی گەشەی پەروەردەی سیاسی و فرەیی و دوورخستنەوەی توند و تیژی و بەدیهێنانی جۆرێك لە یەکسانی کە دوور بێت لە بنەماکانی نا دیموکراسییەت و هەوڵی پتەوکردنی دیموکراسییەت بدەین بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین دیموکراسی سیستەمێکە بەردەوام پەیوەندی نێوان دەوڵەت و بکەرە کۆمەڵایەتیەکانی کۆمەڵگە ڕێکدەخات (میهرداد، ٢٠٠٧: ل٢٧٥).

بەبڕوای (پیەربۆردیۆ) زانای فەرەنسی، دیموکراسی بریتییە لە: بەشداری سیاسی، مافەکانی مرۆڤ و ئازادییەکانی، هەروەها سیستەمێکە بۆ دەسەلاتداریەتی کە ئامانجی ئەوەیە ئازادی بکاتە بنەمایەك لە پەیوەندیە

سیاسییەكان و تەنیا شێوازێكە كە جەخت لەسەر پاراستنی كەرامەتی مرۆڤی ئازاد دەكاتەوە)). هەروەكو لەمادەی (١٩،٢١) جاڕنامەی گەردوونی مافەكانی مرۆڤ هاتووە، فرەیی ڕێباز و ڕەوایەتیە بۆ سیستەمی سیاسی هاوچەرخ، كە لەمادەی (١٩) دا هاتووە: ((بۆ هەر كەسێك هەیە كەمافی ڕادەربڕین و ئازادی بیروباوەڕی هەبێت))، هەروەها لەمادەی (٢١) دا هاتووە: ((هەرتاكێك بۆی هەیە كە بەشداری لە بەڕێوەبردنی كار و باری گشتی دەوڵەتەكەیدا بكات بە شێوەی ڕاستەوخۆ یان لەڕێگەی نوێنەرەكانییەوە بە ئازادی ویستی خۆی)) (كامل محمد، ٢٠٠٨: ص٣٣). بەبڕوای "مارتین سیمۆرلیپییست" سیستەمە دیموكراسییەكان پێویستە سێ تایبەتمەندی سەرەكییان تێدا بێت:

١- لەسەر وەرگرتنی پۆستە دەوڵەتیەكان كێبركێ هەبێت.

٢- بۆ وەرگرتنی پۆستەكان، هەڵبژاردنێكی ئازاد، بێگەرد و گشتی هەبێت هیچ لایەنێك لە ژێر هیچ بیانو و پاساوێك پەراوێز نەخرێت.

٣- لە كۆمەڵگەدا ئەوەندە ئازادییەكانی مەدەنی و سیاسی بوونی هەبێت كە راستی و بێگەردی بەشداری و كێبڕكێیەكان گەرەنتی بكرێت. (سیمورلیپیست، ٢٠٠٤: ص١١). دیموكراسی زەمینەیەك دروست دەكات كە بیروبۆچوون و هێز و گرووپە جیاوازەكان، دەرفەتیان هەبێت كە ویست و داخوازی و ئامانج و بەرژەوەندیەكانیان لە پرۆسەی سیاسەت دانان رەنگ بداتەوە، كە ئەمەش لە ئەنجامی ئەوهەموو گۆڕانكاریەی ناوخۆ و دەرەكی بووە لە ژێر پرۆسەی بە جیهانی بوون، بەم مانایەی كە دیموكراسی لە ڕێگەی دووبنەمای سەرەكی بەشداری گشتی و كیبركێی سیاسی و كۆمەڵایەتیەوە لەڕێگەی پرۆسەی یاسایی و دامەزراوەكانەوە بەدواداچوونی ویست و داواكاریەكانیان بكەن بەم ڕێگەشەوە بەرژەوەندی نەتەوەیی بریتییە لە بەرژەوەندی ڕێژەیی و سازش لەسەركراوی هەموو هێز و گرووپ و تاكەكان لە پرۆسەیەكی ئاشتیانە و ڕێككەوتن، كە ئەمەش كاریگەری دەكاتە سەر ئاسایشی نەتەوەیی كە پارێزەری بەرژەوەندیە نەتەوەییەكانە. (نوروزی و **فیضی**،

٢٠٠٧: ص١٢٨). دیموکراسییەت سیستەم و نمونەیەکە، کە بەپێی مێژوو دوو ڕەهەندی هەیە، یەکەمیان، ڕەهەندێکی جیهانی کە دوو تایبەتمەندی هەیە، کە جیهانییە چونکە سیستەمێکە گرنگی بە مرۆڤایەتی دەدات واتە سیستەمێکی مرۆڤانەیە و مرۆڤایەتی بەشدارە لە پێشکەوتن و گەشەکردنی و هەروەها دەبێتە هۆی خۆشگوزەرانی مرۆڤ، بەڵام پێویستە تێبگەین کە ئەمانە رەها نین چونکە دیموکراسی بە پێی ئەوکۆمەڵگەیەی کە تیایدا جێبەجێ دەکرێت فۆرم دەگرێت، بۆیە ناتوانرێت دیموکراسی لە گۆرانکاریە ناوخۆییەکان جیابکرێتەوە و ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەك بسەپێنرێت (کامل محمد، ٢٠٠٨ : ص ٣٢).

## ٣–٢ سیستەمی سیاسی و ئەرکەکانی سیستەم:

### ٣-٢-١ سیستەمە سیاسییەکان:

سیستەمە سیاسییەکان بە درێژایی مێژوو لە سروشتیاندا جیاواز بوون بەهۆی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و کلتووری هەر کۆمەڵگەیەك شێوازی دەسەڵاتداریەتی لە هەر سیستەمێکی سیاسییدا فۆرمێکی تایبەتی بە سیستەمەکە بەخشیوە، بۆیە بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین سیستەمە سیاسییەکان دابەش بکەین بەسەر چەند جۆرێك کە بریتین لە:-

١- سیستەمی سیاسی لەڕووی سەرچاوەی دەسەڵات کە بریتین لە:

أ. سیستەمی پاشایەتی.

ب. سیستەمی کۆماری.

٢- سیستەمی سیاسی لەرووی چۆنییەتی بەڕێوەبردنی دەسەڵات بریتین لە:-

أ- سیستەمی پەرلەمانی، وەکو (بەریتانیا).

ب- سیستەمی سەرۆکایەتی، وەکو (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا).

ج- سیستەمی ئەنجومەنی، وەکو (سویسرا).

د- سیستەمی تێكەڵاو، وەكو (فەرەنسا) (**مصطفی** گزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢ : ل ٤٨-٤٧).

### ٣-٢-٢- جۆرەكانی سیستەمی دیموكراسی بە پێی پیادەكردن:

#### ١. دیموكراسییەتی ڕاستەوخۆ:

دیموكراسییەتی ڕاستەوخۆ یەكەمین جۆری سیستەمی دیموكراسییە كە تیایدا هاوولاَتیان بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ پیادەی دەسەلاَتەكانی خۆیان دەكەن، هاوولاَتیان ڕاستەوخۆ بەشدارن لە درووستكردنی بڕیار كەتیایدا نوێنەران بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ هەڵدەبژێرن، بەلاَم ئەم نوێنەرانە تەنها بۆ بەڕێوەبردنی كار و بارەكانیانە و ئەم نوێنەرانە ناتوانن بڕیار بدەن، ئەمەش لە یۆنانی كۆن لە دەوڵەتە شاری ئەسینا سەریهەڵدا، جێگەی ئاماژەیە كە ئەم جۆرە لە دیموكراسی بۆ ژمارەیەكی كەم لە هاوولاَتیان گونجاوە. (**مصطفی** گزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢ : ل ٨٩-٨٨).

#### ٢. دیموكراسییەتی ناڕاستەوخۆ یان نوێنەرایەتی:

دیموكراسییەتی ناراستەوخۆ لە ئەنجامی كەم و كورتیەكانی دیموكراسییەتی ڕاستەوخۆ درووست بووە، ئەم جۆرە دیموكراسییەتە بریتییە لەوەی كە هاوولاَتیان لە ڕێگەی هەڵبژاردنێكی ئازاد و دادپەروەرانە نوێنەرانی خۆیان هەڵدەبژێرن، بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ هاوولاَتیان دەسەلاَت بەڕێوە دەبەن، ئەم جۆرە دیموكراسییە بۆ یەكەم جار لە بەریتانیا سەری هەڵدا، ئەم جۆرە دیموكراسییەتە بە ئاسانی جێبەجێ و پیادە دەكرێت و پێویستە ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

١- هەڵبژاردنێكی ئازاد هەبێت.

٢- دەبێت پەرلەمانێك هەبێت كەخاوەنی دەسەلاَتی ڕاستەقینە بێت و دەسەلاَتەكانی دیاركرابێت و پیادەی دەسەلاَتەكانی بكات بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ دەسەلاَتێكی سەرووتر.

٣- دەبێت دەسەڵات بۆ ماوەیەکی دیاریکراوو کاتی بێت، لە ڕێگەی هەڵبژاردنێکی خولی، دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات دەستە بەرکرابێت.

٤- دەبێت پەرلەمان سەربەخۆبێت لە دەرکردنی بڕیار و یاساکان و پیادەکردنی دەسەڵاتی خۆی.

٥- پێویستە پەرلەمان نوێنەرایەتی تێکرای هاووڵاتیان بکات (**مصطفی** گەزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢: ل٩٢).

٣. دیموکراسییەتی نیمچە ڕاستەوخۆ:

ئەم جۆرە دیموکراسییەتە بریتییە لەوەی کە دەبێت پەرلەمان لەسەر هەندێك پرس و بابەتی گرنگ بگەڕێتەوە بۆ ڕای هاووڵاتیان، چونکە لە دەستووردا هاتووە کە هەندێك پرس هەیە کە پەرلەمان دەسەڵاتی ئەوەی نییە بڕیاریان لە سەربدات، وەك ڕاپرسی لەسەر دەستوور (**مصطفی** گەزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢ : ل٩٢).

**٣-٢-٣- دەوڵەت و ئەرکەکانی:**

دەوڵەتی مۆدێرن لەسەر بنەمای پەیوەندی تاك و بنەماڵەیی نییە، بەڵکو پەیمان و ڕەزامەندی کۆمەڵایەتیە. بەگشتی دەوڵەت بەمەبەستی هەندێك ئەرکی تایبەت و دیاریکراو دادەنرێ و پاساوی خۆی لە وەها دامەزراوێك وەدەست دەخا. مەبەست لە دامەزراندنی دەوڵەت پارێزگاری لە مافی سرووشتی و مەدەنی تاکەکانە و گەرەنتی گیان و ماڵ و ئازادی بەم جۆرە ئامانجی دەوڵەت و بنەمای ڕەوایەتیەکەیەتی. بە پێی تیۆری پەیمانی کۆمەڵایەتی یاسا دەرئەنجامی ویستی هاووڵاتیانە لە ڕاستیدا ڕەوایی دیموکراتیکە کە هەڵگری چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتیە و یاسا ویستی گشتی دەسەڵاتداریەتی هاووڵاتیانە و سیستەم دەرەنجامی پەیمانی کۆمەڵایەتیە بۆ دابینکردنی ئارامی و ئاسایش (بشیریە، ٢٠٠٩: ل٦٧).

ئەركی هەر دەسەڵاتێكی سیاسی ڕێكخستنی كاروبارەكانی ناوەخۆ و دەرەوەی دەوڵەتە، كە بنەمای سەرەكی دەوڵەتە و ئەم دەسەڵاتە هەڵدەستێت بە ئەركی یاسادانان و جێبەجێكردن و دادوەری، بۆ بەڕێوەبردنی كارەكان و پاراستنی ئاسایش و ئارامی هاووڵاتیان، بۆیە سیستەمی دیموكراسی باشترین سیستەمە كەتائێستا توانیویەتی لە سەرئاستی ناوەخۆ و دەرەوە بە پێی ئەو ئەرك و بەرپرسیاریەتیانەی كە دەسەڵات هەیەتی بە پێی ئەو بنەمایانەی كە لە تیۆری گرێبەستی كۆمەڵایەتی دا هاتووە، ئەركە كانی خۆی جێبەجێ بكات (**مصطفى** گەزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢: ل ١٩).

لە سیتەمێكی دیموكراسیدا دەسەڵات ناكەوێتە سەرووی كۆمەڵگا و هاووڵاتیانەوە چونكە دەسەڵات خستنە سەرووی كۆمەڵگا وادەكات كە دەسەڵات ببێتە سەرپەرشتیارێكی دەسەڵات خواز و سەركوتكەر، بەڵام كاتێك لە كۆمەڵگایەكدا كە ئەندامەكانی دەتوانن لە ڕێگەی ڕێوشوێنە یاساییەكانەوە بەشداری لە بڕیاردانی ژیانی سیاسی بكەن، لێرەدا دەوڵەت دەبێتە ئامرازێكی پەیوەندی و هەروەها ئامرازێك بۆ بەدیهێنان و پاراستنی بەرژەوەندی و ئامانجە هاوبەشەكان، بەم مانایە كەلە سیستەمێكی دیموكراسیدا ئەوە دەوڵەت نییە كە دەست نیشانی ئەركی هاووڵاتیان دەكات بەڵكوو ئەوە هاووڵاتیانن كە دەست نیشانی ئەركی دەوڵەت دەكەن (مەعروفی، ٢٠١٢: ص١٣). مەرجی سەرەكی بەردەوامبوونی دیموكراسی ئەوەیە كە هیچ گرووپێك جگە لە نوێنەرانی هەڵبژاردەی هاووڵاتیان مافی سیستەم و بڕیار وەرگرتنی نابێت كەوابوو دەسەڵاتی گشتی یان ڕێژەیی هەر یاریكەرێكی سیاسی هەڵنەبژێردراو بۆ دیموكراسی بەربەستی سەرەكی پێك دێنێت، هەربۆیە دەسەڵات و دەست ڕۆیشتووی سوپا لە سیاسەتدا و هەروەها نفوزی یاریكەرانی دەرەكی بەسەر سیستەمە دیموكراسییەكاندا یان گرووپەكانی فشار و ڕێكخراوی نهێنی توندوتیژ زیان بە دیموكراسی دەگەیەنن (بشیریە، ٢٠٠٩: ل٣٤٥).

ئەرکی سەرەکی سیستەم و دەوڵەت دابینکردنی ئاسوودەییە بۆ کەمکردنەوەی هەژاری و نایەکسانی کۆمەڵایەتی هەروەها دابینکردنی ئاسایشی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی دروستکردنی تۆڕیکی کارامەی دڵنیایی و تەندرووستی لە هەموو بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و دابەشکردنی سامان بەشێوازێکی دادپەروەرانە لە ڕێگەی سیستەمێکی خزمەت گوزاری گشتی و ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە سیستەم لە ئاستێکی باش ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات بەڵام لە ئەگەری لاوازی دەوڵەت و هەڵنەستان بەم ئەرکانە، ئەوا سیستەم ڕەوایەتی خۆی لەدەست دەدات. بەشێوەیەکی گشتی ئەرکەکانی دەوڵەت بریتین لە سێ ئەرکی سەرەکی:

١. پێویستە دەوڵەت لەسەر ئاستی ناوخۆ هەوڵبدات ئاسایشی ناوخۆ لەچوارچێوەی دامەزراوەکانی یاساییدا بە میکانیزمی ئاشتیانە بپارێزێت، چونکە دەوڵەت بەرپرسیارە لە ڕێکخستن و یەکگرتووی ناوخۆیی، ئەم یەکگرتوویەش ئاشتی و سەقامگیری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئاسایشی لێدەکەوێتەوە.

٢. پێویستە دەوڵەت ڕێز لەو گرێبەستە کۆمەڵایەتیە بگرێت کە لەنێوان خۆی و هاووڵاتیاندا هەیە کە لە دەستووردا ڕەنگی داوەتەوە، چونکە بەپێی گرێبەستەکە دەوڵەت بریتییە لە ویستی هاووڵاتیان بۆیە لادان لە پرەنسیپ یان بنەمایەکانی گرێبەستەکە لادانە لە بنەما و پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ و دادپەروەری و هەروەها لادانە لە ئەرکەکانی دەوڵەت.

٣. لەسەر ئاستی دەرەوە پێویستە دەوڵەت خۆی لە هەڕەشە و مەترسیەکانی دەرەکی بپارێزێت و بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان دەستەبەر بکات لە ڕێگای میکانیزم و دامەزراوەکانی تایبەت و ئەگەر دەسەڵاتێك لەسەر ئاستی ناوخۆ پاڵپشتی هەبێت واتا رەوایەتی هەبێت ئەوا دەتوانێت لە ئاستی دەرەکیش باشتر بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت بپارێزێت و یان دەستە بەریان بکات. .(هیێوود، ٢٠٠٧: ص١٣٩-١٤٠).

## ٣-٣- بنەماكانی سیستەمی دیموكراسی:

دیموكراسی چەندین بنەما و تایبەتمەندی سەرەكی هەیە، كە سروشتی سیستەمێكی دیموكراسی بەپێی پیادەكردنی ئەم بنەما و تایبەتمەندییانە دەناسرێتەوە، تاوەكو سیستەمێكی سیاسی بتوانێت زۆرترین ئاستی ئەو بنەما و تایبەتمەندییانە لەخۆیدا بەرجەستە بكات ئەوا زیاتر دەتوانێت دیموكراسی بێت.

### ٣-٣-١- مافە مەدەنی و سیاسی و ئازادییە گشتییەكان:

دیموكراسییەت لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای كۆمەڵێك لە مافە مەدەنییەكان بۆ هاووڵاتیان ڕاوەستاوە، مافە مەدەنییەكان بریتین لەو مافانەی كە هاووڵاتیان بە پێی دەستور و یاساكان هەیانە و دەبێت كەڵكی لێوەربگرن. چەمكی مافە مەدەنییەكان هاوتەریب لەگەڵ مافەكانی مرۆڤ بەكاردێت، مافەكانی مرۆڤ ئەومافانەن كە هەركەسێ بەپێی ئەوەی كە مرۆڤە هەیەتی وەكو مافی پارێزگاریكردن لە گیان و ژیان، مافی خاوەندارێتی و ... هتد.

جاڕنامەی جیهانی مافەكانی مرۆڤ لە ساڵی ١٩٤٨ لەلایەن نەتەوە یەكگرتووەكانەوە باسی لە گرنگترین مافەكانی مرۆڤ كردووە كە وادانراوە كە مافی مرۆڤ سەرچاوەی مافە مەدەنییەكانی هاووڵاتیانە، بەڵام مافە مەدەنییەكان پێویستە لە دەستور و یاساكانی ناوخۆی دەوڵەتان بەشێوەی ڕون و ئاشكرا گەرەنتی كرابێت بەتایبەتی پەیوەندیەكانی نێوان تاك و سیستەم، بۆ نمونە: ئازادی پێكهێنانی ئەنجومەنەكان و كۆڕ و كۆبونەوەكان و ڕێكخستنی خۆ پیشاندان، دەربڕینی سكاڵا و ناڕەزایەتی بەشێوەی مەدەنی لە دژی سیاسەتەكانی سیستەم یەكێكە لە ماف و ئازادییە سەرەكییە مەدەنییەكان كە لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا بۆ هاووڵاتیاندا دەستە بەركراوە هەروەها ئازادی ڕادەربڕین

یەکێکە لە گرنگترین مافە مەدەنی و سیاسییەکان لە سیستەمە دیموکراسییەکان کە دەکرێت بەشێوەی ماف و ئازادی بەیانی زارەکی یان نوسراوبێت، ئەم پەیوەندیە لەوانەیە لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە بێت، بۆیە لە سیستەمی دیموکراسی هونەر، ئەدەب، فەرهەنگ و ... هتد. ناخرێنە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵاتی سیاسی، هەروەها ئازادی بەیان بناغەی ژیانی دیموکراسی پێك دەهێنێت و ناکرێت بیروڕای جیاواز دژی سیستەم بە تاوان دابنرێت، بەشێوەیەکی گشتی ئازادی بەیان دەبێتە هۆی گەشەی توانا هزری و ماددییەکانی هاووڵاتیان بۆ بەشداری لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٥٢).

لە ماددەی (٢) لە ڕێککەوتنامەی نێونەتەوەیی مافە مەدەنی و سیاسییەکان دا، ئەرك و بەرپرسیاریەتی تایبەت بەربەست و سنووری لەبەردەم ئازادی ڕادەربڕین داناوە، کە بەپێی دەقی یاسایی یان پێویستیەك دەبێت ئەم ئازادییە سنوورداربکرێت، وەکو ڕێزگرتن لە ئازادی و کەرامەتی ئەوانی تر و هەروەها پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و نەریتی گشتی (**طلال المامری**، ٢٠١١ : ص٢٥). یەکێکی تر لە مافە بنەڕەتیە مەدەنی و سیاسییەکان بریتییە لە مافی دەنگدان، لە سیستەمێکی دیموکراسی دەبێت مافی دەنگدانی گشتی، یەکسان، نەهێنی و ڕاستەوخۆ دەستەبەرکرابێت (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٤٩). ئازادی سیاسی بریتییە لەوەی هاووڵاتیان لە ڕوی سیاسییەوە ئەوپەری ئازادییان هەبێت و هیچ لەمپەرێکیان نەبێت بۆ کاری سیاسی، چ وەکو تاك یان یان وەکو ڕێکخراو و پارتی سیاسی، هەروەها بۆچوونی سیاسی تایبەت بەخۆیان هەبێت و گوزارشت لە بۆچونیان بکەن ئەویش لە ڕێگەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن یان خۆپیشاندان و مانگرتن و ... هتد. ئازادییە سیاسییەکانیش بریتین لە: ئازادی خودی مرۆڤ و کۆیلە نەکردنی و ئازادی بیروباوەڕ و دەربڕین، هەروەها ئازادییە گرووپییەکان کە لە ڕێگەی کۆمەڵ و گرووپ ئەنجام دەدرێت وەکو پێکهێنانی ڕێکخراوە سیاسییەکان یان کۆمەڵەکان یان ئەندام بوون و ئازادی ڕاگەیاندن، مافی

دیاریكردنی چارەنوس بۆ تاك و هەروەها بۆ نەتەوەكان. ئەوانە هەموو بنەمای پێویستی دیموكراسین كە ڕاستەوخۆ پەیوەندیان بە ژیانی سیاسی و دیموكراسییەوە هەیە (محمد قادر، ٢٠٠٧: ص٧٢).

ماددەی (١٩) لە جاڕنامەی جیهانی مافەكانی مرۆڤ لەساڵی ١٩٤٨ دا جەخت لەسەر مافی ئازادی ڕادەربڕین دەكات كە گەڕان و ئاڵوگۆڕ و گواستنەوەی زانیاری و ئەفكار بەبێ ئەوەی سنووری هەبێت، دەگرێتەوە. هەروەها ڕێككەوتنامەی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەكان باس لەوە دەكات كە هەموو مرۆڤێك مافی ڕادەربڕینی هەیە بەبێ ئەوەی ڕێی لێ بگیرێت و هەروەها هەموو مرۆڤێك مافی ئازادی و ڕادەربڕینی هەیە و ئەم مافەش ئازادی لە پەیوەندیكردن و وەرگرتنی هزر و زانیاری و گواستنەوە لە خۆدەگرێت (**طلال** المامری، ٢٠١١ : ص ٤٨). چەمكی ئازادی لە پرۆسەیەكی دیموكراسی هەم ئامرازە و هەمیش ئامانجە بۆیە بەهیچ شێوەیەك ناتوانین دیموكراسییەت لە ماف و ئازادییە بنەڕەتیەكانی مرۆڤ جیابكەینەوە، لەرووی سیاسی یان كۆمەڵایەتی و ئابووری، چونكە كۆمەڵگە و پانتایی كۆمەڵگە وەكو بازارێكی ئازادی لێدێت بۆ بۆچوونە جیاوازەكان هەروەكو چۆن لە سیستەمێكی بازاری ئازاددا لە ئەنجامی كێبركێ كالا و خزمەتگوزاریەكان وادەكات كە نرخ لە باشترین ئاست بوەستێت، بۆیە لە ڕوی سیاسی و كۆمەڵایەتیەوە دەبێت كۆمەڵگە ئازاد و كراوە بێت بۆ كێبركێی سیاسی لەسەر بنەمای پلۆرالیزم و یەكسانی لە نێوان بیر و بۆچوونە جیاوازەكان هەموو پێكهاتەكان بە بێ پەراوێز خستن و ڕێگەگرتن لە بیر و بۆچوون و ئایدۆلۆژیاكانی تر، ئەمە وادەكات كە هاووڵاتیان ئازاد بن كە خۆیان لەم نێوەندەدا لەنێوان ئەم پێكهاتە و بیروبۆچوونەدا هەڵبژاردن بكەن، هەروەها ئازادییە سیاسییەكان دەبنە گوشار لەسەر سیستەم چونكە هاووڵاتیان داواكاری و داخوازی بەردەوامیان هەیە بۆ باشتربوونی ژیانیان و دەربرینی ویست و ویستیان و كەناڵەكانی ڕاگەیاندن لێرەدا باشترین میكانیزمن بۆ گووشار درووستكردن،

ئەمەش ئەم ئازادییانە جۆرێك دیالۆگ لەنێوان هاوولاتیان خۆیان و هاوولاتیان و دەسەڵات دروست دەكات (محمد قادر، ٢٠٠٧ : ص٧٧).

بەبڕوای دكتۆر "بورهان غلیۆن" دیموكراسی بەردەوام نابێت ئەگەر یەكسانی بوونی نەبێت، هەروەها ناتوانرێت دیموكراسییەتی كۆمەڵایەتی بوونی هەبێت ئەگەر ئازادی سیاسی دەستەبەر نەكرابێت، هەروەها بەبڕوای دكتۆر بورهان غلیون كۆمەڵێك فاكتەر كاریگەریان هەیە لەسەر سیستەمی سیاسی كەوا دەكات سیستەمە سیاسییەكە دیموكراسی یان نادیموكراسی بێت، وەكو : كەلتوور، ئابووری و كۆمەڵایەتی. هەروەها دیموكراسی بەرهەمێكی مێژووییە، بۆیە ناتوانرێت لە مێژووی خۆیدا لە چەمكی مرۆڤایەتی و تاكگەرایی جیابكرێتەوە. بەبڕوای "بورهان غلیۆن" دیموكراسی بریتی نییە لە یەكسانی و ئازادی بەڵكوو هەوڵدانە بۆ هاتنەدی و دەستەبەركردنی یەكسانی و ئازادی ئەمەش لە بنەمادا پەیوەندی بە پرسی دەسەڵاتەوە هەیە، بەم مانایە كە تا چ ڕاددەیەك هاوسەنگی هەیە لەنێوان دەسەڵات و بوارەكانی كۆمەڵایەتی و سیاسی، هەرچەندە ئەمە بەشێوەی رەها بوونی نییە (غلیون، ١٩٨٧: ص٦٧).

بەگشتی یەكێك لە پرەنسیپە سەرەكی و بنەڕەتیەكانی سیستەمی دیموكراسی بریتییە لە گرنگی پێدان بە مرۆڤ، بەوپێیەی كە مرۆڤ باڵاترین بەهایە و ڕێز لە مرۆڤ دەگرێت و مرۆڤ خاوەن مافی لێپرسینەوە لە دەسەڵاتدارانی هەیە، چونكە لەم سیستەمەدا بەشێوەیەكی داد پەروەرانە دەرفەتی بۆ ڕەخساوە، لە سیستەمێكدا كە یاسا سەروەرە، دادپەروەری كۆمەڵایەتی و ئازادی دەستەبەردەكرێت، چونكە لە نەبوونی ئازادییدا، دادپەروەری لە ئارادا نییە و هەروەها لەنەبوونی دادپەروەریش، ئازادی بوونی نابێت و لەنەبوونی ڕوانگەی ئەوەی كە مرۆڤ بەرزترین بەهاو یان بەهای باڵایە، هەردوو چەمكی دادپەروەری و ئازادی بوونیان نابێت، بۆیە دیموكراسی لە جەوهەردا سیستەمێكی كۆمەڵایەتی و كەلتوورییە، كە بە مرۆڤ دەست پێدەكات وەكو تاك (**طلال** المامری، ٢٠١١: ص٦٣).

لە سیتەمێکی دیموکراسیدا پێویستە مرۆڤ ئازاد بێت و لە هەلومەرجی تایبەتدا خاوەنی بڕیاری ئازاد و سەربەخۆ بێت بۆ دەستنیشانکردنی هەڵسووکەوتی خۆی، چونکە مرۆڤ تەنها کاتێك بەرپرسیارە لەبەرامبەر هەڵسووکەوتی خۆی کە بەئازادی بڕیاریدابێت، بۆیە ئازادی لەم پەیوەندیە بابەتێکی ڕەها نییە، بەڵکوو ئازادی بەمانای دیاریکردنی شێوەی ژیانە وەکو: ئازادی ئایین، جیهان بینی، ویژدان، هەروەها جگە لەمانەش ئازادی بەمانای پێشێل نەکردنی سنوورەکانی تایبەتی و ئاسایش لەبەرامبەر کردەوەی سەرەڕۆیانەی دەوڵەتە، ئەمەش تەنها ئەو دەوڵەتانەی کەخاوەن سیستەمێکی دیموکراسین دەتوانن ئەم ئازادییانە فەراهەم بکەن و بیپارێزن بە شێوەیەکی گشتی ئازادی بۆ هەموو هاوولاتیان لە ئامانجە بنەڕەتیەکانی دیموکراسییە و سیستەمی دیموکراسیش بەو پێوەرانە هەڵدەسەنگێنرێت کە تا چەندە توانیویەتی ئازادی و ئاسایشی تاك و کۆمەڵگا دەستەبەربکات (مەعروفی، ٢٠١١: ص١١-١٠).

بەشێوەیەکی گشتی ئازادی لە ڕوانگەی ئایزا بەرلین دابەش دەبێتە سەر دوو جۆر:

١. ئازادی نەرێنی: ئازادی کۆمەڵێك پێناسەی بۆ کراوە، بەڵام یەکەم جۆر بریتییە لە ئازادی نەرێنی کە بامانای ڕەتکردنەوە و نەبوونی هەر جۆرە دەستتێوەردانێکە یان بەمانای (ئازادی لە) (Freedom From) دەست تێوەردانی ئەوانی تر دێت هەروەکو (ئایزا بەرلین) پێیوایە کە ئازادیەکانی تر لەوەوە سەرچاوە دەگرن (جهانبگلو، ٢٠٠٢: ص٧١). ئازادی نەرێنی لەلایەك دەتوانێت زەمینە بۆ دروستکردنی کۆمەڵگەیەکی فرەیی (پلۆرالیستی) لەسەر بنەمای قبوولکردن و دانان بە فرەیی فەراهەم بکات، کە ڕێگە لە دروستبوونی دەسەڵاتی ملهور یان تۆتالیتەر بگرێت و لەلایەکی ترەوە دەتوانێت تاك گۆشەگیر و دوورە پەرێز بکات کە ئەمەش دیسانەوە مەترسیە بۆ دروستبوونی دەسەڵاتی ڕەها یان تۆتالیتاریزم (فروم، ١٩٩٦: ل٢٦٥). لێرەوەیەکە سنووری ئەو

دەستتێوەردان و جۆر و شێوازانە دێتەئاراوە کە پەیوەندی بە ئازادی ئەرێنی مافەکان و یاسا و بەگشتی دیموکراسییەوە هەیە.

٢. ئازادی ئەرێنی: لەچەمکی ئازادی ئەرێنیدا سەربەخۆ بونی تاك، کرداری عەقڵ و بەشداری لە هێزی گشتیدا خۆی حەشارداوە، بەو ڕاددەیە کە لە ئازادی نەرێنی دا پێویست بە دەستێوەرنەدان هەیە لە ئازادی ئەرینی دا ئازادی لەکردەوە بە پێی عەقلی مرۆڤ بوونی هەیە، بەم مانایە کە ئازادی ئەرێنی بەمانای خاوەن ویستی خۆ بوون و یان ئۆتۆنۆم بوونی تاکە (برلین، ١٩٨٩: ص٢٥٠). بەڵام لەم ڕووەوە ئازادی ئەرێنی پێویستی بە لەباربونی زەمینە و هەبوونی سەرچاوە و تواناکانە، بەم مانایە ئازادی ئەرێنی (ئازادی بۆ) (Freedom For) دێت و لێرەوە هەبوونی ئەو توانا و سەرچاوانە بەشێکن لە هەبوونی ئازادی.(گری، ٢٠٠٢: ص٩٤). لێرەدا دەتوانین بڵێین کە هەردوو جۆر یان ڕەهەندی ئازادی (ئەرێنی و نەرێنی) لەگەڵ ئاسایشدا هاوتەریبن، بەم مانایە کە ئەگەر ئاسایش بریتی بێت لە نەبوونی هەڕەشە و مەترسی ئەوا ئازادی نەرێنییە و ئەگەر بەمانای توانایی و بەهێزبوون (ئازادی ئەرێنی) و ئەگەریش پارێزگاریکردن لە خۆ و مانەوە و بوون بێت دیسانەوە ئازادی ئەرێنی و ئەگەریش لەسەر بنەمای هاوکاری وەرگرتن بێت ئەوا لە سیستەمێکی دیموکراتیکدا و فرەیی دا دێتە دی، کە هەردوو جۆری ئازادی (نەرێنی و ئەرێنی) لە هەڵسوکەوت و بەشێوەی دیالێکتیك پێکەوە کاردەکەن و دەتوانن ئاسایشی مرۆڤ و کۆمەڵگە بپارێزن، هەرچەندە ڕێژەیی بێت، چونکە سیستەمی دیموکراسیش سیستەمێکی رەها نییە.

### ٣-٣-٢- بنەمای هەڵبژاردنی ئازاد و نوێنەرایەتی:

هەڵبژاردن بنەمای سەرەکی سیستەمی دیموکراسییە و ڕێگەیەکە بۆ دەستنیشانکردنی دەسەڵاتداران کە پێچەوانەیە لەگەڵ شێوازەکانی تری دەسەڵاتداریەتی وەك دەسەڵاتی پشتاوپشت، دامەزراندن، دەست بەسەرداگرتن،

كە ئەمانە شێواز و ڕێگەی نادیموكراسین، چونكە هاووڵاتیانی ئازاد بەدرێژایی مێژوو هەڵبژاردنیان وەكو ئامرازێك بەكار هێناوە كە دەسەڵات بگەڕێتەوە بۆ هاووڵاتیان لە بڕی دەسەڵاتی ئەرستۆكراسیەكان، كەئەمەش لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە بووە، ئەم پرۆسەیەش وایكرد كە ڕۆڵی پارتە سیاسییەكان بەرزبێتەوە (**فؤاد** عبدالله، ٢٠٠٤: ص٢١).

هەڵبژاردن میكانیزمێكە لە میكانیزمەكان كە هاووڵاتیان بەهۆیەوە، دەنگ دەدەن بۆ دیاریكردن و هەڵبژاردنی نوێنەرەكانیان بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵات و یان دەگوترێت، هەڵبژاردن پرۆسەیەكە بۆ دیاریكردنی پاڵێوراوێك لە نێوان چەند پاڵێوراو بۆ بەڕێوەبردنی پۆستێك، كە بەپێی ئەومەرجانەی كە لەیاسای هەڵبژاردندا بەپێی دەستووردا هاتووە (**مصطفى** گزنەیی و عبدالله احمد، ٢٠١٢: ص١١٧). بنەمای نوێنەرایەتی بریتییە لەوەی كە هاووڵاتیان ناراستەوخۆ بەشدارن لە ڕێگەی نوێنەرەكانیانەوە لە دروستكردنی بڕیار و بەڕێوەبردنی دەسەڵات، پەرلەمان لە سەردەمی ئێستادا وەكو گرنگترین دامەزراوەی نوێنەرایەتیكردنی هاووڵاتیان هەژمار دەكرێت. یەكەم جار (تۆماس هۆبز) چەمكی نوێنەرایەتیكردنی هێناوەتە ئاراوە، بەبۆچوونی هۆبز ئەو دەسەڵاتەی كە پشتی بەستووە بە نوێنەرایەتی دەسەڵاتێكە كە بەویستی هاووڵاتیان پێكدێت (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٥٥). یەكێك لە تایبەتمەندییە سەرەكییەكانی دیموكراسییەتی لیبرال ئەوەیە كە جەخت لە سەرووەری هاووڵاتیان دەكاتەوە لە ڕێگەی هەڵبژاردنێكی ئازاد و ڕاستەقینە (**فؤاد** عبدالله، ٢٠٠٤: ص ١٨).

هەڵبژاردنی دەسەڵاتداران یەكێك لە بنەما و سیماكانی دیموكراسییە و هاووڵاتیان بەشێوەی ڕاستەوخۆ و نا ڕاستەوخۆ بەشداری لە پرسە گرنگەكان دەكەن لێرەوە دەسەڵاتداران بەنوێنەرایەتی گەل بڕیار وەردەگرن و لێرەوە وەڵامدەرایەتی سیستەم دێتە ئاراوە (یزدان فام، ٢٠٠٩: ص١٢٣). لە سیستەمێكی دیموكراسیدا پەرلەمان دامەزراوەیەكی سیاسی و یاساییە كە پێك

دێت لە ئەنجومەنێك یان دوو ئەنجومەن و ژمارەیەکی دیاریکراو ئەندامی هەڵبژێردراو کە دەسەڵاتی یاسادانانیان هەیە (**فؤاد** عبداللە، ٢٠٠٤: ص ٢١).

پەرلەمان یان ئەنجومەنی نوێنەران گرنگترین ئەرکی یاسادانانە و پەرلەمان بە دڵی دیموکراسی دادەنرێت، هەرچەندە لە سیستەمە نادیموکراسییەکانیش پەرلەمان هەیە بەڵام بەشێوەیەکی ڕووکەشیە و ڕاستەقینە نییە لەڕووی دەسەڵاتەکانییەوە، بنەمای ڕەوایەتی پەرلەمان لە سیستەمی دیموکراسی دا لەسەر بەشداری هاووڵاتیانە لە پرۆسەی هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە کە نوێنەرەکانیان هەڵبژێرن، پەرلەمان گفتوگۆکردنە لەسەر پرسە گشتییەکان و شوێنی یاسادانانە لەگەڵ پەرەسەندنی مافی دەنگدان پەرلەمانەکان دیموکراسیتربوون کە لەسەرەتادا دەنگدەران لەچوارچێوەیەکی تەسکتربوون، بەڵام دواتر بەهۆی نەمانی کۆسپ و بەربەستەکان مافی دەنگدان گشتگیر و فراوانکرا و هەروەها پارتە سیاسییەکان لە نێوخۆ و دەرەوەی پەرلەمان ڕۆڵێکی سەرەکیان گێڕا لە بەشداری پێکردنی هاووڵاتیان لە هەڵبژاردنەکان و بەگشتی لە پرۆسەی سیاسی و دیموکراسیدا (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٦٤).

بۆیە دەتوانین بڵێین کە دیموکراسییەت بریتییە لە کێبرکێی ئازاد و دادپەروەرانە بۆ گەیشتن بەدەسەڵات لەنێوان هێز و لایەنە سیاسییەکان و هەموویان بڕوایان وایە کە گەیشتن بە دەسەڵات بریتییە لەو توانایەی کە لەلایەن هاووڵاتیانەوە لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بەدەست دێت نەك لەڕێگەی توند و تیژی و هێزی سەربازی، کە ئەمەش ڕێگە لە دەسەڵاتداریەی پشتاوپشت دەگرێت و هیچ ڕێگەیەکی تر جگە لە هەڵبژاردنی دیموکراسیانە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بوونی نییە (عبدالجبار، ١٩٩٩ : ص١٣٨).

لە سیستەمەکانی دیموکراسی گرنگی بە ئاسایش، ئازادی، یەکسانی، یاسا، ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ، پاراستنی بەرژەوەندی گشتی، دادپەروەری و خۆشگوزەرانی، دابەشکردنی دەسەڵات، پێشکەوتنی زانست و وەبەرهێنانی

سامانە نەتەوەییەكان، ئاشتی، لێبوردەیی، پێكەوەژیانی ئاشتیانە، فرەیی، تاكگەرایی، سەقامگیری، ڕەخنەگرتن و ... هتد. دەدرێت و هەوڵ دەدرێت ئەم بوار بۆ بەدیهێنانیان فەراهەم بكرێت، كە ئەمەش لە دواجار وادەكات كە سیستەمێكی سیاسی سەقامگیر و هەڵبژێردراو لە ڕێگەی كێبركێی ئازاد و دادپەروەرانە لە نێوان هەموو هێز و لایەنە سیاسییەكان كە بوونیان هەیە، بێتە ئاراوە، لەرووی كۆمەڵایەتیەوە ئەم سیستەمە وادەكات كە هاووڵاتیان خاوەنی ئازادی و مافە مەدەنی و سیاسییەكان بن و ئەنجومەن و ڕێكخراوی مەدەنی و سیاسی چالاك بن و گوزارشت لە ویست و بەرژەوەندیەكانیان بكەن و بۆیان دەستەبەربكرێت (بەشیری، ٢٠١١: ص٢٣).

### ٣-٣-٣- دەستاودەستكردنی ئاشتیانەی دەسەڵات:

لە سیستەمێكی دیموكراسیدا، دەسەڵات گوزارشتە لە ویستی هاووڵاتیان و دەسەڵات دژی ویستی هاووڵاتیان نییە، چونكە بەردەوامی و مانەوەی ئەو دەسەڵاتە پەیوەندی بە ویستی هاووڵاتیانەوە هەیە، چونكە هاووڵاتیان تەنها مافی ڕەخنەگرتن و بەشداریكردنیان نییە لە دەركردنی بڕیارەكان، بەڵكوو مافی لادان و لێسەندنەوەی متمانەشیان هەیە لە دەسەڵاتداران، هەموو ئەمانەش لەرێگەی ئاشتیانەوە دەبێت ئەمەش وادەكات كۆمەڵگە دووربكەوێتەوە لە ململانێ و توندوتیژی و ئەمەش كۆمەڵگا بەرەو دابەشبوون نابات، كەببێتە هۆی نەمانی یەكڕیزی و تەبایی نەتەوەیی، ئەمەش فەراهەمكردنی دامەزراوەیی و میكانیزمی یاسایی پێویستە، ئەمەش لەڕێگەی دەستاودەستكردنی ئاشتیانەی دەسەڵات دەكرێت (عبدالجبار، ١٩٩٩: ص١٣٥-١٣٤). مەبەست لە دەستاودەستكردنی دەسەڵات، گۆرانی دەسەڵاتدارانە بەشێوەی خولی لە ڕێگەی هەڵبژاردنەكانەوە دەسەڵاتداران هەڵدەبژێردرێن، بەپێی دەستوور بۆ ماوەیەكی دیاریكراو، لە سیستەمێكی دیموكراسیدا دەوڵەت و دەستور بەردەوامە بەڵام دەسەڵاتدار یان

پارتی دەسەڵاتدار دەگۆڕدرێت لێرەوە دەسەڵات جێبەجێدەکرێت لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە، کە لەڕێگە هەڵبژاردنەوە هاووڵاتیان ڕەوایەتیان پێداون، بەپێی دەستوری دەوڵەت، بۆیە دەسەڵات ناکرێت مۆنۆپۆل بکرێت، بگوازرێتەوە بەشێوەی پشتاوپشت لە سیستەمێکی دیموکراسیدا، بۆیە پرەنسیپی دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات لەلایەن هێز و لایەنە سیاسییەکان یەکێك لە کاریگەرترین و دیارترین میکانیزمەکانی پیادەکردنی دیموکراسییە، لەبەر ئەوە ناکرێت قسە لەسەر سیستەمێکی دیموکراسیدا بکرێت ئەگەر دان بەهەموو گرووپ و لایەنە سیاسییەکان نەنرێت، وەکو ئۆپۆزسیۆن نەتوانێت دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت (**فرحان جیثوم**، ٢٠١٣: ص١). دیموکراسییەت بەبێ دەستاودەستکردنی دەسەڵات بەشێوەیەکی ڕەوا بوونی نییە، چونکە لە نەبوونی دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات مانا بۆ فرەیی نامێنێت و بەردەوام بوونی دەسەڵاتی کەسی یان لایەنێك بۆ هەمیشە، دەبێتە هۆی درووستبوونی گەندەڵی و ناکارامەیی و پەککەوتنی سیستەم، لە گرنگترین تایەتمەندیەکانی دیموکراسی فەراهەمکردنی میکانیزمی دەستاودەستکردنی دەسەڵاتە بەبێ کودەتا و سڕینەوە و توند و تیژی (**فؤاد عبدالله**، ٢٠٠٤: ص ٣٠).

لەلایەکی ترەوە پەیڕەوکردنی سیستەمی دیموکراسی توانای سیستەمی سیاسیان بۆ دەردەخات، چونکە ناتوانرێت دەسەڵاتی سیاسی، لەبەر ئەوەی دەسەڵات لەلایەن پارت و لایەنە سیاسییەکان پێکهاتووە، کە زۆرینەی دەنگەکانیان بەدەست هێناوە لە پرۆسەی هەڵبژاردنی دیموکراسیدا و لەبەر ئەوەی دەستاودەستکردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای کێبڕکێی ئازاد و پاك لەنێوان هێزو لایەنە سیاسییەکان ڕاوەستاوە، ئەم کێبڕکێیەش لەسەر بنەماو چوارچێوەی دەستوردا پەیرەو دەکرێت بەبێ ئەوەی لەم چوارچێوە دەربچێت چونکە لادان لەم چوارچێوە دەستوریە، دەرچوونە لە یاسا و سیستەم و هەروەها لادانە لە چوارچێوەی دیموکراسی بۆیە دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات بەمانای

ڕەزامەندی و ڕەوایەتیەکە لەلایەن هاووڵاتیانەوە دەردرێتەوە دەسەڵات (فرحان **جیثوم**، ٢٠١٣: ص٣).

ئەم چەمکە کۆمەڵێ واتا و بنچینەی فیکری لەخۆ دەگرێت، پێش هەموو شتێك واتای ئەوەیە کە بەر لەوەی کە بزانن کێ دەسەڵاتدارە، دەبێت ناوە ناوە دەستاودەستکردنی دەسەڵات هەبێت بەشێوازێکی ئاشتیانە لە دەست قەوارەیەك بۆ قەوارەیەکی تر، ئەو تایبەتمەندییەی کە سیستەمێکی دیموکراسی لە نادیموکراسی جیادەکاتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەم چەمکە وادەکات دەسەڵات هەتا هەتایە لەدەستی هیچ لایەنێك نەبێت، هاووڵاتیان مافی ئەوەیان هەیە کە خۆیان دەسەڵات بگرنە دەست لە ڕێگەی نوێنەرەکانیانەوە بەمیکانیزمی ئاشتیانە و هەڵبژاردنەوە و ڕەخسانی دەرفەت بۆ ئەو دەستاودەستکردنە، هەرچەندە هەڵبژاردن تەنها سەرچاوە نییە بۆ ڕەاویەتی دان بە دەسەڵات بەڵکوو چەندین بنەماو مەرجی تر هەن کە رەوایەتی دەدەن بە دەسەڵات هەروەها هەڵبژاردن دەبێت بەشێوەی خول بێت چونکە ماوەی دەسەڵاتداریەتی دیاریدەکات و هەروەها دەبێت فرەلایەنی بوونی هەبێت (**محمد** قادر، ٢٠٠٧: ص٣٦).

### ٣-٣-٤- جیاکردنەوە و دابەشکردنی دەسەڵات:

بونیادی سیستەمێکی سیاسی دیموکراسی لەسەر بنەمای دابەشکردنی دەسەڵات ڕاوەستاوە. (مۆنتسکیۆ) باسی لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کردووە و پێی وایە پێویستە هەموو دامەزراوەکانی سیستەم بەپێی تایبەتمەندی و ئەرکەکانیان جیا بکرێنەوە، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەمانای ورد تەنیا دابەشکردنی ئەرك نییە، بەڵکوو وادەکات کە ئەم دامەزراوانە سەربەخۆبن بەڵام پەیوەندی و هەماهەنگیان پێکەوە هەبێت، کەجۆری ئەم پەیوەندیانەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی سیستەمە سیاسییەکە و هەروەها چاودێری یەکتریش بکەن (**فؤاد** عبداللە، ٢٠٠٤: ص٢٥). لە هزری

مۆنتسکیۆدا هۆکاری سەرەکی دابەشکردنی دەسەڵات ئەوەیە کە دەسەڵات بەردەوام توشی خراپ کەڵك وەرگرتن لە دەسەڵات دەبێت، بۆیە دەبێت دەسەڵات دابەش بکرێت و سنووری دیاریبکرێت، هەرچەندە (مۆنتسکیۆ) لەگەڵ دابەشکردنی دەسەڵاتی پادشا بوو و پەرلەمانی وەکو پارسەنگێکی سیاسی و یاسایی لەبەرامبەر دەسەڵاتی رەهای پاشایەتی داناوە و داوای ئەوەی دەکرد کە دەسەڵاتی یاسادانان لە ژێر دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بێتە دەرەوە و بخرێتە ژێر دەسەڵاتی هاووڵاتیان (مەعروفی، ٢٠١١: ص٢٩).

مەبەست لە جیاکردنەوەی دەسەلاتەکان جیاکردنەوەی دەسەڵاتی دامەزراوە جیاوازەکانی وەکو یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەریە، جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان یەکێکە لە کۆڵەکەکانی دیموکراسی و ڕێگە گرتنە لە سەرهەڵدانی دیکتاتۆری و پاوانکردنی دەسەڵات، بەواتایەکی دیکە مسۆگەرکردنی ئازادیە، بەناوبانگترین زانا کەباسی لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کردووە (مۆنتسکیۆ) بووە کە سیستەمی سیاسی بەریتانیای وەکو نموونەیەکی ئایدیایی لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەرجەستە کرد، سیستەمی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان بەمانا مۆدێرنەکەی لە دەستووری ئەمریکاداهاتووە کە (جیمز مادیسۆن) بڕوای وابوو کە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان نابێت بەرەهایی بێت بەڵکوو دەبێت ئامرازەکانی چاودێریکردن و هەماهەنگی پێکەوە پێکبێت (بشیریە، ٢٠٠٩: ص ٢٥٩).

مەبەست لە چاودێری کردنی یەکتری لەلایەن دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەری بەمەبەستی دروستکردنی هاوسەنگییە لە نێوانیاندا، لە سیستەمێکی دیموکراسی مەبەست لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان چاودێری کردنی یەکتری دەسەڵاتەکانە (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٦١).

**٣-٣-٥- دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆ و سەروەری یاسا:**

دەسەڵاتی دادوەری بنەما فراوان و گشتییەکەی بریتییە لە یەکلایی کردنەوەی کێشە یان دوژمنایەتی نێوان لایەنەکان لە ڕێگەی پابەند بوون بەیاساکانەوە، ڕۆڵی دەسەڵاتی دادوەری ڕۆڵێکی گرنگە لە کۆمەڵگەدا و بەرگری کردنە لە مافخوازەکان، دەسەڵاتی دادوەری ئامرازێکە بۆ گەڕاندنەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان هەروەها پارێزەری ماڵ و سامان و کەرامەت و ئازادی مرۆڤەکانە، بۆیە کاتێك دەسەڵاتی دادوەری بە ئەرکەکانی خۆی هەڵدەستێت، ئەوا گەورەترین گەرەنتیە بۆ پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و کۆمەڵەکان، ئەمەش وادەکات کە هەمووان یەکسان بن لەبەردەم یاسا، پرەنسیپی سەربەخۆیی دادوەری لەسەر بنەمایەکی بنەڕەتی ڕادەوەستێت و ئەوەیش ئەوەیە کە یەکسانی و دادپەروەری لە بڕیارەکانی دا هەبێت (**حسین كاظم الشمري**، ٢٠١٣: ص٩).

دەسەڵاتێکی دادوەری سەربەخۆ بنەمای ژیان و سیستەمێکی دیموکراسییە چونکە ئەم دەسەڵاتە گەرەنتی بەڕێوەچوونی ژیانی سیاسییە لە دەوڵەت، هەروەها دەسەڵاتی دادوەری کاتێك دەکرێت سەربەخۆ بێت کە سیستەمەکە سیستەمێکی دیموکراسی بێت، بۆیە هەتا دەسەڵاتی دادوەری زیاتر سەربەخۆبێت باشتر دەتوانێت بەرژەوەندیەکانی هاووڵاتیان و هێز و لایەنە سیاسییەکان بپارێزێت، چونکە کاتێك کێشەو ململانێ درووست بوو لەنێوان هاووڵاتیان یان هاووڵاتیان و دەسەڵات، ئەوە دەسەڵاتی دادوەری کار بۆ جێبەجێکردنی یاسا دەکات، هەروەها نابێت هیچ دەسەڵاتێکی تر وەکو دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێ کردن ڕێگری لە جێبەجێی یاساکان بکەن یان بیگۆڕن و دەستکاری بکەن (**محمد قادر**، ٢٠٠٧: ص١٩٧). دەسەڵاتی دادوەری لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بەتەواوەتی سەربەخۆیە لە دەرکردنی بڕیارەکان کە خۆی لە لێهاتوویی، پاکی، بوێری دا

دەبینێتەوە، هەروەها دەزگایەکە بۆ بەهێزکردن و ڕاستکردنەوە و باشترکردنی بەردەوامی سیاسەتەکانی دەوڵەت (حرب، ٢٠١٠: ص١٣٠).

دیموکراسی لە سەردەمی نوێدا بریتییە لە بەرنامەو میکانیزمێکە بۆ ڕێکخستنی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی نەك بیر و باوەری دیاریکراو گشتگیر و بەپێی دەستوور پیادە دەکرێت و سیستەمێکە بۆ درووستکردنی بڕیار لەلایەن هاووڵاتیان لە کۆمەڵگەی دیاریکراو بە پێی دەستور و ڕێبازێکی پێویستە بۆ پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە نێوان تاکەکان لە کۆمەڵگە. سیستەمی سیاسی بەپێی پرەنسیپ و دامەزراوەکان دەرفەت دەڕەخسێنێت کە هاووڵاتیان و لایەنە سیاسییەکان بتوانن چارەسەری کێشە و ناکۆکیەکان بکەن لە هەمان کاتدا بەلەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەکان ئەم ململانێیە لە کۆمەڵگەدا بە شێوازێکی ئاشتیانە، بەڕێوە بچێت، لەم بارودۆخە دایە، کە کۆمەڵگا توانای کۆنترۆڵکردنی سەرچاوەکانی توند و تیژی و ڕووبەڕووبونەوەی ئاژاوە و جەنگی ناوخۆیی هەیە و لێرەوە پیادەکردنی دیموکراسی بەپێی دەستور ڕێکدەخرێت (عبدالجبار، ١٩٩٩: ص ١٤٦).

ژیانی سیاسی لە چوارچێوەی دەستووردا پیادە دەکرێت و هەندێك بنەماهەیە کە لە دەستووردا هاتووە و پێویستە کە سیستەمی دیموکراسی پارێزگاری لێبکات بەو پێیەی کە هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا لەسەری ڕێککەوتوون، ئەمەش دەبێتە هۆی هاتنەدی سەقامگیری کۆمەڵگە و کۆمەڵگەش دەتوانێت تواناکانی بخاتە گەر بۆ چارەسەرکردنی ئاشتیانەی کێشەکانی، کەواتە لێرەدا سیستەمێکی دیموکراسی سەقامگیری و ئاسایش دەستەبەر دەکات و لەلایەکی ترەوە ئەم سەقامگیری و ئاسایشە لەکۆمەڵگەدا، دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەی ئاشتیانە و دیموکراتی (عبدالجبار، ١٩٩٩: ص ١٤٧).

ئەو دەسەڵاتانەی کە ڕەوایەتییان لە دەستوور وەردەگرن بەدەسەڵاتێکی سەرکەوتوو هەژمار دەکرێن، لەم جۆرە دەسەڵاتانەدا، سەرکردەکان تەنها وەکو

فەرمانبەر وان تەنها دەسەڵات بەڕێوە دەبەن و خاوەنی سەرەکی دەسەڵاتیش بریتییە لە دەوڵەتەکە ئەم دەسەڵاتەش لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بریتییە لە ویستی هاووڵاتیان، لە سیستەمە نا دیموکراسییەکان دەوڵەت ڕەوایەتی نییە، چونکە دەستوور و سیستەمەکە بەپێی ویست و ویستی هاووڵاتیان نەبووە، کەواتە قەیرانی ڕەوایەتی یەکێکە لە گرنگترین ئەو قەیرانانەی کە لە دەوڵەتە نادیموکراسییەکاندا بەهۆی نەبوونی دەستوورێکی ڕەوا تووشی دەبن (کەریم محمود، ۲۰۰۹: ص١٤٤). دیموکراسی تارادەیەکی زۆر گرێدراوی بوونی دەستورە، کە لە گرنگترین خاڵەکان دەتوانین ئاماژە بە:

١. لە دەستوردا سیستەمی فەرمانڕەوایی دەوڵەت دەستنیشان دەکرێت لەگەڵ هەموو ئەو بنەما و دامەزراوانەی کە پێویستن بۆ بەڕێوەچوون و جێگیربوونی سیستەمە دیموکراسییەکە یان لە دەوڵەتێکدا کە جۆری فەرمانڕەوایی سیستەمێکی دیموکراسییە، لە ناو ئەو دەستوورە گوزارشتی لێی دەکرێت.

٢. دەستوور دەسەڵات بۆ هەموو ئۆرگانەکانی سیستەمی سیاسی دەست نیشان دەکات وەك دەسەڵاتی پاشا، سەرۆك، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، وەزیرەکان و پەرلەمان و دەسەڵاتی دادوەری و دیاریکردنی دەسەڵاتەکانیان دەبێتە هۆی سنووردارکردنی دەسەڵاتەکانیان و لێرەوە کەس لە سەرووی یاساوە نییە، ئەمەش ڕێگری لە قۆرخکردنی دەسەڵات دەکات و هەرکەسێکیش لەم پرەنسیپانە لابدات لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێت.

٣. دەستوور چونکە لەلایەن هەموو یان زۆرینەی هاووڵاتیانەوە پەسەند کراوە، ناکرێت پەرلەمان یان سیستەم دەستکاری دستوور بکەن، ئەگەر پارتێکی سیاسی زۆرینەی کورسیەکانی پەرلەمانی لەدەست دابوو، چونکە لە دەستوردا باس لە ماف و ئازادیەکانی هاووڵاتیان کراوە، بۆیە هەر دەستکاریەك دەبێت بگەڕێتەوە بۆ هاووڵاتیان (محمد مسعد، ۲۰۰۷: ص٢٨٧). مەبەست لە سەروەری یاسا دەسەڵاتی یاسایە (The Rule of Law) و بریتییە لەوەی کە هەموو کەس و

دامەزراوە گشتی و تایبەتیەکان لە ژێر دەسەڵاتی یاساکاندان کە بەیەکسانی بەسەریاندا جێبەجێ دەکرێت و بەسەربەخۆیی دەردەکرێت، کە ئەمەش هاوتەریبە لەگەڵ بنەماکانی یاسای نێو نەتەوەیی بەتایبەت لەبواری مافی مرۆڤ، بۆیە ئەم جۆرە سەروەریەی دەسەڵاتی یاسا تەنیا لە سیستەمێکی دیموکراسیدا جێ بەجێ دەکرێت، چونکە تەنانەت ئەگەر لە سیستەمەکەدا پادشاش بوونی هەبێت کەس لە سەرووی یاسا نییە، بەڵکوو هەرچی هاووڵاتیە بەسەرۆك و پادشاشەوە دەبێت پابەندی یاسابن و ڕێزی لێ بگرن و پێشێلی نەکەن، هەروەکو مۆنتسکیۆ دەڵێت: ((پێویستە یاسا وەکو مردن وابێت، لەسەر کەس باز نەدات)) (محمد رزگار، ٢٠٠٧: ص ١٥١). بەگشتی پێویستە لە سیستەمێکی دیموکراسی، یاساکان ئەم تایبەتمەندییانەیان تێدابێت:

١. پاراستنی مافەکان: یاسا لە سیستەمێکی دیموکراسی، تەنها بنەما نییە بۆ دیموکراسی بەڵکو دەبێت چوارچێوەی سیستەمێکی دیموکراتیك دابڕێژرێت و لەم چوارچێوەیە دەبێت گشت ماف و ئازادیە سەرەکییەکان بۆ هاووڵاتیان و دامەزراوەکان مسۆگەر بکات و دەسەڵاتی دامەزراوەکان دەستنیشان بکات و بەرگریان لێ بکات، یاسا دەبێت لە چوارچێوەی یاساییدا هەم مافی کەمینەکان و هەم زۆرینە بپارێزێت واتە هاوسەنگیەك لە نێوانیاندا دروست بکات.

٢. بێ لایەنی: پێویستە یاساکان لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بێ لایەن بن لە نێوان هەموو هاووڵاتیان و هێز و گرووپە جیاوازەکان و هەروەها لەنێوان هاووڵاتیان و سیستەم دا چونکە دەبێت یاساکان بە بێ لایەنی دابڕێژرێت و بەبێ لایەنی جێبەجێ بکرێت و هەروەها یاساکان ڕوون و ئاشکرابن.

٣. وڵامدەرایەتی: یاسا پێویستە بەشێوەیەك بێت کە بەرپرسیاریەتی بۆ دەسەڵاتدارانی بێتە کایە و دەسەڵاتدارانیش وەڵامدەر بن لەهەمبەر ویست و داواکاری و داخوازی هاووڵاتیانەوە.

٤. درووستکردنی تێگەیشتنی هاوبەش و سیستەمی کارامە: پێویستە یاساکان تێگەیشتنەکی هاوبەش درووست بکەن بۆ پرس و بوارەکان لە نێوان هاووڵاتیان و هەروەها هاووڵاتیان و دەسەڵاتداران ئەمەش کۆمەڵگا لە ململانێی نەرینی و توند و تیژی و پێکدادان دوور دەکاتەوە، هەروەها پێویستە یاساکان بە شێوەیەك بن کە گەرەنتی سیستەمێکی کارامە بکەن بەم مانایەی کە دارشتن و جێ بەجێ کردنی یاسا بەپێی ویست و داواکاری هاووڵاتیان دەتوانێت سەروەری یاسا بپارێزرێت، چونکە بوونی یاسا وادەکات کە دادپەروەری کۆمەڵایەتی و هەروەها ئاسایش و خزمەت گوزاری هاووڵاتیان و بەرژەوەندیەکانیان دەستەبەر بکرێت و بۆیە پێویستە یاساکان بە ئامرازی توندوتیژی جێبەجێ نەکرێن، بەڵکو رەوایەتییان هەبێت لەلایەن هاووڵاتیانەوە.

٥. رەوایەتی: پێویستە کە ئەم یاسایانە لە سیستەمێکی دیموکراسی لەلایەن هاووڵاتیانەوە بەشێوازێکی دیموکراسی پەسەند کرابێت، کە ئەمەش رەوایەتی دەداتە ئەم یاسایانە و وادەکات بەردەوام بن ئەم یاسایانە کاتێك رەوایەتیان هەیە کە دەربری ویست و بۆچوون و بەرژەوەندی هاووڵاتیان بن و لەلایەن نوێنەرەکانیانەوە دارێژرابن (داڵ، ٢٠٠٣: ص ١٣٦-١٣٤).

بنەمای سەروەری یاسا وا دادەنرێت کە یەکێکە لە میکانیزمە بنەرەتیەکان بۆ گەرەنتی کردنی پرەنسیپی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ، دەسەڵات ملکەچ دەبێت لە دەوڵەت بۆ یاسا بە پێی دەستور، کە تیایدا رێساکانی دەسەڵاتداری و ماف و ئەرکە کانی دیاریکراوە و هەروەها ئازادیە گشتییەکان و لێرەوەیە کەتاك پێگەیەکی یاسایی پەیدا دەکات لە بەرامبەر دەسەڵات (**حسين كاظم الشمري**، ٢٠١٣: ص٨).

سەروەری یاسا لە سیستەمێکی دیموکراسی دەتوانێت سنوور بۆ دەسەڵاتداران دابنێت لە کاتی بەکار هێنانی و هەروەها لەکاتی دەستاودەستکردنی دەسەڵات ناکرێت دەسەڵاتی تازە هەموو یاساکانی پێش خۆی رەت بکاتەوە بەڵکو دەبێت بە

یاسای تر بیانگۆڕێت هەروەها سەروەری یاسا دەتوانێت ماف و ئازادیەکانی تاك و گرووپە جیاجیاکان ڕێکبخات کەلە دەستور و یاساکان بەدەق دارێژراوە، بۆیە دەسەڵات ناتوانێت لە سیستەمێکی دیموکراسیدا دەستکاری ئەو ماف و ئازادیانە بکات، هەروەها سەروەری یاسا دەبێتە میکانیزمێك بۆ بەدیهێنانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی و پاراستنی ماف و ئازادیەکان بۆیە نەبوونی سەروەری یاسا بەمانای نەبوونی دیموکراسییەتە، هەروەها بەسەروەری یاسا پەرەپێدانی تاك و کۆمەڵگا لە هەموو بوارەکان زیاتر پێش دەکەوێت و ڕێگە لە گەندەڵی دەگرێت بەم مانایە هەرکاتێك کە یاسا سەروەر نییە، ئەوکاتە ناتوانین باس لە بوونی ئاسایش بکەین، بەهۆی ئەوەی کە نەبونی یاسا ترس و توند و تیژی و تۆقاندن و سەرکوتکردن و پێشێل کردنی مافی مرۆڤ بەدوای خۆیدا دێنێت (**محمد** رزگار، ٢٠٠٧، ص ١٥١).

**٣-٣-٦- فرەیی و یەکسانی سیاسی:**

سیستەمێکی دیموکراسی پشت بە فرەیی سیاسی و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان دەبەستێت و دەسەڵاتی فەرمانڕەوا سنووردار دەکات و وادەکات کە هاووڵاتیان ئازاد بن لە دەربڕینی بیروڕاو ئازادی کۆبونەوە و ڕۆژنامەگەری و ئازادی لە درووستکردنی ڕێکخراو و کۆمەلەکان و ئازادی ئایین و... هتد (**فؤاد** عبدالله، ٢٠٠٤: ص١٨). یەکێکی تر لە بنەماکانی دیموکراسی، فرەیی سیاسییە و لەناو هەموو کۆمەڵگەیەك دا ناکرێت تەنها یەك ڕوانین و لایەنی ڕەها بوونی هەبێت، چونکە زاڵ بوونی لایەنێك یان بیرۆکەیەك، دەبێتە مەترسی و هەرەشە و داخرانی کۆمەڵگە و کوشتنی داهێنان و دواکەوتنی لە گۆڕانکاریەکانی سەردەم، چونکە فرەیی لە ڕوانگە و بیروڕا دەبێتە هۆی فەراهەمکردنی ژینگەیەکی تەندروست و کارلێکی ئەم بیر و ڕوانگە و لایەنە جیاوازانە دەبنە هۆی نوێبوونەوە و پێشکەوتنی کۆمەڵگە (**فؤاد** عبدالله، ٢٠٠٤: ص٣٠).

ئەم بنەمایە دەربڕی ئەوەیە كە لە كۆمەڵگەكاندا، تاكەكان و گرووپەكانی نەتەوەی جیا جیا بوونیان هەیە كە خاوەن حەز و ویست و بەرژەوەندی جۆراوجۆرن، كە هەندێك كات لەگەڵ یەك هاوبەش و هەندێك كاتی تر دژی یەكن، بۆ پاراستنی یەك پارچەیی و یەككگرتووی كۆمەڵگا، فرەیی بەرژەوەندیەكانی قبووڵ كراوە و بنەمای ڕەچاوكردنی یاسا و سەروەری یاسا و چارەسەركردنی ئاشتیانەی كێشەكان، ڕێككەوتنی لەسەر كراوە، ئاسانگیری لە هەڵسوكەوت لەگەڵ ئەوانیتر بنەمایەكی بنەڕەتی لەدرووستبونی كۆمەڵگە و سیستەمێكی دیموكراتیكە (یزدان فام، ٢٠٠٩: ل١٢٣). پەیوەندی نێوان فرەیی سیاسی و دەستاودەستكردنی دەسەڵات، پێویستە كە میكانیزمەكانی بەشداری سیاسی فەراهەم بكرێت، بۆ دروستكردنی بڕیار و دیاریكردنی ئەلتەرناتیفە گشتییەكان، چونكە هەموو لایەنەكان مافێكی سیاسی و یاساییان هەیە و هەروەها پابەند دەبن بۆ جێبەجێكردنی ئەو بڕیارانە، بۆیە پێویستە سیستەمی سیاسی ئازادی پێكهێنانی كۆمەڵە و گروپی گوشار و بەرژەوەندی و دامەزراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی و پارتی سیاسی، دەستەبەر بكات و زەمینەی گونجاویان بۆ چالاكی فەراهەم بكات، بۆئەوەی كە هەموو لایەنەكانی كۆمەڵگە كە خۆیان بەشدارن لە پێكهێنانی سیستەمی سیاسی، بتوانن كە بەرگری لە ماف و بەرژەوەندیەكانیان بكەن و بەشداریش بن لە درووستكردنی بڕیاری سیاسی، لە ئەنجامدا، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی كە هاوسەنگی لەنێوان بەرژەوەندیە جیاوازەكان دا درووست دەبێت بەبێ ئەوەی كە هیچ كەس و لایەن هەست بە پەراوێز خستن و چەوسانەوە بكات (فرحان **جیثوم**، ٢٠١٣: ص٣). فرەیی سیاسی بریتییە لە جیاوازی لە بیرو ڕاو بۆچوونی هزری و هەروەها جیاوازی لە بەرژەوەندیەكان و هەروەها جیاوازی لە پێكهاتەی كۆمەڵایەتی، ئابووری و دیموگرافی، بۆ ئەوەی كە فرەیی سیاسی لە دەوڵەت دەستەبەر بكرێت پێویستە سیستەمێكی سیاسی بوونی هەبێت كە باوەڕی بە جیاوازی چین و گروپە جیاجیاكانی ناو كۆمەڵگە هەیە كە مافیان هەیە

خاوەنی ڕێکخستنی سەربەخۆ بن و بۆ ئەوەی گوزارشت لە ڕا و بەرژەوەندی و ناسنامەیان بکەن. هەبوونی ڕێکخراوێکی نێوەند، لەنێوان کۆمەڵگە و سیستەم وادەکات پرۆسەی سیاسی ڕێك بخات وەکو پارتە سیاسییەکان (**فرحان جيثوم**، ٢٠١٣: ص٣).

جوس مارفال، ئەندامی پەرلەمانی ئیسپانیا لە نێوان ساڵانی (١٩٨٤-١٩٨٨) بڕوای وایە کە فرەیی سیاسی وادەکات کە زۆرترین زانیاری پێویست بۆ درووستکردنی بڕیار لە بەردەست دابێت، هەروەها دامەزراوە دیموکراسییەکان تێچووی دارایی بۆ پرۆسەی چاکسازی ئابوری کەم دەکەنەوە، هەروەها ناوبراو پێی وایە کە دیموکراسییەت و فرەیی وادەکات کە ڕۆڵێکی گرنگیان هەبێت لەوەی کە هەڵە سیاسییەکان ڕاست بکەنەوە بەهۆی ئەوەی کە ململانێ سیاسییەکان لە سیستەمێکی سیاسی دیموکراسی دا سزا و پاداشت هەبێت و ئەو سیاسیانەی کە هەڵە دەکەن ئەوا لایەنگری گەل و ڕەوایەتی لە دەست دەدەن (**حسين كاظم** الشمري، ٢٠٠١: ص ١١٢).

"ئالان تۆرین" زانای فەرەنسی لە کتێبی (دیموکراسییەت چیە) دەڵێت: (( کە بەبێ ئازادی و فرەیی سیاسی، دیموکراسییەت بوونی نییە، چونکە تەنیا لە سایەی ئازادی و فرەیی سیاسیدایە کە هاووڵاتیان دەتوانن دەستنیشانی نوێنەرەکانیان بۆ دەسەڵاتداریەتی)) (عبدالجبار، ١٩٩٩: ص ١٣٨-١٣٧). هەروەها ناکرێت باس لە دیموکراسی بکەین بەبێ فرە پارتی و زەمینەخۆشکردن بۆ کاری پارتی و هەروەها دیموکراسی وەکو شورەیەك وایە بۆ پاراستنی نیشتیمان و بە هێزکردنی دەوڵەتی یاسا، کە بریتییە لە پاراستنی بەرژەوەندی دەوڵەت و هاووڵاتیان و سیستەمی سیاسی بەهۆی ئەوەی کە سیستەمی سیاسی پشت بە ڕەوایەتی پێدانی هاووڵاتیان دەبەستێت، فرەیی پارتی دەرفەت درووست دەکات بۆ هەمووان و پارتە سیاسییەکان کاردەکەن بۆ پەرەپێدانی دەوڵەت لە بوارە جیاجیاکان، هەروەها فرەیی پارتە سیاسییەکان ڕێگە لە لێکترازان بەهۆی

بەرزبوونەوەی ڕۆڵی هۆز، عەشیرەت، چینایەتی و ... هتد، دەگرێت، چونکە ئەم لێکترازان و ململانێیانە، کۆمەڵگا توشی قەیران و لێك هەڵوەشاندنەوە دەکات چونکە ئەم جۆرە کێشەو گرفتانە کە لەلایەن ئەو گرووپانەوەیە کە ڕەچاوی بەرژەوەندی خۆیان دەکەن نەك دەوڵەت و نەك نەتەوە بەلام پارتە سیاسییەکان دەتوانن لە چوارچێوەی بەرنامە و ئامانجی هاوبەش هاوولاتیان کۆبکەنەوە بە پێی پلانی مۆدێرن و زانستی تواناکان هەیە بۆ جێبەجێکردنی، کە لەکۆتاییدا بریتییە لە بەرژەوەندی نەتەوەیی، کەواتە بانگەشەکردن بۆ دیموکراسی بە بوونی فرەپارتی و فرەیی سیاسی یەکێکە لە پرسە پێویستەکان، بۆ هەموو دەوڵەتێکی ئازاد کە لە سەقامگیری دا دەژین و هەوڵدەدەن بۆ بنیات نانی دیموکراسی و سیستەمێکی سیاسی نوێ کەهەموو هێزە نیشتیمانییەکان لە خۆدەگرێت و بونیات نانی بەرژەوەندی نوێ کەلەسەر دابەشکردنی دادپەروەرانەی نەتەوەیی و هەستان بە پرۆسەی بونیاتی سیاسی، لە ڕێگەی بەشداری هەموو هێزەکانی سیاسی کۆمەلایەتی چالاك لە کۆمەڵگە کە دەتوانن بەشداربن لە دروستکردنی بڕیاری سیاسی و پاراستنی پرۆسەی دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەلات، بۆیە فرەیی سیاسی وا دادەنرێت کە ڕەگەزێکی گرنگە لە دیموکراسی (**حسين كاظم الشمري**، ٢٠١٣: ص٣).

بەرژەوەندی نەتەوەیی دەوڵەتان بەشێوەیەکی ڕێژەیی لە سیستەمە دیموکراسییەکان بەهۆی بوونی کۆمەڵێك میکانیزم بۆ کۆنترۆڵکردنی ڕەفتاری نوخبەکان و لەسێبەری فرەیی پێکهاتەکان و سەربەخۆیی ڕێژەیی هێز و لایەنە کۆمەلایەتیەکان و بەواتایەکی تر، دابەشکردنەوەی دووبارەی دەسەلاتە کە دەوڵەتانی نا دیموکراسی، خاوەنی ئەم جۆرە میکانیزمەنین، چونکە لە سیسستەمێکی پلۆرالیستی بەرژەوەندی گشتی بەباشترین شێوە تەنها لە ڕێگەی ویست و خواستی زۆرینەیە بەلام بەشێوەیەکی دادپەروەرانە مسۆگەر دەکرێت، بەو پێیە بڕیارەکانی پەیوەندیدار بە بەرژەوەندی گشتی دەبێت لە ڕێگەی دانوستان و

گفتوگۆکردن بێت بۆ هەڵبژاردنی سیاسەتێکی بەکەڵك و عەقلانی لە پێناو مسۆگەرکردنی بەرژەوەندیەکان و لێرەدایە کە بەپێی ئەو میکانیزمە دیموکراسیانەیە کە بەرژەوەندی نەتەوەیی لە سیستەمی دیموکراسی بریتییە لە بەرژەوەندی هەموو هاووڵاتیان بە هەموو پێکهاتەکانیانەوە (قەوام، ٢٠١٢: ص٦٠). یەکسانی بریتییە لەوەی کە هەموو مرۆڤەکان، بەهایەکی یەکسانیان هەیە و پێویستە بەشێوەیەکی یەکسان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێت بۆیە چەمکی یەکسانی بنەمای سەرەکی دیموکراسییە، بەم مانایە کە دیموکراسی لەگەڵ نایەکسانی سیاسی و یاسایی ڕێك ناکەوێت و ناتەبایە، جەوهەری یەکسانی بریتییە لەوەی کە هەموو مرۆڤەکان بەپێی ئەوەی کە مرۆڤن یەکسانن و لە ڕووی سیاسییەوە یەکسانی بریتییە لەوەی کە هاووڵاتیان لەبەردەم یاسادا لە ڕوی ماف و ئازادیەکانەوە یەکسان بن، هەرچەندە یەکسانی لە سیستەمێکی دیموکراسی لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی بریتییە لە دروستکردنی زەمینەیەك کە دەرفەتی یەکسان بۆ هەموو تاك و چین و توێژێك فەراهەم بکرێت و یاساش پارێزگاری لێدەکات (بشيريه، ٢٠٠٩ : ص١٩١-١٩٠).

بیرمەندانی دیموکراسی وەکو، مۆنتسکیۆ، جیڤرسون، جۆن ستیوارت میل و بیرمەندە نوێیەکان وەکو: جۆن راوڵز، جیڤانی سارتۆری، مارتن سیمورلیپپیست و ... هتد، بڕوایان وایە کە لێبوردەیی و یەکسانی دوو بەهای باڵایی دیموکراسین، کە ڕۆڵیان هەیە لەبەرزکردنەوەی ئاستی دیموکراسی، چونکە پێیانوایە ئەم دوو چەمکە بەهایی بنەڕەتین بۆ سیستەمی کراوە، چونکە بەبێ لێبوردەیی هیچ پڕۆسەیەکی ململانێ و کێبڕکێ بە شێوازی ئاشتیانە بەڕێوە ناچێت و بەبێ یەکسانی هیچ بڕیارێك یان یاسایەکی دیموکراسی دەرناچێت، چونکە لە سیستەمی دیموکراسیدا، هەر تاکێك دەنگێکی هەیە کە کاریگەرە لە پڕۆسەی دروستکردنی بڕیار، بۆیە یەکسانی و لێبوردەیی بە جەوهەری دیموکراسی دەزاندرێت (بارانی، ٢٠١٢: ص ١٠٧).

لەسەر سیستەمێكی دیموكراتی پێویستە كە یەكسانی سیاسی بپارێزرێت، لە ڕێگەی كۆمەڵێك ڕێوشوێنی یاسایی و دەستوری، كە لەلایەن ڕای گشتیەوە پاڵپشتی دەكرێت، بۆ گەرەنتی كردنی پاراستنی مافەكانیان و هەروەها ئەركەكانیان، بۆیە دیموكراسییەت باشترین سیستەمە كە تیایدا تاك و گرووپەكان بەیەكسانی مافەكان دەپارێزێت، وەكو مافی دەنگدان و مافی خۆپاڵاوتن بۆ هەر پۆستێكی سیاسی و ئەمەش وادەكات كە یەكسانی هەبێت لەبەردەم یاسا لەنێوان هەموو تاكەكان، بۆیە یاسا ئەم ئازادی و مافانە دەپارێزێت، ئازادی بیروبۆچوون و كاری سیاسی و ڕادەربڕین، پێویستیەكی دیموكراسییە و ناكرێت هیچ سیستەمێكی سیاسی بەربەستی بۆ دروستبكات (**طلال العامري**، ٢٠١١: ص٦٣). بەگشتی یەكسانی بریتییە لەوەی كە ئەم هەستە بۆ هاووڵاتیان درووست بێت كە هەموویان هاوبەشن لە سیستەم و هیچ كەسێكیش پەراوێز ناخرێت و دوور ناخرێتەوە لە بڕیارەكانی دەوڵەت و هەموو لایەنەكان دەرفەتی ڕەخساوی یەكسانیان هەیە بۆ باشتركردن و خۆشگوزاری ژیانیان (**محمد مسعد**، ٢٠٠٩: ص١٤٣).

### ٣-٣-٧- بەشداری سیاسی و ئۆپۆزسیۆن:

پراكتیزەكردنی دیموكراسی لە ڕاستیدا پێویستی بە فەراهەمكردنی بواری بەشداریكردنی سیاسییە بۆ دەركردنی بڕیارەكان كە پەیوەندیدارن بە كاروباری گشتی هاووڵاتیانەوە كە ئەمەش دەستەبەركردنی مافە مەدەنی و سیاسییەكانە لە سیستەمی دیموكراسیدا، هەروەها بۆ پراكتیزەكردنی دیموكراسی دەبێت ئازادی پێكهێنان و كاركردنی پارتی سیاسی و گرووپی گوشار و بەرژەوەندی و دامەراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی و میدیای ئازاد، فەراهەم بكرێت و بە پێی یاسا پارێزراو بێت، چونكە بەشداریكردنی هاووڵاتیان لە ڕێگەی ئەم ناوەندانە

وادەکات دواجار بڕیاری هاوسەنگ لە بەرژەوەندی گشتی دەربچێت و دەبێتە فاکتەرێك بۆ سەقامگیری کۆمەلگە (ئەمین شوانی، ٢٠١١: ل٧٤).

ئۆپۆزسیۆنی سیاسی پەیوەندیەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ دیموکراسی هەیە، چونکە وادادەنرێت بەشێکی بنەڕەتی سیستەمێکی دیموکراسییە و تەنانەت دەگوترێت ئۆپۆزسیۆن بەبێ دیموکراسی بوونی نییە و دیموکراسیش بەبێ بوونی ئۆپۆزسیۆن بونی نییە و سیاسەتیش لە ڕاستیدا بەبێ فرەیی بوونی نییە و ئۆپۆزسیۆنیش لە فرەییدا هەناسە دەدات، چونکە زیندوویی و بەرەو پێشچوونی هەر کۆمەڵگەیەك پەیوەندیدارە بە فرەیی سیاسی و ئۆپۆزسیۆنێکی چالاك، چونکە ئۆپۆزسیۆن ئەلتەرناتیف و تەواوکەری پرۆسەکەیە و هەروەها یەکێکە لە ئامرازەکانی دیموکراسی کە بریتییە لە دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات و ئەمەش ڕوونادات ئەگەر فرەیی سیاسی ئازاد بوونی نەبێت، کە ئەمەش لە ئۆپۆزسیۆندا لە چوارچێوەی کۆمەڵگە و سیستەمێکی دیموکراسی بەرجەستە دەبێت، ئێمە ناتوانین پەیرەوی دیموکراسییەتی ڕاستەقینە بکەین تەنیا بەرێسا و یاسا و میکانیزمی ڕوکەشی، بەڵکوو دیموکراسییەت لە ژێر سایە و کاریگەری ژێرخانێکی مەعریفی کلتووری پیادە دەکرێت کە لەسەر بنەمای یەکسانی و ئازادی کاری سیاسی بۆ هێز و ڕێکخراوە سیاسییە جیاوازەکان دامەزرابێت، لەسەر ئەم بنەمایە سیستەمێکی سیاسی دیموکراسی بریتییە لە سیستەمێك کە ڕێگەدەدات بەبەشداریەکی فراوان و ئامانجدار لەلایەن هاووڵاتیانەوە بەشێوازی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ کە بەشدارن لە هەڵبژاردنی سەرکردە سیاسییەکان و دروستکردنی بڕیار (**المواسي**، ٢٠١٣: ص١).

گرنگترین ڕۆڵەکانی ئۆپۆزیسیۆن لە سیستەمێکی دیموکراسیدا بریتین لە:

١. نوێنەرایەتی کردنی پرۆسەی ڕەخنەی بنیاتنەرانەیە لە بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی سیستەمی سیاسی.

٢. ڕەتکردنەوەی ئەو بڕیارانەی کە نادیموکراسین و ڕێگە خۆشکەرن بۆ قورخ کردنی دەسەڵات یان دروستبوونی شێوازێکی دیکتاتۆری.

٣. ئامادەسازی و هەوڵدان بۆ بوونە زۆرینە، بەواتای گەیشتنە دەسەڵات (کەریم محمود، ٢٠٠٩: ص١٠٢).

هەرچەندە بەهێزبوونی سیستەمێکی دیموکراسی تەنیا پەیوەندی بە هەبوونی ئۆپۆزسیۆنێکی دیموکراسی نییە، بەڵکوو کۆمەڵێك هۆکار هەن کە ڕۆڵیان هەیە لە بەهێزکردنی دیموکراسی، بەڵکوو پێویستە پارێزراوی ڕێسا و یاساکان و دام و دەزگا و بەها دیموکراسییەکان بەتایبەت بەشداری و ڕکابەری درێژخایەن بوونی هەبێت، هەروەها دان پیانان هەیە بۆ هەموو هێز و گرووپە جیاوازەکان و یان ناسنامەکانیان و هەموویان پابەندی ڕێسا و یاسا دیموکراسییەکان دەبن و ڕەچاوی ئاشتی و سەقامگیری کۆمەڵایەتی دەکەن (بشیریە، ٢٠١١: ص١٧١). ناکرێت لە سیستەمێکی دیموکراسیدا تەنها گرووپە دەسەڵاتدارەکان بڕیاردەربن، بەڵکو لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنیش بەشدارن لە چارەسەرکردنی کێشەکان و دەتوانن کاریگەریان لەسەر دروستکردنی بڕیارەکان هەبێت و دەتوانن ئەلتەرناتیف بخەنە ڕوو، ئەمە لە سیستەمێکی دیموکراسیدا دەبینرێت کە دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆن کاریگەریان لەسەر یەکتر هەیە و لەکاتی نەبوونی ئۆپۆزسیۆن بڕیارەکانی دەسەڵات تاك ڕەهەند و ئەگەری هەڵە و کەم و کورتی تێدایە (بشیریە، ٢٠١١: ص٢٣١).

لە سیستەمێکی نادیموکراسی بەرهەڵستکاری و ئۆپۆزسیۆن بوون زۆربەی جار بە شێوازی پارت، ڕێکخراو و گرووپی توندڕەو و دامەزراوەی میلیشیایی و سوپای بەرهەڵستکار و دامودەزگای ئایینی و ... هتد. بەشێوەی نهێنی و نایاسایی سەرهەڵدەدەن. ئەمانە دەبنە هۆی دروستبوونی کۆمەڵگەیەکی پێك هاتوو لە گرووپە توندرەوەکان کە لە هەوڵی سڕینەوە و پەراوێز خستنی یەکترین و دەستدرێژی دەکەنەسەر سنووری ماف و ئازادیەکانی یەکتریان تاك و گرووپەکانی تر، لەکاتێکدا لە سیستەمێکی دیموکراسی کۆمەڵگە لە ڕێگەی کەناڵ و

دامەزراوە یاساییەکانەوە بە شێوازێکی مەدەنی و مۆدێرن، گوزارشت لە ویست و داواکاریەکانی دەکات و بەهۆی فراوانی و جۆراوجۆری و دامەزراوەیی بوونی کەناڵەکان ڕێگە لە درووست بوونی دەسەڵاتێکی تاکڕەو و سەرکوتکەری پاوان خواز دەگرێت و دەبێتە مایەی سەقامگیری و ئاشتی و ئاسایشی سیاسی و کۆمەڵایەتی (بشيريه، ٢٠١١: ص١٢٠-١١٩).

لە سیستەمی دیموکراسی دوو بنەمای سەرەکی بۆ دەسەڵاتداریەتی هەیە، یەکەمیان دەسەڵات دراوەتە زۆرینەی براوە، دووەمیان لەسەر لایەنی براوە پێویست دەکات کە مافەکانی کەمینە بپارێزێت، لەبەر ئەوەی مەترسی و هەڕەشەکانی سیستەمی سیاسی دیموکراسی ئەوەیە کە دەسەڵات پیادە بکرێت بەبێ سنوور و ئەمەش وادەکات بەرژەوەندی کۆمەڵگە بکەوێتەوە مەترسیەوە و دواجار ئەمەش دەبێتە هۆی ناکۆکی کۆمەڵایەتی، هەروەها وادەکات کە سیستەمی سیاسی لە بنەماکانی دیموکراسی بچێتە دەرەوە و زیاتر ئەم لایەنانە پەیرەوی ئەم جۆرە سیاسەتانە دەکەن بە پارتی پاوانخواز ناسراون کە هەموو سەرچاوەکانی دەوڵەت بۆ مەبەست و ئامانج و بەرژەوەندی تایبەت بەکاردەهێنن و دەستێوەردانیش دەکەن لە پرۆسەی هەڵبژاردن (هلال، ٢٠١٣: ص٣).

بۆیە دادپەروەری زۆرینە لە پیادەکردنی دەسەڵات مەرجێکی پێویستە بۆ ئەوەی پارێزگاری لە ڕەوایەتی سیستەمێکی دیموکراسی بکات و ئەمەش کاریگەری لەسەر ڕەوایەتی و سەقامگیری سیستەمی سیاسی هەیە. بۆ ئەوەی سیستەم، سیستەمێکی دیموکراسی بێت پێویستە ئۆپۆزسیۆن لە پرۆسەی سیاسی بوونی هەبێت، ئەویش لە ڕێگەی کێبرکێی نێوان ئۆپۆزسیۆن و دەسەڵات کە هەوڵی گەیشتن بەدەسەڵات دەدەن. لە سیستەمە دیموکراسییەکان ئۆپۆزسیۆن ئاشکرایە و بەئاشکرا چاودێری سیستەم دەکەن و بەشێوەیەکی ئاسایی ئۆپۆزسیۆن گوزارشت لە رای ئەو کەسانە دەکەن کە تێبینیان لە سیاسەتەکانی سیستەم هەیە یان ناڕازین. لە سیستەمی دیموکراسیدا مەرجە کێبرکێی ئاشتیانە بێت، چونکە

ئۆپۆزسیۆن دەتوانێت لە ڕێگەی كەناڵەكانی ئازاد گوزارشت لە ڕای خۆی بكات، وەكو دەزگاكانی ڕاگەیاندن یان لە شێوەی خۆپیشاندان و مانگرتن و لەچوارچێوەی یاسا، ئەم جۆرە ئۆپۆزسیۆنەش وادەكات پەنا نەبرێتە بەر توند و تیژی و ڕوخان و هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت كە ئەمەش هەرەشەیە بۆ سەر ئاشتی و سەقامگیری، بەومانایەی كە ئۆپۆزسیۆن و ئازادی كاری ئۆپۆزسیۆن و ڕێگری كردنی لە گەندەڵی و نادادپەروەری و زیاتر بوونی شەفافیەت وادەكات كە دەوڵەت لە مەترسیە ئاسایشیەكان دووربكەوێتەوە (محمد قادر، ٢٠٠٧: ص٥٢). ئۆپۆزسیۆنی سیاسی ناتوانێت تەنها لە ڕێگای یاسایی و سیاسییەوە ڕەوایەتی بەدەست بێنێت، ئەوا پێویستە لە ڕووی كۆمەڵایەتیشەوە ڕەوایەتی بەدەست بێنێت ئەویش بەشێوەیەكە كە هاووڵاتیان هەست بكەن كە ئۆپۆزسیۆن بەرژەوەندی و ویست و داواكاریەكانیان دابین دەكات و گوزارشت لە ڕاوبۆچوونی بەشێك لە هاووڵاتیان دەكات و پێویستە بەرنامەی ئۆپۆزسیۆن لە گەڵ ڕاستیە ئابووری و كۆمەڵایەتیەكان بگونجێت (سالح، ٢٠٠٩: ص١٢١).

ئۆپۆزسیۆن بەشێكە لە بوونی جیاوازیەكان لە هەر كۆمەڵگەیەك، چونكە هەبوونی جیاوازی بەشێكە لە سروشتی هەر كۆمەڵگەیەك، بۆیە هەركاتێك ئۆپۆزسیۆن لە كۆمەڵگەیەكدا بوونی نەبوو زەمینە بۆ درووستبوونی دەسەڵاتێكی ڕەها و نادیموكراسی دەڕەخسێت و دەسەڵاتێكی ڕەها و تۆتالیتەر لەسەر بنەمای سڕینەوەی جیاوازیەكان بونیاد دەنرێت و هەوڵدەدات لە ڕێگەی توند و تیژی و سەركوتكردن و ستەمكاری، جیاوازی و فرەیی سیاسی و كۆمەڵایەتی بسرێتەوە ئەمەش نا سەقامگیری و نەبوونی ئاسایشی ڕاستەقینەی لێدەكەوێتەوە (سالح، ٢٠٠٩: ص١٨١). لە سیستەمێكی دیموكراسیدا هاووڵاتیان بەگشتی سروشتێكی ئۆپۆزسیۆن و ئاشتیانەیان هەیە لە هەمبەر دەسەڵات، بەڵام لێرەدا ناكرێت بەهاووڵاتیان بگوترێت ئۆپۆزسیۆن، چونكە هاووڵاتیان بەگشتی خاوەنی پرۆژە و ئامانجی سیاسی نین و مەبەستیشیان لەو ڕەخنانە گەیشتن نییە بەدەسەڵات، بەڵكو

چاودێری دەسەڵات دەکەن بۆ باش بەڕێوەبردنی ئەرکەکانی و لەلایەکی ترەوە بەرگری لە ئازادی و مافەکانیان دەکەن (ڕەسول، ٢٠١٠: ل٥٧).

بەگشتی دەتوانین بڵێین کە شێوازەکانی کاری ئۆپۆزسیۆنی سیاسی بریتین لە:

**یەکەم:** ئۆپۆزسیۆنی سیاسی لەدەرەوەی پەرلەمان: بریتییە لە پارتێکی سیاسی یان چەند پارتێکی سیاسی پەرتەوازە کە نەیانتوانیوە ڕێژەی پێویستی دەنگەکان بەدەست بێنن بۆ گەیشتن بە پەرلەمان ئەمانەش خاوەن بەرنامەی خۆیانن کە جیاوازە لە بەرنامەی سیستەم.

**دووەم:** ئۆپۆزسیۆنی سیاسی بەشدار لە پەرلەمان: ئەمەش بریتییە لەو ئۆپۆزسیۆنەی کە چەند کورسیەکی پەرلەمانی بەدەست هێناوە یان نەیانتوانیوە سیستەم پێك بهێنن یان بەشداریان نەکردووە لە سیستەم، ئەم لایەنانە ئەرکی ئۆپۆزسیۆن بوونی خۆیان لە ناو پەرلەمان جێ بەجێ دەکەن و چاودێر دەبن بەسەر دەسەڵاتی جێ بەجێ کردن، ئەم جۆرە ئۆپۆزسیۆنە دەتوانێت ڕۆڵێکی چالاك ببینێت لە چاودێریکردنی سیستەم و جێبەجێ کردنی بڕیارەکانی پەرلەمان.

**سێیەم:** ئۆپۆزسیۆنی ناپارتی: ئەم جۆرە ئۆپۆزسیۆنە لەدەرەوەی ڕێکخستنی پارتی دایە وەك گرووپ و کەسانی سەربەخۆ یان دەستە بژێر و ڕۆشنبیران یان ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کە هەڵوێستی بەرهەڵستکارانەی هەیە بەرامبەر دەسەڵاتی سیاسی، وەك گرووپەکانی گوشار (ڕەسوول، ٢٠١٠: ل٥٩).

سیستەمی سیاسی و بارودۆخی کۆمەڵایەتی و کەلتووری کاریگەریان لەسەر شێوازی درووستبوونی ئۆپۆزسیۆن و چۆنییەتی کارکردنی، لەگەڵ ئەو ژینگەیەی ئۆپۆزسیۆن تیایدا دەژیت هەیە، چونکە هەر سیستەمێکی سیاسی بەشێکە لە سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئۆپۆزسیۆنیش هەڵقولاوی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیە و سیاسییەیە، بۆیە دەتوانین بڵێین کە ئۆپۆزسیۆنیش بەشێکە لە سیستەم و پێکهاتەی سیاسی.

بەگشتی توانای ئۆپۆزسیۆن بۆ مۆبلیزەكردنی هاوولاتیان لە بەرامبەر دەسەلاتی سیاسی گرنگی زۆری هەیە، چونكە كۆی هێزە سیاسییەكان لە چوارچێوەی ئۆپۆزسیۆن دا چالاكی دەكەن دەبنە فاكتەرێكی كاریگەر بۆ گوشار خستنە سەر دەسەلات و بە پێچەوانەوە لێكترازان و پەرتەوازەیی ئۆپۆزسیۆن وادەكات دەسەلات درێژە بەژیانی خۆی بدات بە بێ گوێدانە ویست و ئارەزووەكانی ئۆپۆزسیۆن، ئۆپۆزسیۆن هەمیشە ئاوێتەیە لەگەڵ دیموكراسییەت و ئۆپۆزسیۆنێكی نا دیموكرات ڕەوشێكی خراپ بۆ سیستەمی دیموكراسی دەرەخسێنێت بەڵام ئۆپۆزسیۆنێكی دیموكرات دەبێتە بەشێك لە پێشكەوتنی دیموكراسی و دەستەبەركردنی مافی كەمینە و لایەنە كانی تری دەرەوەی دەسەلات و سیستەمی دیموكراسی هاوسەنگتر دەكات (بشيريه، ٢٠١١: ص١٤٨-١٤٧).

**٣-٣-٨- كلتووری سیاسی دیموكراسی:**

بەگشتی كلتووری سیاسی بریتییە لە كۆمەڵێك تێگەیشتن و بەها كە مانا بە ژیانی سیاسی دەبەخشن. هەندێك لە زانایان پێیان وایە كە دیموكراسییەت بەشێكە لە كەلتووری سیاسی، چونكە كەلتووری سیاسی لە سەدەی بیستەم، بەتایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ دیموكراسیدا، پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆیان پەیدا كردووە، (گابریل ئەلموند و سیدنی ڤیربا) لەكتێبی (كەلتووری مەدەنی) لەساڵی (١٩٦٣)ـدا بەڵگەیان هێناوەتەوە كەبەگشتی دیموكراسییەتێكی سەقامگیر پێویستی بە هاوولاتیانێكە كە خاوەنی كەلتووری هاولاتی بوون و بەشداری كردن بن، چونكە بەشداری سیاسی هاوولاتیان لە پڕۆسەیەكی سیاسی بەبنەمای گوێڕایەلی بۆ سیستەم دادەنرێت. هەندێك لە زانایانی ئەم بوارە پێیان وایە ئەو كەلتوورە سیاسییەی كە لێبوردەیی و پێكەوە ژیانی ئاشتیانە و قبولكردنی بیرو ڕای جیاواز و متمانە بە ئەوانی تری تێدایە، بوار و هەل و مەرجی گونجاو بۆ سەرهەڵدانی دیموكراسییەت دەڕەخسێنێت، هەروەها لە سیستەمێكی دیموكراسی

دا کەناڵەکانی پەیوەندی ناو کۆمەڵگە متمانە هەیە لەنێوانیاندا و پەیوەندییەکی مرۆڤانە درووست دەکەن (بشيريه، ٢٠٠٩: ص٢٤٩-٢٤٨).

هەروەها کلتووری سیاسی دیموکراسی بریتییە لە چۆنییەتی تێروانین سەبارەت بە سیاسەت و سیستەم کە پێویستە تاك تیایدا سەربەخۆبێت و رادەیەکی زۆر زانیاری سیاسی هەبێت، بەمەبەستی هاوکاری و بەشداری لە بواری گشتی بۆ ئاڵوگۆری بیرورِا، کەواتە کەلتوورێکی سیاسی بەم شێوەیە کەلتوورێکی مەدەنییە کە قبوڵی بیرورِای جیاواز دەکات و لێبوردەیە و باوەرِی بە رِای بەرامبەر هەیە (بشيريه، ٢٠٠٥: ص٨٩). گرفتی گەورەی ئەو دەوڵەتانەی کە ناتوانن دیموکراسی بن، دەگەرِێتەوە بۆ نەبوونی کەلتووری دیموکراسی، چونکە دیموکراسی تەنیا بریتی نییە لە سیستەمی سیاسی، بەڵکو بریتییە لە هزر و بەها و پێوەر و پێویستی بە کەلتووری قبووڵکردن و داننان بە جیاوازیەکانە و بەم پێیەش داننانە بە پارتەکانی ئۆپۆزسیۆن، هەروەها کەلتوورێکی سیاسی کە قبوڵی ئەنجامەکانی هەڵبژاردن و دەستاودەستکردنی ئاشتیانەی دەسەڵات دەکات (سالح، ٢٠٠٩: ص١٤٨).

(فرانسیس فۆکۆیاما) برِوای وایە کە یەکێك لە سیماکانی کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی رِەخنەگرتنە لە خود بەشێوەیەکی بەردەوام، ئەمەش وادەکات کە توانای خۆگونجاندن و مانەوەی سیستەم بەرزبێتەوە و بەردەوام بێت و ئەم کۆمەڵگایانەش کۆمەڵگەی ساناگیر و کراوەن و کەلتووری لێبوردەیی و یەکتر قەبوڵ کردن لە ئاستێکی بەرزدایە (عەلی، ٢٠٠١: ص١٣). بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری هۆکاری گرنگن بۆ سەرهەڵدانی یان پەرەپێدانی دیموکراسی، یەکێك لەو کەسانەی کە باسی لە سەرهەڵدانی دیموکراسی کردووە، کۆمەڵناسی ئەمریکی (پارسۆنز)ـە کە باسی لە پەیوەندی دوولایەنەی سیستەمی سیاسی و تەواوی سیستەمەکانی تری کۆمەڵگە کردووە، کەواتە سەرهەڵدانی دیموکراسی پێویستی بە پەیوەندی و کارلێکی نێوان تەواوی بوارەکان هەیە، بۆنمونە گەشەی ئابوری و دیموکراسی پەیوەندییەکی توند و تۆڵیان پێکەوە هەیە

چونکە هەندێك کات گۆڕانکاری لەبواری ئابوری وادەکات کە بوار بۆ گەشە و فێرکردنی تاکەکان و هەروەها کەلتووری کۆمەڵگە بەگشتی بڕەخسێت و ئەمەش وادەکات ببێتە مایەی سەقامگیری و دیموکراسی (بشیریە، ٢٠٠٩: ص ٢٣٨).

کەلتووری سیاسی دیموکراتیك بریتییە لە، کەش و هەوایەکی کراوە لە کۆمەڵگە بەمەبەستی دەرفەتی یەکسان لە نێوان هاوولاتیان بەبێ جیاوازی ڕەگەزی، نەتەوەیی، نەژادی، بیروباوەڕی ئایینی، ئایدۆلۆژی، چینایەتی و ... هتد. هەروەها لە سیستەمێکی دیموکراسی دا، کاتێك کەلتووری دیموکراسی بوونی هەیە ئەوا پێکەوە ژیانی ئاشتیانە بوونی هەیە، بەدوور لە کێشە و قەیران و پێکدادان و ئەوەی سیستەمی سیاسی لە سیستەمەکانی تر جیادەکاتەوە چۆنییەتی چارەسەرکردنی کێشەکانە، چونکە لە کەلتووری سیاسی دیموکراسیدا کێشە و ململانێ بەشتێکی سرووشتی دەزانرێت و بەپێویستیش دەزانرێت بۆ پێشکەوتنی کۆمەڵگە، بەڵام لەم کەلتوورەدا ئەمە ناکرێتە بنەمای پێکدادان و توند و تیژی و سڕینەوەی لایەنەکانی تر بەڵکو بەشێوازی یان میکانیزمی یاسایی دیموکراسیانە چارەسەر دەکرێت (مەعروفی، ٢٠١١: ص٣٥).

بەگشتی سیستەمی دیموکراسی لە سرووشتی خۆیدا پێویستی بە ژینگەیەکی لەباری کۆمەڵایەتی و کەلتووری هەیە، ئەم ژینگەیە وەك کۆڵەگەی پرۆسەی دیموکراسی هەژمار دەکرێت کە کۆمەڵێك ڕەگەز و ڕەهەند و بنەما لەخۆدەگرێت کە دەتوانین لێرەدا ئاماژە بە گرنگترینیان بدەین:

١. قبولکردن و ڕێزگرتن لە بیروڕای بەرامبەر: دیموکراسی بریتییە لە بازاڕی بیروبۆچوونەکان، بۆیە لەم سیستەمەدا قبوڵی ڕا و بۆچوون و ڕای بەرامبەر دەکرێت تەنانەت ئەگەر بە ژمارە کەم بن، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کێشەکان بە شێوەیەکی ئاشتیانە چارەسەر بکرێن دوور لە بەکارهێنانی هێز و توند و تیژی و هەڕەشە و لەلایەکی ترەوە لە ئەگەری ڕێزنەگرتن لە بیروڕای جیاواز ئەوا هەندێك جار ڕاستیەکان دەشاردرێنەوە و هەموو کێشەکان چارەسەریان

ئەستەم دەبێت، لەم دۆخەدا بۆئەوەی کەس هەست بەوەنەکات کە لایەن یان گرووپ و یان چین یان تاکێك لەوانی تر بالادەست ترە ئەوا دەبێت ڕێز لەهەموو ئەو جیاوازیانە بگیرێت کە ئەمەش هاوسەنگی و دادپەروەری بەرهەم دێنێت (محمد رزگار، ٢٠٠٧: ص٣٠٤).

٢. قبولکردنی دۆڕاندن و لێبوردەیی سیاسی: گیانی لێبوردەیی سیاسی لەنێوان قەوارە سیاسییەکان و هاوولاتیان کاریگەری زۆری لەسەر پرۆسەی دیموکراسی هەیە، چونکە ئەگەر لێبوردەیی سیاسی نەبوو، ئەوا دیموکراسییەت هەردەم لەبەردەم هەڕەشەیە چونکە ئەوەی هێزی هەیە دەبێتە هەڕەشە و مەترسی لەسەر کەمینەکان لە هەر جۆر و شێوازێك، بۆیە لەم کاتەدا کەمینە پەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی توند و تیژی و لەلایەکی ترەوە لێبوردەیی وادەکات لایەنە سیاسییەکان لە کاتی کێبڕکێی هەڵبژاردنەکان قبوولێ یەکتر بکەن و لەکاتی دۆڕاندن لە هەڵبژارنەکان، ئەم لێبوردەییە وادەکات کە دەستاودەستکردنی دەسەلات بەشێوەی ئاشتیانە قبوولبکرێت. لەوجۆرە کەلتوورانە کە لێبوردەیی سیاسی تێدایە دۆڕان بەئاسانی قەبوول دەکرێت و بەپێچەوانەوە دەبێتە هۆی سەرهەلدانی قەیران و توند و تیژی و پاشەکشەی پرۆسەی دیموکراسی و قورخکردنی دەسەلات و یان پەراوێزخستنی لەلایەن چەند لایەن و گرووپێك (محمد قادر، ٢٠٠٧: ص٣٠٩).

٣. بوونی مەعریفە و هەستکردن بە ئازادی: دیموکراسییەت بەر لە هەموو شتێك پێویستی بە لێکگەیشتن هەیە، بۆ ئەوەی بزانرێت مانای دیموکراسییەت چیە؟ و بۆ پێویستە؟ هەندێك جار ڕژێمە نادیموکراسییەکان ڕێگە دەگرن لە تێگەیشتنی هاوولاتیان و بەرزبوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیری وشیاریان و هەندێك جار لە سیستەمە نادیموکراسییەکان هاوولاتیان هەندێك ئازادی ڕوکەشیان پێدەدرێت بەلام نەك هەموو ئازادیە بنەڕەتیەکان کەبتوانن مەعریفەی خۆیان لەسەری بنیات بنێن، بۆیە لە سیستەمێکی دیموکراسی مەعریفەی مۆدێرن و

تێگەیشتن لە ماف و ئازادیەكان و دواتر بنەماكانی دیموكراسی وەكو مەرجێك وایە بۆ دەستەبەركردنی دیموكراسی، هەروەها دوای تێگەیشتنی هاوولاتیان، هاولاتی هەست بە ئازادی و سەربەخۆیی دەكات و ئەوكاتە خاوەنی هەلوێست و بڕیاری خۆیان دەبن لەبەرامبەر دەسەلات بەم مانایەكە بەبێ بوونی كۆمەلگە و كەلتووری سیاسی دیموكراسی كەتیایدا هاوولاتیان خاوەن مەعریفە و تێگەیشتن بن و هەست بە ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان بكەن، ئەوا سیستەمێكی سیاسی و دیموكراسی و كراوە، بوونی نابێت (محمد قادر، ٢٠٠٧: ص٣١٠).

بەگشتی سیستەمە نادیموكراسییەكان لەسەر دووركەوتنەوە لە جەماوەر ڕاهاتوون و پەیوەندییان بە جەماوەر و هاوولاتیان زۆر لاوازە، ڕەفتاری ئەم جۆرە سیستەمانە بەكارهێنانی میكانیزمەكانی تۆقاندن و توند و تیژیە كە هەندێك جار لە ڕێگەی پیلانگێریەوە جێ بەجێ دەكەن و وادەكەن كە كەلتوورێكی وا بلاو بكەنەوە كە جیاوازیەكان نەهێلن و ڕوالەتی ئەم كەلتوورەش هەولدانە بۆ بالادەستبوون بەسەر هەموو جومگەكانی كۆمەلگە بەم مانایە كەدژی هەر جۆرە كەلتووریكی فرەیین و هەولدەدەن لەم نێوەندەدا دامەزراوەكانی ئاسایش لەخزمەت ئەم ئامانجەیان بێت (بەلقیز، ٢٠٠٤: ص١٠٤).

### ٣-٣-٩- شەفافییەت:

شەفافییەت بەمانای ئەوەیەكە، ئەو زانیاریانەی كە پەیوەندییان بە بڕیارە گشتییەكانەوە هەیە بەشێوەی ئاسان و خۆڕایی وەدەست بێت و ئەو زانیاریانە ڕاستەقینە بن، شەفافیەت ئاماژەیەكە بە چۆنییەتی هەلسوكەوت و ڕەفتاری سیستەم بە ڕێگەی ئاشكرابكرێت، واتە شەفافیەت بە بنەمای سیستەمێكی دیموكراسی میانڕەو دادەنرێت، هەروەها شەفافیەت وەرگرتنی بڕیارە گشتییەكان لە ژێر سایەی پرەنسیپی سەروەری و دەسەلاتی یاسا لە خۆدەگرێت و ئەمە سیستەم لە هەلە كردن دەپارێزێت بە هۆی هەلسەنگاندنی لەلایەن هاوولاتیانەوە

لە بەکار هێنانی سەرچاوەکانی گشتی، هەرچەندە پرۆگرامەکانی بودجەی گشتی زیاتر شەفاف بێت بەوڕاددەیە گەندەڵی دارایی کەمتر دەبێت (محمد مسعد، ٢٠٠٩: ص١٤٦).

بەگشتی شەفافیەت بریتیە لەوەی کە هەموو کاروبار و بڕیار و ڕەفتارەکانی دەسەڵاتی سیاسی بەواتا فراوانەکەی ئاشکرابێت، هاووڵاتیان زانیاریان لەسەر هەبێت، لەبوارەکانی جۆراوجۆردا، پێویستە سیستەم سیستەمێکی کراوە و شەفاف بێت، بەتایبەت لە بواری ڕاگەیاندن و میکانیزمەکانی دەست پێراگەیشتنی هاووڵاتیان بۆ زانیاریەکان دەبێت دەستەبەربکات، ئەمەش سیمایەکی سەرەکی سیستەمە دیموکراسییەکانە، بە پێچەوانەی سیستەمە نادیموکراسییەکان لە سیستەمی دیموکراسی دا هاووڵاتیان تەنها ئاگادارنین لە بڕیارەکان بەڵکو خۆیان بەشدارن لە درووستکردنی، ئەمەش وادەکات توانا و سەرچاوەکانی دەوڵەت بخرێتە خزمەت پەرەپێدانی دەوڵەت لە هەموو بوارەکان و هەروەها وادەکات کە لە ئەگەری لادانی بەرپرسان توشی لێپێچینەوەی یاسایی بن و دواتریش لە هەڵبژاردنەکان دا هاووڵاتیان ڕەوایەتیان پێنادات و لەلایەکی ترەوە شەفافیەت پەیوەندی نێوان دەسەڵاتداران و هاووڵاتیان توند و تۆڵ دەکات و بەپێچەوانەوە گومانی هاووڵاتیان لە دەسەڵات و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات دەبێتە هۆی لاوازی ڕەوایەتی دەسەڵاتداران و لەناوچوونی متمانەی سیاسی و کاریگەری نەرێنی لەسەر کۆی پرۆسەی سیاسی دەبێت. دەسەڵاتی دیموکراتیك پشت بە هاووڵاتیان دەبەستێت نەك هێزی سەربازی و ئاسایشی تۆقێنەر، کە ئەمە ئاسایشی دەوڵەت دابین دەکات (محمد قادر، ٢٠٠٧، ص١٤٠).

لە سیستەمێکی دیموکراسی دا شەفافیەت پەیوەندی بە ئازادی بەدەست هێنانی زانیاری هەیە کە لە ژێر کۆنترۆڵی دەسەڵات دایە، بەم شێوەیە شەفافیەت دەبێتە هۆی چەسپاندنی بنەماکانی ئازادی ڕاگەیاندن و ڕادەربڕین و دەسەڵاتی گشتی پێویستە پابەند بێت بە بڵاوکردنەوەی ئەو زانیاریانەی کە پەیوەندارە بە

ژیانی هاوولاتیانەوە. دامەزراوە دەستوریەکان دەبێت پابەندبن بەو ڕێکارانەی کە داواکاری و پێداویستی هاوولاتیان دابین بکەن بەم مانایەی کە دەبێت وەلامدەربن لە ئاست ویست و بەرژەوەندی و داواکاری هاوولاتیان. سیستەم گەندەڵ دەبێت کاتێك کە کەناڵەکانی پەیوەندی و دڵنیایی لە نێوان دامەزراوەکانی سیستەم و هاوولاتیان شەفاف نەبن یان دامەزراوەکانی سیستەم ئەرکە سەرەکییەکانیان جێبەجێ نەکەن. لە سیماکانی گەندەڵی لە دەوڵەتانی دواکەوتوو ئەوەیەکە ئەرکەکانی دامەزراوەکانی سوپا و پۆلیس بۆ پاراستنی ئاسایشی هاوولاتی و نیشتیمان گۆڕاوە بۆ پاراستنی سیستەمە سیاسییەکە (محمد مسعد، ٢٠٠٩: ص١٤٩).

## ٣-٤- کارەکتەرە سەرەکییەکانی دیموکراسی:

بەشێوەیەکی گشتی دیموکراسی پێویستی بە کۆمەڵێك کاراکتەر هەیە کە کاریگەری لەسەر پرۆسەی دیموکراسی و یان ئاستی دیموکراسی دەوڵەتێك دادەنێن، کە لە لاوازی یان نەبوونی ئەم کاراکتەرانە ناتوانین باس لە دیموکراسی بوونی دەوڵەتێك بکەین، بۆ ئەم مەبەستە لێرەدا باس لە بنەڕەتیترین و گرنگترین کاراکتەرەکانی دیموکراسی دەکەین.

### ٣-٤-١- ئازادی ڕاگەیاندن:

ڕاگەیاندن لە ڕۆڵیدا و ئەو پەیام و بەرپرسیاریەتیەی کە هەیەتی بریتییە لە پاراستنی ئاسایشی ئازادی بەتایبەت ئازادی ڕاگەیاندن و هەروەها ئەمانەش ئەو پەیامەیە کە هەڵدەگرێت، پەیام لە سرووشتی خۆی دا وەکوخۆی ناگاتە تاکەکان ئەگەر ئازادی بوونی نەبێت، ئازادی ڕاگەیاندن لە چوارچێوەی چەمکی ئازادیە گشتییەکان دێت، وەکو ئازادی هاوولاتیان و هەروەها پەیوەندی بە ژینگەیەك هەیە کە ئازادی ڕادەربڕین دەستەبەرکراوە، ئەمەش دەبێتە بنەمایەکی سەرەکی

بۆ پیادەکردنی دیموکراسی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی (**طلال المامری**، ٢٠١١: ص٢٤).

ئەمرۆ میدیاکان لەگەڵ دیموکراسی لە پەیوەندییدان، پەرەسەندنی دیموکراسی لەئاستی جیهاندا بەبێ پەرەسەندنی و زۆری میدیاکان ئەستەم بوو پەرەسەندن و زیاد بوونی میدیاکان و سەرهەڵدانی پەیوەندییە جیهانییەکان بوار بە پەرەسەندنی دیموکراسی خۆش دەکات، ئەگەر ڕاگەیاندن نەبوایە، شۆڕشی نەرمی چیك و سلۆفاکیاش نەدەبوو، هەروەها کۆتایی هاتنی ئاشتیانەی ناکۆکی ڕەش پێستەکان و سپی پێستەکانی ئەفریقای باشووریش ئەستەم دەبوو (گیدنیز، ٢٠٠٩: ١٩٢-١٩٣). هەروەها ئۆپۆزسیۆن مافی ڕادەربڕینی هەیە و مافی بڵاوکردنەوەی بیروبۆچوون و بەرنامەکانی خۆی هەیە لە ڕێگەی ئامرازەکانی پەیوەندی لە کۆمەڵگە، وەکو ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ... هتد. بۆ هەموو پارت و لایەنێك چ لە سیستەم بێت یان ئۆپۆزسیۆن بێت، بەتایبەت لەکاتی هەڵبژاردنە گشتی و ناوەخۆییەکان (**طلال العامری**، ٢٠١١: ص٤٩).

میدیاکان کەشی دیالۆگی سیاسی و چالاکی زیاتر بۆ بەشداری زیاتری هاووڵاتیان ئاوەڵا و لەبار دەکەن، ئازادی لە جەوهەردا وەکو دراوێك وایە کە دوو ڕووی هەبێت، یەکەمیان ڕای گشتیە و دووهەمیان ڕاگەیاندنە، بەو مانایەی کە گفتوگۆی ئازاد و کراوە، مەرجی بنەڕەتیە بۆ گەیشتن و دەستەبەرکردنی ئازادی ڕاگەیاندن، بەڵام تەفسیری ئازادی ڕاگەیاندن جیاوازی زۆری هەیە لە سیستەمێك بۆ سیستەمێکی تر، ئەگەر لە سیستەمێکی سیاسیدا وای دانا کە ئازادی ڕاگەیاندن بەردی بناغەی دیموکراسییە کە بەیاسا دەیپارێزێت و بەرگری لێدەکات، بەڵام ئەگەر سیستەمێکی تر بەربەست و سانسۆری لەسەر ڕاگەیاندن دانا، ئەوە ئەم ئازادییە مەترسی و هەڕەشەیە بۆ سەر ئاسایشی دەوڵەت، چونکە ئازادی ڕاگەیاندن مافی ئەوەی هەیە کە زانیارییەکان بگوازێتەوە و بڵاوی بکاتەوە بەبێ هیچ بەربەستێك و سانسۆرێك کە لە پێشتر بڕیاری لەسەر دراوە، جگە لەو

کاتانەی کە زیان بەئاسایشی نەتەوەیی و سەربازی و سیستەم و ئازادی گشتی بگەیەنێت (**طلال العامري**، ٢٠١١: ص٢٣).

بەرزبوونەوەی بایەخ و نفوزی میدیاکانیش یەکێکی ترە لەهۆکارەکانی قەیرانی دیموکراسی، بەتایبەتی ڕاگەیاندنە ئەلیکترۆنییەکان و کاریگەری تەلەفزیۆن لەسەر سیاسەت، ئەم پرسە نکۆڵی هەڵنەگرە کە میدیاکان و بەتایبەتیش میدیا ئەلیکترۆنییەکان تەنیا سەبارەت بە سیاسەت هەواڵ ناگەیەنن بەڵکوو هەتا ئاستێکی بەرز ئەوە دیاری دەکەن کە سیاسەت دەبێ سەبارەت بەچی بێت. یەکەم ئەرکی سیاسەتمەدارێك وەڵامدانەوەیە بەدواین پرسیارەکانی میدیاکان سیاسەتمەدارەکان بەر لەوەڵامدانەوە بە پەرلەمان وەڵامی بەرنامەی تەلەفزیۆنی و ڕادیۆییەکان و ڕۆژنامەکان و ... هتد، دەدەنەوە و هەموو ڕۆژیش دەبێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەنەوە لەبەر ئەوەی میدیاکان ئەو لێپرسینەوانە لە پانتایی سیاسیدا بەشێوەی ڕۆژانە دەخەنە روو (گیدنیز، ٢٠٠٩: ل١٩٢).

مادەی (٦) لە بنەماکانی ڕێککەوتنامەی جۆهانسبێرگ، تایبەت بە ڕاگەیاندن بەربەستەکانی ئازادی دیاریدەکات کە پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەیی هەیە لە دەوڵەتان و دەڵێت کە ناکرێت ڕێگە لە ئازادی ڕادەربڕین بگیرێت بەبیانووی ئاسایشی نەتەوەیی، تەنها ئەگەر سیستەم توانی بیسەلمێنێت کە ئەم ئازادیە ئامانجی هاندانی توند و تیژیە لە کۆمەڵگەدا، چونکە پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆهەیە لەنێوان ئازادی ڕادەربڕین و ئەگەری ڕوودان یان هەندانی توندوتیژی، لەماددەی (٧)ـدا کە ئەو ڕەخنانەی کە لە دەسەڵاتی سیاسییەوە دەگیرێت کە هەڵدەستێت بە ئاشکراکردنی ئەو زانیاریانەی کە تایبەتن بە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ لەلایەن دەسەڵاتەوە، ئەمە هەڕەشەو مەترسی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی دانانرێت و ناکرێت بەربەست بۆ ئەم جۆرە ئازادی ڕادەربڕین و دەست پێ ڕاگەیشتن بەزانیاری دابنرێت بە پاساوی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی. ماددەی (١٥) لە ڕێککەوتنامەی جۆهانسبێرگ، هەندێك ڕێسا و میکانیزمی

دیاریکردووە کە لە ڕێگەیانەوە دەتوانرێت زانیاری بشاردرێتەوە یان بڵاو بکرێتەوە، بەڵام بەومەرجەی کەزیان بە ئاسایشی نەتەوەیی نەگەیەنێت و ئەگەر بەرژەوەندی گشتی لە سەرووی ئاسایشی نەتەوەیی بوو، ئەوە دەسەڵات ناتوانێت ڕێگە بگرێت لە بڵاوکردنەوەی زانیاری لە ڕێککەوتنامەی جۆهانسبێرگ لە ئۆکتۆبەری (١٩٩٥)ـدا، دەوڵەتان هەندێك بنەمایان دارشت تایبەت بە پەیوەندی نێوان ئاسایشی نەتەوەیی و ئازادی رادەربڕینی هەیە، کەئەمەش ئازادی گەڕان بۆ زانیاری و بیروبۆچوون بە هەموو جۆرەکانییەوە بەبێ ئەوەی کە سنووردار بکرێت دەگرێتەوە، ئەم بنەمایانە هەندێك بەربەست و سنووریان دانا لەسەر ئەم ئازادیانە وەکو پێویستیەك بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئەم سنوورانە بەپێی یاسا ڕێکخراون، بەڵام دەبێت زۆر ڕوون و ئاشکرا و دووربن لەم سنووردارکردنە و دەبێت بگونجێن لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی (**طلال العامري**، ٢٠١١: ص٦٩).

**٣-٤-٢- ڕای گشتی:**

ڕای گشتی لە دوو وشە (ڕا) و (گشتی) پێکهاتووە، وشەی (ڕا) بریتییە لە هەڵوێستێك یان ئاراستەیەك یان تێڕوانینێك یان بیروباوەڕێك، کە بەرهەمی عەقلی مرۆڤە، بەئاشکرابێت یان بەنهێنی بە وشەبێت یان بە وێنە یان جولە و بینین کە مرۆڤ گوزارشتی لێ دەکات، ئەگەر ئەم ڕایە تایبەت بوو بە بوارێکی تایبەتی تاك ئەوا پێی دەگوترێت ڕای تایبەت، بەڵام ئەگەر پەیوەندی بە بەرژەوەندی و چارەنوسی گشتیەوە هەبوو، پێی دەگوترێت ڕای گشتی (**کەریم محمود**، ٢٠٠٩: ص١٩٧). ڕای گشتی بریتییە لە تێڕوانینی بۆ بەهاکان و باوەڕەکانی گشتی کۆمەڵگا لە سیستەمی دیموکراسیدا، ڕای گشتی بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر بڕیاری سیاسی هەیە، لە هەندێك دەوڵەتاندا گرنگی زۆر بە ڕای گشتی دەدرێت، وەکو ڕیفراندۆم (ڕاپرسی) سەبارەت بە کێشە جۆراوجۆرەکان بۆ ڕوونکردنەوە و دەرخستنی ڕای گشتی هەر لەپرسی

لەباربردنی منداڵان بگرە تاكو راپرسی لەسەر دەستوور و پرسە گشتی و نیشتیمانییەكان (بشيريه، ٢٠٠٩: ص٣٧).

جۆن ستیوارت میل پێیوایە رای گشتی بریتییە لەهەموو ئەو شتانەی كە كۆمەڵگە دەیهەوێت یان نایهەوێت (كەریم مەحمود، ٢٠٠٩: ص١٩٧). رۆسۆ، هزرێكی دیكەی هێنایە بەرباس و لە تیۆرە بەناوبانگەكەی خۆی واتە گرێبەستی كۆمەڵایەتی، كە بووە درووشمی دەوڵەتانی دیموكراسی، بڕوای وایە كە تەنها ویستی گشتی دەتوانێت رێنوێنی دەوڵەت بكات. پەرەسەندنی ئامرازەكانی راگەیاندنی گشتی وەك رۆژنامە رادیۆ، تەلەفزیۆن، بوونە هۆی سەرهەڵدانی كۆمەڵگایەكی نوێ، هەموو كەسێ تێدا دەتوانێت بێ لە بەرچاوگرتنی شوێنی ژیان و ناوەندی كۆمەڵایەتی سوود لە سەرچاوەكانی هەواڵ وەربگرێت و لە رِوداو و دەنگ و باسەكان ئاگاداربێت بەو رادەیەی ئەگەر لەو كۆمەڵگایەش ئاستی بەشداری كۆمەڵایەتی سنوورداربێت ئاستی ئاشنابوونیان بە رِوداو و دەنگ و باسەكان و لەئەنجامدا بەشداریكردنیان لەم بوارانەدا گەلێك زیاترن لە رابردوو لە راستیدا ئەمرۆ لە كۆمەڵگا پیشەسازیەكان تاكی ئاسایی خاوەن دەسەڵات و داهێنان و دەنگ و بۆچونی خۆیەتی لەم سەردەمەدا دەسەڵات بەرەبەرە خۆی لە هاووڵاتیان نزیك دەكاتەوە و مانەوەی سیستەم بەستراوەتەوە بەرای گشتی و دادوەری كردنی جەماوەر. هەرچەندە ئەمرۆ هیچ دەستور و جارنامە و بریارێكی دەسەڵاتی بەراشكاوی ئاماژەی بە پێگە و رۆڵی رای گشتی لەناو كۆمەڵگا مرۆییەكاندا نەكردووە و دانی پێدا نەناوە و بەڵام بەو حاڵەش بەگوێرەی پەرەسەندنی تیۆری كۆمەڵگە سالاری (دیموكراسی) و پێشكەوتنی راگەیاندنە گشتییەكان، گەورەیی و شكۆمەندی و گرنگی ئەم دەسەڵاتە سیاسییە سەر سورِهێنەرە رۆژ بەرِۆژ زیاتر دەبێت. بێگومان دەتوانین دان بەو راستیە دا بنێین كە هیچ سیستەمێكی سیاسی یان پارتێك یان گرووپێكی كاریگەر یان سەندیكایەكی كرێكاری و تەنانەت كەمینەیەكی نەتەوەیی ناتوانن بێ سەرنجدان بەم لایەنە

گرنگە بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندیە گشتی و ئامانجە نەتەوەییەکان توانایی، بەردەوامی، کارایی و سەرکەوتنی پێویست بەدەست بهێنێت. (کاسیۆ رۆسکی، ٢٠٠٧: ل٩٩-١٠٠).

لە سیستەمی دیموکراسیدا، پێویستە کەناڵی فەرمی جۆراوجۆر هەبن بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لەلایەن هاووڵاتیانەوە، بۆ بەرزبوونەوەی شەفافیەت و دواتر لێپێچینەوە یان لێپرسینەوە لە سیستەم و چاودێری یان بەواتایەکی تر درووست بوونی ڕای گشتیەکی بەهێز بەمەبەستی گوشار خستنەسەر دەسەڵات و بەباشی جێبەجێکردنی ئەرکەکان، لێرەوە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن یەکێکە لە ئامرازە سەرەکییەکانی ڕەنگدانەوەی ڕای گشتی، هەروەها یەکێکی تر لە کەناڵەکانی ڕەنگدانەوەی ڕای گشتی گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندین چونکە لە سیستەمە دیموکراسییەکان گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی بیروڕا و بەرژەوەندی بەشێك لە کۆمەڵگە دەخەنە ڕوو، بۆیە تا ئەم جۆرە گرووپ و ڕێکخراوانە زیاتربن ئاستی کاریگەری ڕای گشتی بەرز دەبێتەوە، بۆیە تەنیا یەك کەناڵ بەس نییە بۆ دەربڕینی ڕای گشتی و پێویستە کەناڵەکانی جۆراوجۆربن و لە گۆشەنیگای جیاواز بەشداربن لە ڕای گشتی (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٣٠٨).

سیستەمە دیموکراسییەکان بۆ ڕەوایەتی سیاسەتی دەرەوەیان پێویستیان بە پاڵپشتی هاووڵاتیان واتا ڕای گشتی هەیە هەرچەندە سیاسەتی دەرەوە ئەرکی سیستەمە و هاووڵاتیان پەیوەندییان بە سیاسەتی دەرەوە نییە، بەڵام پشتیوانی کردن هاووڵاتیان بۆ سیاسەتەکانی دەوڵەت لە ئاستی دەرەوە دەبێتە هۆی بەهێزبوونی هەڵوێستی دەوڵەت و ئەمەش دەبێتە هۆی هێنانە دی بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان لە ئاستی دەرەوە و لە ئەنجام دا بەهێزبوونی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت (قەوام، ٢٠١٢: ٣٤١). هەڵبژاردن لە سیستەمە دیموکراسییەکانی ئەم سەردەمەدا گرنگترین ئامرازی ڕەنگدانەوەی بیروڕای گشتی و داخوازیەکانی و ئەولەویەتەکانی هاووڵاتیانە، ڕای گشتی بریتییە لە تێڕوانینەکان بەهاکان و

باوەڕەكانی گشتی كۆمەڵگا، لەدیموكراسیدا وادادەنرێت كە بیروڕای گشتی بەشێوەی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر بڕیاری سیاسی دەبێ، لە زۆر دەوڵەتاندا لە شێوازگەلی پەی بردن بەڕای گشتی پەنادەبەنە بەڕێوەبردنی ڕیفراندۆم و ڕووكردنە دەنگی گشتی سەبارەت بە كێشە جۆراوجۆرەكان، لە منداڵ لەباربردنەوە بگرە تا بەكارهێنانی خواردنەوە ئەلكهولیەكان كەڵك وەردەگرن، بۆ نموونە لەدەوڵەتانی ئەوروپا هاووڵاتیان بۆ پەیوەندی دەوڵەتەكەیان بە یەكێتی ئەورووپا بیرو ڕای خۆیان دەربڕیووە (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٣٠٧).

لە جیهانی ئەمڕۆ بەتایبەت پاش شۆڕشی زانیاری، ناسینی ڕای گشتی بە پێویستیەكی سەرەكی دەوڵەتە جەماوەریەكان دادەنرێت و دەتوانین بڵێین ڕای گشتی مەزنترین دەسەڵاتی كۆمەڵایەتی و ڕەنگدانەوەی خواستەكانی جەماوەرە، ڕای گشتی بریتییە لە ڕەنگدانەوەی ئامانج و ئارەزوو، بۆچوون، پێداویستی و تێڕوانین و دیدگای بەشێكی بەرچاوی هاووڵاتیان، دەربارەی كێشە گرنگەكانی هەر كۆمەڵگەیەك ڕای گشتی بە دادوەری كۆمەڵایەتی هەر كۆمەڵگەیەكی وشیار دادەنرێت (كاسیۆ رۆسكی، ٢٠٠٧: ل٩٩).

بەگشتی ڕای گشتی دابەش دەبێتە سەر دوو بواری سەرەكی:

١. سیاسی:

ڕای گشتی لەبواری سیاسی چەند ئەركێكی لە ئەستۆدایە، كە كاریگەریان لەسەر سروشتی كاری سیاسی هەیە، بەتایبەت لەو دەوڵەتانەی كە سیستەمەكەیان سیستەمێكی دیموكراسییە و گەل سەرچاوەی دەسەڵاتە بۆیە دەبێت بڕیارە گرنگەكان لەلایەن ڕای گشتیەوە، پشتیوانی بكرێت، یان بەمانایەكی تر پێویستە بڕیارەكانی سیستەم ڕەنگدانەوەی ویست و داواكاری ڕای گشتی بێت، هەروەها لە سیستەمە دیموكراسییەكان چونكە دیاریكردنی سەركردە سیاسییەكان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە بەڕێوەدەچێت بۆیە ڕای گشتی ڕۆڵێكی كاریگەری هەیە لەسەر هەڵبژاردنی ئەو سەركردانە، لەلایەكی ترەوە ڕای گشتی

دەتوانێت ڕۆڵی هەبێت لە دیاریکردنی ئەرکەکانی سیستەم بەتایبەت لەو بەڵێنانەی کە سیستەم و لایەنەکانی بەشداربوو بە هاووڵاتیان دەدەن، دەتوانن چاودێرین بەسەر پرۆسەی سیاسی و بەدواداچوونی سیاسی بکەن بۆ لێپرسینەوە لە دەسەڵات بەو پێیەی لێپرسینەوە بەشێکە لە پرۆسەی سیاسی وەك ئەوەی کە لەناو پەرلەمان لەگەڵ بەرپرسەکان دەکرێت، بۆیە دەتوانین بڵێین ڕای گشتی ڕۆڵێکی کاریگەری هەیە لە سەرخستنی پلانی سیستەم یان سەرنەخستنی، بۆیە لە سیستەمەکانی دیموکراسی دا هاووڵاتیان بەشداری دەکەن لە پلانە ستراتیژیەکان و ڕای گشتی لەناوخۆ دەتوانێت کاریگەری لەسەر سیاسەتی دەرەوەش هەبێت، بۆیە ئەوانەی کە بڕیارەکانی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت دادەڕێژن، دەبێت ڕەچاوی ڕای گشتی ناوەخۆ بکەن و ئەوانەی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەت دادەرێژن نابێت پێچەوانەی ڕای گشتی ناوخۆیی بن، هەروەها ڕای گشتی بەدرێژایی مێژوو ڕۆڵێکی کاریگەری هەبووە لە بونیاتنان پەرەسەندنی هزری سیاسی کە بریتیی بوو لە بونیاتنان و پەرەپێدان و پێکهاتەی دامەزراوەکان کەلەگەڵ بارودۆخی نوێدا بگونجێن، وەك نوێکردنەوەی دامەزراوەکانی یاسادانان و جێ بەجێ کردن و دادوەری. بۆیە ڕای گشتی گرنگی بە پاراستنی دامەزراوەکان لەلایەك و لەلایەکی ترەوە پاراستنی ڕۆحی کۆمەڵگە دەدات، دەتوانین بڵێین ڕای گشتی ئامرازێکی پارێزگاریکردنە لە روحی مەعنەوی کۆمەڵگە بەهەموو ڕەگەزەکانییەوە، لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا ڕای گشتی ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە دەرکردنی بڕیار و جێبەجێ کردنی (کەریم محمود، ٢٠٠٩: ص٢١٨).

٢. کۆمەڵایەتی:

لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی ڕای گشتی ڕۆڵی کاریگەرو بەرچاوی هەیە بۆ پەرەپێدانی ژیانی مەدەنی و کۆمەلایەتی کە دەتوانێت بوار بۆ گۆڕانکاری لە تێڕوانین و بارودۆخ و چالاکی و یاساکان یان هەمووارکردنیان کە پێویستیان بە گۆڕانکاریە لە پێناو بەرژەوەندی گشتی بڕەخسێت، هەروەها پەرەپێدانی

کۆمەڵایەتی پەیوەندی بە پەرەپێدانی ئابووریەوە هەیە، چونکە پێشکەوتنە ئابووریەکان بوونەتە هۆی هێنانەدی خۆشگوزەرانی کۆمەڵگە، بۆیە لەسەر ئاستی کۆمەڵایەتی ڕای گشتی پارێزگاری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و داب و نەریت و بەها بالاکانی کۆمەڵگە دەکات و دژایەتی هەر تێڕوانینێك دەکات کە دژی ئەم بەها بالأیانەبێت، هەروەها ڕای گشتی دەتوانێت فاکتەرێك کاریگەربێت بۆ سەرخستنی پلانی دەوڵەت بۆ پەرەپێدانی سیاسی و ئابووری. بۆیە لە سیستەمێکی دیموکراسی دا هاووڵاتیان بەشدارن لە داڕشتنی پلانەکان و بەشداری هاووڵاتیان لە داڕشتنی پلان وادەکات کە هاووڵاتیان زانیاری و تێگەیشتنیان هەبێت لە ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی (کەریم محمود، ٢٠٠٩: ص٢٢٣).

بەشێوەیەکی گشتی لەدەوڵەتە دیموکراسییەکاندا ڕای گشتی لە ڕێگەی دەنگدان، ڕیفراندۆم، پەیوەندی هاووڵاتیان لەگەڵ کاربەدەستان، گرووپەکانی خاوەن بەرژەوەندی، چاپەمەنی و ڕاگەیاندنەکان، ئەندامێتی لە پارت و گرووپەکاندا و ... هتد، ڕەنگ دەداتەوە، لەگەڵ ئەوەش بە سەرنجدان بەناوەڕۆکی چینایەتی کۆمەڵگاکانی دیموکراتیك و ناهاوئاهەنگ و جۆراوجۆری کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی گروپەکان و جیاوازی ڕاوبۆچوونی نێوانیان هەموو کات گروپەگەلێك هەن کە بەرپرسان یان سیاسەتەکانیان بە نوێنەری بیروڕای خۆیان نەزانن، بەلأم تەنیا لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا لانی زۆری کەناڵەکان بۆ دەربڕینی ڕای گشتی بوونی هەیە (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٣١٠).

### ٣-٤-٣- پارتە سیاسییەکان:

پارت بەمانای گرووپ و تاقمی سیاسی دێت، چەمکێکە لە ڕاستیدا مۆدێرنە و لە ڕۆژئاوادا سەری هەڵدا یەکەمین پارتە سیاسییەکان بەمانای درووستی وشەکە لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەریان هەڵدا، پاش ئەوە کە دامەزراوە یاساییەکان سەقامگیری تەواویان پەیداکرد بەشی

زۆری هاووڵاتیان مافی دەنگدانیان وەرگرت، هەروەها پارتە سیاسییەکان بوون بە پێویستی لە بریتانیا و ریفۆرمی هەڵبژاردن لە ساڵانی (١٨٣٣-١٨٦٨) دەرکەوتنی ئاشکرای پارتە سیاسییەکانی لە گۆڕەپانی سیاسی ئەو دەوڵەتە لێ کەوتەوە (بشيريه، ٢٠٠٩: ص٢٨٦).

"جیمز مەدیسۆن" بەم شێوەیە پێناسەی بۆ پارتە سیاسییەکان کردووە، کە بریتین لە: ((گردبوونەوەی کۆمەڵێك لە هاووڵاتی، کە زۆرینەبن یان کەمینە و هەموویان یەکتریان گرتووە بۆ ئامانج و بەرژەوەندیەکی هاوبەش لە بەرامبەر مافی هاووڵاتیانی تر یاخود بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە بەردەوامەکانی کۆمەڵگە)) (بومبر، ١٩٩٩: ص١٣).

"ماکس ڤیبەر" زانای کۆمەڵناسی ئەڵمانی لە پێناسەیەك دەرباری پارتی سیاسی کە لە رووی کۆمەڵناسیەوە کراوە و ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی لەبەرچاوگرتووە و دەڵێت: ((پارتی سیاسی بریتییە لەو دامەزراوە کۆمەڵایەتیانەی کە چوونەتە پاڵ یەك بەشێوەی خۆبەخشانە، ئەمەش مەبەستی بەدەست هێنانی تواناکان بۆ هێنانەدی ئامانجێکی دیاریکراو، وێرای ئەمەش ڕەخساندنی هەلە بۆ ئەندامەکانی بۆ بەدەست هێنانی بەرژەوەندی)). بۆیە دەتوانین بڵێین پارت بریتییە لە رێکخستنێك کە خاوەن خواست و ئامانجی سیاسی- هزری دیاریکراوە و ئەندامانی پارت و لایەنگرانی پێیان وایە کە پارتی سیاسی ئامرازێکە بۆ هێنانەدی ئاوات و ئامانج و بەرژەوەندیەکانیان، هەروەها بازنەی پەیوەندی نێوان هاووڵاتیان و دەسەڵات (ئەمین شوانی، ٢٠١١: ص٦١).

هەروەها لاپالۆمبارا دەڵێت: ((گرووپێکی رێکخراوی بەردەوام، کە خاوەن رێکخراوی هەمیشەیی و ئاشکران لە ئاستی ناوچەیی کە پەیوەندییان بە ئاستی نەتەوەیی هەیە و ئەم رێکخراوە لەرێگەی بڕیاری رێبەرەکانەوە، هەوڵی وەدەست هێنانی دەنگی هاووڵاتیان بدات)) (عالم، ١٩٩٤: ص٣٤٣). بەگشتی دەتوانین بڵێین کە پارتی سیاسی بریتییە لە گرووپێك لە تاکەکانی کۆمەڵگە کە بە بیروبڕوا

بۆ ئامانجە هاوبەشەكانیان لە ڕێكخراوێك بەناوی پارت كاردەكەن و لەڕێگەی لقەكانەوە پەیوەندییان پێكەوە هەیە و بۆ گەیشتن بە ئامانج یان ئامانجەكانیان سیستەم پێك بێنن (رحیمی، ١٩٩٩: ص٤٠).

لێرەوە دەتوانین بڵێین سیستەمی فرە پارتی، باشترین میكانیزمە بۆ ڕێكخستنی ژیانی سیاسی لە كۆمەڵگەدا و هەروەها بە یەكێك لە بنەماكانی سیستەمێكی دیموكراسی دادەنرێت، دیموكراسییەتێكی ڕاستەقینە بەبێ بوونی فرەپارتی و یان ئازادی دامەزراندنی پارت و ڕێكخراوی نوێ بێ مانایە و ئەم سیستەمە پەیوەندی بەو كۆمەڵگەیانەوە هەیە كە فرە ڕەنگیان تێدایە لە ڕووی ئەتنیكی، ئایین و ئایینزا، جوگرافی، چینایەتی و ... هتد (سالح، ٢٠٠٩: ص٩٥-٩٤).

بەگشتی ئەو كۆمەڵگەیانەی كە خاوەن سیستەمێكی دیموكراسین، پارتی سیاسی تیایدا ڕۆڵێكی گرنگ و فراوان دەگێڕێت، لە پرسە سیاسی و كۆمەڵایەتیەكان، لەوجۆرە كۆمەڵگایانە سیستەمی سیاسی زەمینە خۆشكەرە بۆ ئازادی ڕادەربڕین و بۆ هێنانەدی ویست و خواست و ئامانجی هاووڵاتیان لە چوارچێوەی دەستورێكی ڕەوا و بەپێی میكانیزمە یاسایی و دیموكراسییەكان، هەروەها پارت دەتوانێت ببێت بە میكانیزمێك بۆ بەشداری هاووڵاتیان لە درووستكردنی بڕیار لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا كۆمەڵگە لەهەموو ئاستێكدا لە جوولەی بەردەوام دایە، بەهۆی ئەم پلۆرالیزمەیە كە بوونی هەیە و وادەكات كە چالاكی كۆمەڵگە بە ئاراستەی پەرەسەندن و پێشكەوتنی و ئاسایش و سەقامگیری دەوڵەت بێت (ئەمین شوانی، ٢٠١١: ص٦٠). هەروەها ئەركەكانی پارتی سیاسی بەپێی سیستەمەكانی سیاسی جیاوازیان هەیە چونكە سیستەمێكی سیاسی كە باوەڕی بە پلۆرالیزم هەیە و سیستەمێكی تر كە باوەڕی بە پلۆرالیزم نییە، كاروچالاكی پارتایەتی دەست نیشان دەكات، لە سیستەمێكی كراوە كە باوەڕی بە پلۆرالیزم هەیە سیستەمەكە سیستەمێكی فرەپارتیە و دابەشكردنی دەسەڵات و لێپرسینەوە و لێپرسراویەتی هەیە، بەڵام لە

سیستەمێکی داخراو کە بڕوای بە پلۆرالیزم نییە ئەوە سێیەم سیستەمێکی تاك پارتیە کە کێبڕکێ بوونی نییە و دەسەڵاتەکانیش لەلایەن پارتێکی سیاسی دیاریکراو مۆنۆپۆلکراوە. هەروەها پارتە سیاسییەکان لەکاتی هەڵبژاردنەکاندا، هەوڵ دەدەن لە چوارچێوەی بەرنامەکانیان سەرنجی هاووڵاتیان و دەنگدەران بۆلای خۆیان ڕابکێشن بەم مانایەی کە هەوڵ دەدەن کاریگەری لەسەر ڕای گشتی درووست بکەن بۆ گەیشتنە دەسەڵات و لە سیستەمە دیموکراسییەکاندا بەرنامەی پارتەکان لە کاتی هەڵبژاردن دا کە بەپێی ویست و پێداویستی دەوڵەت و هاووڵاتیانە، بەڵام لە سیستەمە نادیموکراسییەکاندا زیاتر لەسەر درووشم و ئایدۆلۆژیایە، هەروەها ئەگەر پارتی سیاسی نەتوانێت بەشێوەی دیموکراسیانە کاریگەری بخاتە سەر ڕای گشتی، ئەوا پارتی سیاسی ناتوانێت بگاتە دەسەڵات بەم مانایە کە پارتی سیاسی دەبێت لە هەمان کاتدا ڕەچاوی ویست و داخوازی و پێداویستی و ڕوانینی ڕای گشتی بکات (ئەمین شوانی، ٢٠١١: ص٢٥-٢٦).

هەموو پارتە سیاسییەکان هەوڵی گەیشتن بۆ دەسەڵات دەدەن، بەتایبەت پارتەکانی دیموکراسی هەوڵ دەدەن لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی ئازاد و دادپەروەرانە بگەنە دەسەڵات و پارتەکانیش گرووپێکی عەقلانی و هزرین و هەوڵی بەدەستهێنانی پۆستەکان لە سیستەم دەدەن، بۆیە پەیوەندییەکی توند و تۆڵ هەیە لەنێوان پارت و کۆمەڵگە بەتایبەت دەنگدەران یان هاووڵاتیان و لێرەوەیەکە بەرژەوەندیەکان پارێزراون (بومبر، ١٩٩٩: ص٨٧). پارتە سیاسییەکان چالاکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییان هەیە، لە سیستەمێکی سیاسیدا بۆ گەیشتن بە دەسەڵات لە پێناو هێنانەدی ئامانجەکانیان بۆیە دەتوانین ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان دابەشکەینە سەر ئەم خاڵانە:

١. بەشداری پێکردنی هاووڵاتیان لە ژیانی سیاسی کە هەوڵ دەدەن دەرفەت بڕەخسێنن بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگە کە بەشداربن لە درووستکردنی بڕیار.

٢. پێگەیاندن و بەرزكردنەوەی ئاستی وشیاری سیاسی هاوولاَتیان لە چوارچێوەی بەرنامەی پارت.

٣. ڕەخساندنی بوار بۆ ئازادی ڕادەربڕین و بیروڕای جیاواز كە پارتەكان ببنە كەناڵێك بۆ ئەوەی هاوولاَتیان گوزارشت لە ڕوانگە و بەرژەوەندی خۆیان بكەن لە هەمبەر ڕوانگەی تری سیاسی.

٤. ڕۆڵی چاودێری و لێپرسینەوە بەسەر سیستەم، ئەگەر پارتەكان لە چوارچێوەی سیستەم بن یان لەدەرەوە ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە كاریگەری خستنە سەر دەسەلاَتی سیاسی.

٥. پارتە سیاسییەكان ڕۆڵی كاریگەریان هەیە لە پێدانی ڕەوایەتی بە سیستەمی سیاسی، ئەمەش لەمیانەی بەشداریكردنی هاوولاَتیان لە پرۆسەی سیاسی.

٦. كۆكردنەوەی بەرژەوەندیەكان و گوزارشت كردن لە بەرژەوەندیە جیاجیاكان و پاراستنی بەرژەوەندی ئەندام و لایەنگرەكانیان (ئەمین شوانی، ٢٠١١: ص١١).

دەتوانین بڵێین پارتە سیاسییەكان بە پێنج شێواز دەبنە هۆی گەشەپێدانی سیاسی كە ئەویش كاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەبێت:

١. ڕۆڵی پارتە سیاسییەكان لە بواری بەشداری سیاسی: بەشداری سیاسی ئاستی بەكارهێنانی مافی تاكەكانی كۆمەڵگا بۆ بەشداری لەپرسی و بابەتە گشتییەكان و بڕیارە سیاسییەكان دەگرێتەوە و سەقامگیری لەهەر كۆمەڵگەیەك پەیوەندی بەئاست و ڕادەی بەشداری سیاسی و ئاستی دامەزراوەیی بوونی سیاسی لەو كۆمەڵگەیە دا هەیە و بەشداری سیاسی بالاَ دەبێتەهۆی یەكگرتوویی دامەزراوە سیاسییەكان و سەقامگیری سەقامگیری ئەو كۆمەڵگەیە بەم مانایە كە داواكاریەكانی چین و توێژ و گرووپ و تاكەكانی كۆمەڵگە لە ڕێگەی بەشداری سیاسییەوە و لەبوونی دامەزراوەی سیاسی گونجاوی هەڵگری ئەم داواكاریانە،

دەبێتە هۆی سەقامگیری و بەپێچەوانەوە، لەنەبوونی دامەزراوەی پێویست بۆ بەشداری سیاسی دەبێتە هۆی پەشێوی و ئالۆزی و شۆڕش و نەمانی ڕەوایەتی سیستەم و هەڵوەشانەوە یان ڕوخانی سیستەم و ناسەقامگیری کەواتا پارتە سیاسییەکان دەتوانێ لەڕێگەی یاسایی و ڕامیاری ڕۆڵی ئاراستەکردن و جێ بەجێ کردنی ئەوداواکاریانەبین و لەو کۆمەڵگایانەی کە ئاستێکی باشی دامەزراوەی سیاسی و بەشداری سیاسی هەیە و توانای وڵام دانەوە و ئاراستەکردنی داواکاریەکانی هەیە، ئەوە کۆمەڵگەیەکی یەکگرتووتر و سەقامگیرترە و سیستەم خاوەن ڕەوایەتیە و ئاسایش بوونی هەیە (رحیمی، ١٩٩٩: ل١١).

٢. ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان لە ڕەوایەتی پێدان: پارتە سیاسەکان لە ڕێگەی ڕێکخستن و بەشداری هاووڵاتیان و بەدەست هێنانی دەسەڵات دەتوانین ڕەوایەتی بە سیستەمی سیاسی و سیستەم و دەسەڵات بدەن بەتایبەت لە سیستەمێکی دیموکراتیك و ئازاد و لە هەڵبژاردنی گشتی دا کەئەمەش لە چوارچێوەی ڕێسا و یاسای دەوڵەت و ئاشتیانە دەبێت، کەکاریگەری لەسەر سەقامگیری و پشتیوانی هاووڵاتیان بۆ سیستەمەکە و ئارامی و ئاسایشی دەوڵەت هەیە (رحیمی، ١٩٩٩: ل١٦).

٣. ڕۆڵی پارتە سیاسییەکان لە یەکپارچەیی و یەکگرتووی نەتەوەیی و کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی: یەکپارچەیی نەتەوەیی بریتییە لەتوانای دەوڵەت بۆ کۆنترۆڵکردنی هەرێمی ژێر دەسەڵاتی و هەروەها ئەو ڕەفتار و هەستانەی کە گەل لەهەمبەر دەوڵەت و نەتەوە هەیانە، کەلەژێر ناونیشانی وەفادری، یەکگرتووی و بەرژەوەندی گشتی دا باسی لێوەدەکرێت و یەکگرتوویی سیاسیش بریتییە لە هاوڕابوون یان کۆك بوونی تاکەکانی کۆمەڵگە لەهەمبەر پرۆسە و بابەتە سیاسییەکان یان بەهاورێسا سیاسییەکان، پارتە سیاسییەکان لە ڕێگەی کۆکردنەوەی بەرژەوەندیەکان و گرێ دانی تاك و گرووپەکان بە یەکتری کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەییەوە دەبێت و ئیدارەی ململانێکان بەشێوەی ئاشتیانە دەکەن.(رحیمی، ١٩٩٩: ل١٧).

٤. ڕۆڵی پارتە سیاسییەكان لە بەڕێوەبردنی ململانێیەكان: پارتە سیاسییەكان ململانێیە شاراوەكانی كۆمەڵگەی ئاشكرا و یاسایی دەكەن و دواتر بەڕێوەی دەبەن لە چوارچێوەی ڕێساو یاساگشتییەكاندا، هەروەها لێكترازانە كۆمەڵایەتیەكان كەم دەكەنەوە كە ئەمەش كاریگەری لەسەر سەقامگیری سیاسی كۆمەڵگە دەبێت بەم مانایە كە پارتە سیاسییەكان ئەم ململانێیانە بەشێوازی ئاشتیانە بەڕێوەدەبەن و توانای سیستەم بەرز دەكەنەوە.(رحیمی، ١٩٩٩: ص١٩).

٥. ڕۆڵی پارتە سیاسییەكان لە بەكۆمەڵایەتی كردنی سیاسی: هەر سیستەمێكی سیاسی بۆ بەردەوامی و مانەوەی خۆی و پێویستی بەوە هەیە كە بەهاكانی سیاسی بگوازێتەوە بۆ تاكەكانی كۆمەڵگە یان نەوەی نوێ، كە پارتە سیاسییەكان بەم كارە هەڵدەستن و پارتە سیاسییەكان لە ڕێگەی ئەركە جیاجیاكانیانەوە و پەروەردەی سیاسی، بەهاكانی سیاسی ئەو سیستەمە سیاسییە دەگوازنەوە بۆ كۆمەڵگە و جیلی نوێ و ئاستی توانای سیستەم بەرز دەكەنەوە (رحیمی، ١٩٩٩: ل٢١).

لێرەوە دەتوانین بڵێین كە كاریگەریەكانی پارتی سیاسی لە پرۆسەی دیموكراسی دا بریتییە لە:

١. پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ دیاردەی هەڵبژاردن و هەروەها كاریگەری لەسەر ئاراستەكردنی ڕای گشتی ڕۆڵ و گرنگیان لە دیموكراسیدا هەیە.

٢. پەروەردەكردنی جەماوەر بەرەو بەشداری سیاسی و هاندانیان لەم ڕووە ڕێگە لە دوورەپەرێزی یان قۆرخكاری لەلایەن كەسانێكی تایبەت دەگرن، لەم ڕوانگەیەوە پارت یەكێكە لەسەرەكیترین فاكتەرەكانی گەشەپێدانی سیاسی.

٣. كاریگەری لە پرۆسەی بە كۆمەڵایەتی بوون و هەروەها یەككگرتویی و یەكپارچەیی كۆمەڵایەتی كە ئەمەش كاریگەری لەسەر سەقامگیری سیاسی و سەرمایەی كۆمەڵایەتی هەیە.

٤. پارتی سیاسی کەناڵ و ئامرازی بەڕێوەبردنی سیستەم و بەدەستهێنانی پۆستەکان بەشێوەی ئاشتیانە و دیموکراتیکە، کەئەمەش یارمەتی دانانی کەسانی شیاو لە پۆستە باڵاکان دادەدات.

٥. پارتە سیاسییەکان بەرەخنەگرتن لە سیستەم وەکو (ئۆپۆزسیۆن)، کە بەرگری لە بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان و بەهاکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی دەکەن.

٦. پارت ئامرازی پەیوەندی نێوان جەماوەر و نوخبەکانە.

٧. بەهۆی توانای پارت لە ڕێکخستنی، ئەوە پارتی سیاسی لەکاتی هەڕەشە و مەترسییەکاندا ئاسایشی نەتەوەیی کە ڕێگەی یەکگرتوویی جەماوەر دەپارێزرێت.

٨. پارت دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی توند و تیژی و زیاتربوونی ئاشتی و سەقامگیری سیاسی لەڕێگەی یاسایی و دامەزراوەیی بوونەوە.

٩. پارتەکان لەڕێگەی بەرزکردنەوەی توانای کۆمەڵگە قەیرانەکانی ناسنامە، یەکگرتوویی، بەشداری، ڕەوایەتی و دابەشکردن، بەرەو چارەسەری دەبات و ڕەوایەتی دەداتە سیستەمەسیاسییەکە کە کاریگەری لەسەرئاسایشی نەتەوەیی دەبێت (**اخوان كاظمي**، ١٩٩٩: ص٨).

### ٣-٤-٤- کۆمەڵگای مەدەنی:

کاتێك دیموکراسییەت ببێتە بنەمای سەرەکی دەسەڵاتداریەتی و توخمێکی سەرەکی ژیانی سیاسی و مەدەنی ناوخۆی کۆمەڵگە بێت ئەوا دەوڵەت پابەندی کۆمەڵێك مەرجی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کەلتووری، یاسایی و ئەخلاقی مەدەنی و دیموکراسیانە دەبێت ئەم مەرجانە دەبنە ئەرکی سەرەکی دەوڵەت بۆ جێ بەجێ کردنیان لە چوارچێوەی دام و دەزگا و دامەزراوەی سیستەمێکی دیموکراسیدا، هەروەها هاووڵاتیان لەچوارچێوەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و پارتە سیاسییەکان و میدیا و گروپەکانی گوشار و بەرژەوەندی و ...

هتد، دەبنە چاودێرێك بۆ دەسەڵاتداریەتی باش (عەلی، ٢٠٠١: ص١٣). دەتوانین بڵێین کە دیموکراسییەت بەبێ بوونی کۆمەڵگەی مەدەنی بەهێز کە مەرجی سەرەکی سەقامگیری و بەردەوامی دیموکراسییە بوونی نییە. کۆمەڵگەی مەدەنی بریتییە لە ڕێکخراو و دامەزراوەکان، ئەنجومەن و سەندیکا و کۆمەڵەکان کە بەشێك نین لە دەسەڵاتی سیاسی، بەڵام ڕۆڵێکی کاریگەریان لە ڕەوایەتی پێدان بەدەسەڵاتی سیاسی هەیە. بەبۆچوونی شارەزایانی کۆمەڵگای مەدەنی، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی کۆڵەکەی سەرەکی دیموکراسین، هەروەها بڕوایان وایە کە پێویستە و دەبێت ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی سەربەخۆ و ئازادبن و بتوانن کاریگەریان لەسەر دەسەڵاتی سیاسی هەبێت لەبەرژەوەندی کۆمەڵگە، کۆمەڵگەی مەدەنی پێویستە خاوەن ناسنامەی تایبەتی خۆیان بن بەپێی ئەو بوار و بەرژەوەندیەی کەکاروچالاکی و بەدواداچوونی بۆ دەکەن (بشيريه، ٢٠٠٩: ص٢٤١).

زەمینەی کۆمەڵایەتی دیموکراسی مەرجێکی بنەڕەتی دیموکراسییە، بۆیە بوونی کۆمەڵگەی مەدەنی بەهێز مەرجی بنەڕەتییە بۆ بەردەوامی و سەقامگیری سیاسی و ئەم ڕێکخراو و دامەزراوانە سەر بە سیستەم نین بەڵام کاریگەریان هەیە لەسەر دەسەڵاتی سیاسی. کۆمەڵگەی مەدەنی لەسەدەی (١٧ و ١٨) لە ئەورووپا سەری هەڵدا کەڕێگەی بۆ بەشداری سیاسی و کێبڕکێی و بنەماکانی تری دیموکراسی خۆشکرد، کۆمەڵێك لە هێز و گرووپی نەتەوەیی، ئاینی، پسپۆری و هزری و چینایەتی و ... هتد، سەربەخۆ کرد بۆ بەدەست هێنانی ئامانجەکانیان، لەهەمبەر دەسەڵاتی سیاسی، ئەوەش بووە هۆی ڕەگ داکوتانی کەلتووری سیاسی دیموکراسی و لێرەوە دیموکراسی سیمایەکی نوێی پەیداکرد، بۆیە دەتوانین بڵێین لاوازی و بەهێزی ئەم ڕێکخراو و دامەزراوانە بۆتە پێوەری ئاستی دیموکراسی و یان نادیموکراسیبوون، چونکە بەبڕوای (ئەلێکسی دو تۆکڤێل) و (جیمز مادیسۆن) و (جۆن ستیوارت میل)، پێیانوایە کە ئەم ڕێکخراوانە پارێزەری ئازادی و فرەیین

(بەشیری، ٢٠٠٥: ص٨٤). پاوانکردنی دەسەڵات لەلایەن هەر گرووپ یان دامەزراوەیەکی سیاسی دەبێتە کۆسپ لەبەردەم بەشداری گرووپ و دامەزراوەکانی تر، کە دواجار دەبێتە کۆسپ لەبەردەم دیموکراسی، بۆیە پەیوەندی نێوان سیستەمێکی دیموکراسی و کۆمەڵگەی مەدەنی پەیوەندییەکی قوول و ڕەگ داکوتاو و ئۆرگانیکە لەچوارچێوەی دامەزراوەکانی وەك ئەنجومەنی یاسادانان، پارتە سیاسییەکان و ڕاگەیاندن، ئەو کەناڵانەی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگەی مەدەنی و دەسەڵات ڕێکدەخەن (بشیریە، ٢٠٠٩: ص٢٤١). هەروەها ئەو گرووپانەن کەمەبەستی ماددی و ئابووری لەپشت کاروچالاکیەکانیان دایە و زۆربەیان گرووپی پیشەیین و بەرگری لە ماف و بەرژەوەندیە پیشەییەکانیان دەکەن لەبواری حەقدەست و کات و دڵنیایی و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانیان و..هتد، لەچوارچێوەی ئەم گرووپانەدا سەندیکاکان شوێنی گەورەیان داگیرکردووە، هەروەها سەندیکای خاوەن کارو سەرمایەدارەکانیش دەچنە خانەی ئەم گرووپانە، هەروەها گرووپە بەرژەوەندیە مەعنەویەکان کە گرووپی جیاوازن لە گرووپە بەرژەوەندیە ماددیەکان کە پشتگیری لەبەرژەوەندی مەعنەوی و ماف و داخوازیە مەعنەویەکان جیاجیاکان دەکەن، وەکو: ڕێکخراوەکانی بەرگری کردن لە مافی ژنان، منداڵان و بیروڕای ئاینی، ژینگە، مافی مرۆڤ و ... هتد. کاروباری ئەمانە زیاتر لە بواری ئازادی و خزمەتگوزاریدایە (سالح، ٢٠٠٩: ص٥٢-٥١). بەگشتی بیرۆکەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەسەر چەند بنەمایەکی هزری دامەزراوە:

١. بۆ ئەوەی ڕێگربن کە دەوڵەت نەتوانێت بەتەواوی کۆنتڕۆڵی هەموو بوارەکانی کۆمەڵگە بکات و بتوانێت هەموو توانای کۆمەڵگە بخاتە ژێر کۆنتڕۆڵی خۆی.

٢. بۆ ئەوەی لە چوارچێوەی ئەم ڕێکخراوانە، چارەسەری گرفتەکانی کۆمەڵگە بکرێت و دواجار ئەم ڕێکخراوانە لە ڕێگەی کەناڵ و میکانیزمە

جۆراوجۆرەكانەوە ئەم كێشانە ئاراستەی دەسەڵات بكەن و ببنە گوشار لەسەر دەسەڵات بۆ چارەسەركردنیان.

٣. سیستەم هەرچەندە بەر فراوان و بەربڵاو بێت و لق و پۆپی جۆراوجۆری هەبێت، ناتوانێت هەموو پێداویستی و داخوازیەكانی كۆمەڵگا بەدی بێنێت بۆیە ئەم ڕێكخراوانە، هەوڵی پڕكردنەوەی ئەم بۆشاییانە دەدەن، بۆیە ئەم ڕێكخراوانە ڕێكخراوی ناحكومین لەسەربنەمای خۆ بەخش كاردەكەن و بەدوای قازانج ناگەڕێن و لە چوارچێوەی یاسادا كاردەكەن (محمد رزگار، ٢٠٠٧: ص٢٣٥).

لەو دەوڵەتانەی كە لە قۆناغی پەرەسەندندان ڕۆڵی ڕێكخراوە ناحكومیەكان و ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی ناكاریگەر و پەراوێز خراون و نەبوونی كاریگەری ڕای گشتی لەگەڵ سنووردارێەتی پەیرەوكردن و جێبەجێ كردنی دیموكراسی و قورخكردنی دەسەڵات و نەبوونی دەستاودەستكردنی ئاشتیانەی دەسەڵات و نەبوونی شەفافییەت بۆتە سیمای دەوڵەتێكی نادیموكراسی (محمد مسعد، ٢٠٠٩: ص١٣٩). بەگشتی ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگای مەدەنی سێ ڕۆڵی سەرەكیان لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا هەیە:

١. بەپێی یاسا، بیروباوەڕی گشتی دەكەنە سیاسەتی گشتی دەوڵەت.

٢. سیاسەتی گشتی كە لەسەر بنەمای ڕای گشتییە پێشنیاز دەكەن و دەكەنە ئامرازێك بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت.

٣. خزمەتی خۆیان بەشێوازی سەربەخۆ لە دامەزراوەكانی حكومی پێشكەش دەكەن (مەعروفی، ٢٠١١: ص٩٩).

هەروەها دەتوانین بڵێین كە كۆمەڵگەی مەدەنی بەگشتی خاوەنی چەندین ڕەگەزی جیاوازە كەبریتین لە:

١. ڕێكخستن: چونكە كۆمەڵی مەدەنی ئەركێكی دیاریكراوی لە ئەستۆیە و ناتوانێت بەبێ ڕێكخستنێكی ڕاستەقینە ئەم ئەركانە جێ بەجێ بكات بۆیە فاكتەری ڕێكخستن ڕۆڵی سەرەكی و گرنگی هەیە لە ژیانی كۆمەڵگەی مەدەنی و

ئاستی بەهێزی ڕێکخستن وادەکات کە کۆمەڵگەی مەدەنی لە ئەرکەکانیدا سەرکەوتوو بێت ئەمەش بەواتای ئەوەیە کە تاکوو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی سەرکەوتووتربن بە دامەزراوەیی کردنی ژیانی مەدەنی زیاتر دەبێت.

٢. خۆبەخشانە: مەبەست لە خۆبەخشی واتا بەشداریکردنی ئارەزوومەندانەیە و بێ زۆرەملێ لە کارکردن بەئاراستە مەدەنییەکان، بەو پێیەی پێکهاتەی کۆمەڵگای مەدەنی لە پێکهاتەی زۆرەملێ جیادەکرێتەوە، هزری خۆبەخش بەستراوەتەوە بە چەند چەمکێکی تر ژیانی مرۆڤایەتی کە ئەم چەمکانە ژیانێکی مەدەنی لە کۆمەڵگەدا پێکدێنن وەکو: ئازادی، ئاشتی، لێبوردەیی، یەکسانی، دادپەروەری، مافی مرۆڤ و بەرژەوەندی گشتی و ..هتد.

٣. سەربەخۆیی: پێویستە دامەزراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دووربن لە لایەنگیری بۆ دەسەڵات چونکە ئەرکی ڕاستەقینەی ئەم دامەزراوانە بریتییە لە درووستکردنی پەیوەندی نێوان هاووڵاتیان و دەسەڵات، هەرکاتێك ئەم دامەزراوانە لایەنگیری دەسەلات بکەن لە ئەرکی سەرەکی خۆیان لادەدەن، هەر بەوپێیە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی هەڵگری هەر بەرنامەیەك بن دەبێ لە چوارچێوەی چالاکی مەدەنی دابن کە بریتین لە چالاکی مرۆیی واتا بۆ سەرجەم مرۆڤەکان بێت بەبێ جیاوازی.

٤. هەوڵنەدان بۆ گەیشتن بە دەسەڵات: ئامانجی هەر ڕێکخراوێکی کۆمەڵگای مەدەنی گەیاندنی دەنگی هاووڵاتیانە بە دەسەڵاتی سیاسی، کەواتا کارکردنیان لەسەر دوو ڕەهەندی سەرەکییە ئەویش هاوڵاتی و دەسەڵاتە بۆیە ناکرێت ئەم جۆرە ڕێکخراوانە هەوڵی گەیشتن بە دەسەڵات بدەن، ئەم ڕەگەزە وادەکات ئەم ڕێکخراوانە لە پارتە سیاسییەکان جیابکرێنەوە (کەریم محمود، ٢٠٠٩: ص١٩٥).

بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە سیستەمێکی دیموکراسیدا لەسەر ئاستی چەند بوارێکی جیاواز کاردەکەن کە گرنگترینیان بریتین لە:

١. بواری سیاسی:

ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەریان هەیە لە ژیانی سیاسی چونکە بەهۆی ئەو ئەرکەی کە جێ بەجێ دەکەن، دەبنە چاودێر بەسەر سیستەمی سیاسی کەوادەکات دەوڵەت تاك لایەنە مامەڵە بە سیاسەتی گشتی نەکات، واتا بەتەنیا خاوەنی بڕیار نەبێت.

٢. بواری ئابووری:

بەو پێیەی کە ئابوری لە هەر سیستەم و کۆمەڵگەیەکدا ڕەهەندێکی سەرەکییە و لەئێستادا ناتوانرێت لەسیاسەت جیابکرێتەوە، چونکە سیاسەت بەبێ بوونی ئابوریەکی پتەو و بەهێز ناتواندرێت درێژە پێبدرێت و سەرکەوتوو بێت، بۆیە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی بۆ چاودێری کردنی سیاسەتی ئابووری کار لەسەر بواری ئابووری دەکەن، بۆئەوەی ئابووری دەوڵەت لەلایەن گرووپ یان لایەنێکی قورخ نەکرێت و ئابووری دەوڵەت لە خزمەتی ژیانی هاووڵاتیان دابێت.

٣. بواری کەلتووری و کۆمەڵایەتی:

ناتوانرێت بواری هزری و مەعنەوی لە لە ژیانی مرۆڤ دا ببڕێت یان جیابکرێتەوە، بۆیە کارکردن لەسەر ئاراستەکردنی پۆزەتیڤانە بۆ کەمکردنەوەی لایەنە نێگەتیڤەکانی ناو کۆمەڵگە، بەتایبەت لەو کۆمەڵگەیانەی کە بواری هزر و مەعنەوی ڕۆڵی کاریگەریان هەیە لە هەموو ژیانی تاك و کۆمەڵگە. هەروەها کەلتووری کۆمەڵگە و پێکهاتە کۆمەڵایەتیەکەی کاریگەری لەسەر داڕشتنی و پیادەکردنی ژیانی کۆمەڵگە هەیە، دیاریکردنی خاڵی لاواز و بەهێزی ئەو کەلتوورە کۆمەڵایەتیەی کەهەیە و کارکردن لەسەری بۆ نوێکردنەوە و

گەشەپێدانی یەکێکە لە بوارە گرنگەکانی کاری ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی (کەریم محمود، ٢٠٠٩: ص١٩٧).

ڕۆژ بە ڕۆژ دیموکراسی زیاتر وەکو بەها بە پانتایی جیهان بڵاو دەبێتەوە، پێشکەوتنی کۆمەڵگاکان بەهۆی تەکنەلۆژیای نوێ لە هەموو بوارەکان وای کردووە کلتووری کۆمەڵگاکان لە ژێر کاریگەری چەندین فاکتەر گۆڕانی بەسەردا بێت، ئەمڕۆ سیستەمە نادیموکراسییەکانیش لە گوتاری خۆیان ناتوانن بە ئاشکرا دژایەتی دیموکراسی بکەن. بۆیە بە چاوی خۆمان ڕووداو و گۆڕانکارییەکانمان دەبینین کە هاووڵاتیان و کۆمەڵگا داوا لە سیستەمە سیاسییەکان دەکەن دیموکراسی بن، ئەو سیستەمانەی ڕەچاوی بنەماکانی دیموکراسی ناکەن لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە تووشی قەیران بوون و هەندێکیش لەم دەوڵەتانە هەڵوەشانەوە.

## ٤ـ ئاسایشی نەتەوەیی:

بەهۆی ئەو گۆڕانکاریانەی لەسیستەمی نێونەتەوەیی هاتنە ئاراوە، هەروەها پێشکەوتنەکانی زانست و تەکنەلۆژیا و بەرفراوان بوونی بواری ئاسایش لە چوارچێوەی بەرژەوەندیە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، سەربازی و ... هتد، وایکرد گۆڕان بەسەر چەمکی ئاسایش دابێت، چونکە چەمکی ئاسایش بەمانا کلاسیکییەکەی تەنها ڕەهەندی سەربازی لەخۆ دەگرت، بەڵام لەسەردەمی ئێستادا چەمکی ئاسایش چەندین هەڕەشە و مەترسی نوێی بۆ هاتۆتە ئاراوە و لە ڕوانگەی جۆراوجۆرەوە خوێندنەوەی بۆ دەکرێت و چەندین ڕەهەندی تر لە خۆدەگرێت وەك: ئابووری، کۆمەڵایەتی، مرۆیی، کەلتووری کە لەیەك کاتدا هەم ڕەهەندی ناوخۆی و هەم دەرەکین. بەگشتی لە ئاسایشی نەتەوەیی مۆدێرندا، جەوهەری ئاسایش، مرۆڤ و کۆمەڵگەیە، لەم بەشەدا هەوڵ دەدەین کە چەمك و پێناسە و بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی، هەروەها ڕوانگەی قوتابخانەکانی ئاسایشی نەتەوەیی و ڕەهەندەکانی باس بکەین.

### ١.٤ـ چەمك و پێناسە و تایبەتمەندی بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی:

بەشێوەیەکی گشتی ئاسایشی نەتەوەیی چەند بنەماو تایبەتمەندییەکی هەیە و لەم باسەدا هەوڵدەدەین کە چەمك و پێناسەی ئاسایشی نەتەوەیی بخەینەڕوو و باسیش لە سەرەکیترین بنەما و تایبەتمەندییەکانی ئاسایشی نەتەویی بکەین.

#### ١.١.٤ـ چەمك وپێناسەی ئاسایشی نەتەوەیی:

وشەی (Security) لە (secures)ـی لاتینییەوە هاتووە کە بە مانای (بێ دڵەڕاوکێ) دێت، بەو مانایەیی کە متمانە و ئاسایش بوونی هەبێت و ڕزگار بوون لە

هەرەشە و مەترسی (کلمنتس، ٢٠٠٥: ص٢٨٥). چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی (National Security) دوای لەدایك بوونی دەوڵەت نەتەوە (nation- state) هاتۆتەئاراوە، ئەم چەمکە لەژێر ناوی مانەوەی نەتەوە (Nation Survival) هاتە ئاراوە (ماندل، ١٩٩٨: ص٤٣ ). ئاسایش لە ناوەرۆکی خۆیدا بە پێچەوانەی ترسە، دۆخێکە مرۆڤ تیایدا هەوڵی بەرگری کردن یان ڕاکردن لە ترس و دڵەڕاوکێ دەدات، ئەم دۆخە هەر وەکو لە تاك دایە، ئاواش لە کۆمەڵگادا بوونی هەیە، ئەگەر چی ترس لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازی و ... هتد، دەتوانێ دروست بێت، بەڵام لە هەمان کاتدا تایبەتمەندییەکی بایۆلۆجی و مرۆییە، واتە بەشێکە لە غەریزەکانی مرۆڤ، کە بەردەوام مرۆڤ چ وەك تاك چ وەك کۆمەڵگا هەوڵی دوور کەوتنەوە و سڕینەوەی ترسەکانی دەدات (احمد قدور، ٢٠٠٩: ص٩).

ئاسایش بە مانای پارێزگاری کردن لە تاك، کۆمەڵگە، نەتەوە و دەوڵەت، لەهەمبەر هەڕەشەکان دێت و خاڵی بەرامبەر هەڕەشە هەژمار دەکرێت و هەر دەوڵەتێك بتوانێت هەڕەشەکان نەهێڵێت، ئەوە گەیشتۆتە ئاسایشی و ئارامی، چەمکی ئاسایش لە سەرەتادا لە ئەدەبیاتی سیاسی ئەمریکا بوو بە باو بەتایبەت دوای جەنگی جیهانی دووەم، "واڵتەر لیپمەن" لێکۆلەری ئەمریکی یەکەم کەس بوو کە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی بەڕوونی پێناسە دەکات: ((نەتەوەیەك کاتێك خاوەنی ئاسایشە کە لە دۆخی دووری لە جەنگ دا بتوانێت بەها بنەڕەتیەکانی بپارێزێت و لە حاڵەتی جەنگیش بتوانێت ئەم بەهایانە پێش بخات)) **(عطا زادە**، ٢٠٠٨: ص٩٨). هەروەها چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی، پەیوەندی دارە بە سروشتی سیستەمی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و ئەو بەرژەوەندییە باڵایانەی کە دەوڵەت هەیەتی، بۆیە دەبینین ئەو جیاوازەی هەیە کە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی بەپێی ڕوانگە و بەرژەوەندی و سیستەمی سیاسی دەوڵەت، کە تیایدا دەوڵەت هەڵدەستێ بە پاراستن لە هەرەشە و مەترسیەکانی (صبری ئاکرەیی،٢٠٠٩: ص١٩). بەپێی ئەم چەمکە ئاسایش بریتییە لە توانای دەوڵەت

بۆ بەرپەرچدانەوەی هەڕەشەكانی دەرەوە لە دژی بەرژەوەندییە نەتەوەییەكان، ئەم چەمكە جەخت لە سەر بواری سەربازی و چەكداری دەكاتەوە، بۆیە لەو سەردەمە دەوڵەتان هەوڵی بەهێز كردنی توانای سەربازیان دەدا. ئاسایشی نەتەوەیی هاوشێوەی ئاسایشی تاكە، بەڵام جێ بە جێ دەبێت لەسەر هاووڵاتیان، ئاسایشی نەتەوەیی دەستكەوت و بەهایەكی باڵای سیاسییە، كە لەسەرەوەی دەستكەوت و بەها تاكەكانە، چونكە دەوڵەت دوور دەكاتەوە لە هەرەشەو مەترسی و دەستێوەردان و داگیركردن و ئابلوقە و گەمارۆدان، یان هەر زیانێكی تر كە لەلایەن هێزێكی بێگانە بێت یان لەلایەن گروپە تیرۆرستیەكان. ئاسایشی نەتەوەیی ڕێژەییە، چونكە لەسەر هەڵسوكەوت و ڕەفتاری لایەنی بەرامبەر كە دەوڵەت یان ڕێكخراوەكان لە دۆخێكدا كە دەتوانن یان توانایان ببنە مایەی هەرەشە.

سیاسەتی بەرپەرچدانەوەی هەر هەڕەشەیەك و لەناو بردنی ئەو هەڕەشەیە لەسەرەتا دەوڵەت ڕێكخستنێكی ئاسایشی بوو، تاكو ئێستاش ناوەرۆكی دەوڵەت بریتییە لە ئاسایش (جاكسۆن،٢٠٠٣: ص٣٤٠).

چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی بەگشتی بەدوو قۆناغ تێپەریوە، قۆناغی یەكەم:بریتییە لە ڕوانگەیەكی تەسك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی بەو مانایەی كە ئاسایشی نەتەوەیی تەنیا بەربەست دروست كردن بوو لەهەمبەر هێرش و هەرەشەی سەربازی دەرەكی و پاراستنی سنوورەكان و پارێزگاری كردن لە سەربەخۆیی نیشتمان، لە قۆناغی دووەم: دەوڵەت وای لێهات كە بەرپرسیاریەتی هاووڵاتیانی لە ڕووی سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بكەوێتە ئەستۆ، لەدژی هەرجۆرە هەرەشەیەك و مەترسیەكی جۆراوجۆر، كە سروشتی كرانەوەی سەردەمی نوێ سەپاندویانە سەر دەوڵەت **(ذكی ابراهيم،٢٠١٢: ص٢).**
چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی، چەمكێكی ئاڵۆز و ناڕوونە، چونكە چەندین فاكتەر كاریگەریان لەسەر دۆخی ناوەخۆ و دەرەوە هەیە و گۆڕانی بەسەر دادێت،

هەروەها چەمکێکە کە ڕێژەییە و ڕەها نییە و دەگۆڕێت بەم مانایەی کە دەوڵەت بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی خۆیی دەبێت لەگەڵ ئەو بارودۆخە نوێیەی ئاسایشدا و بەرژەوەندیەکانی بپارێزێت و خۆی لە هەرەشە و مەترسیەکانی ناوەخۆ و دەرەوە بە دوور بگرێت (صبری ئاکرەیی، ٢٠٠٩: ص١٧).

هانتیگتۆن لەسەر ئەو باوەرە بوو کە لەسەدەی حەڤدەهەمی زایینی پێکهاتنی دەوڵەت نەتەوە و ویستی مانەوەی، هۆکاری هاتنە ئارای ئەم چەمکە بوو، بەڵام زانایان ئاماژە بەوەدەکەن کە ئەم چەمکە تەنها لەسەدەی بیستەم بەتایبەت دوای شەری دووەمی جیهانی خۆی دەرخستوە. لەراستیدا ئاسایشی نەتەوەیی (national security) لەدوای لەدایك بوونی (نەتەوە ـ دەوڵەت) باسی لێوەکراوە بناغەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی حەڤدەهەمی زایینی (حسێن تاشان، ٢٠٠٧: ل١٠). زانای بەناوبانگ ئارنۆڵد ولفرز دەڵێت: ((ئاسایشی نەتەوەیی هێمایەکی وەهماویە کە ناکرێت خاوەنی مانایەکی رێکوپێك بێت )). هەروەها (باری بوزان) دەلێت: (( ئاسایشی نەتەوەیی بەشێوەیەکی گشتی پێناسە ناکرێت بەڵکو تەنیا لە حاڵەتی دیاری کراو دەکرێ پێناسە بکرێت)). هەروەها ناوبراو دەڵێت: ((ئاسایشی نەتەوەیی لە بواری چەمکەوە جیاوازە و لە بواری پێناسەوە لێڵە، بەڵام لەبواری سیاسی وەك چەمکێکی بەهێز ماوەتەوە چونکە چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی رێگا بۆ پرۆژەی ستراتیژی زلهێزە سیاسی و ملیتاریەکان خۆش دەکات)) (سلێمان حسێن، ٢٠٠٧: ل١٠). زانای بەناوبانگ لەم بوارە (رابەرت مەکنمارا) دەڵێت: ((ئەگەر ئاسایش بارودۆخێك بێت ئەوا لانی کەمی سەقامگیریە)) (سلێمان حسێن،٢٠٠٧:ل١١). لە فەرهەنگی زانستە رامیارییەکان بەم شێوەیە هاتووە ( ئاسایشی نەتەوەیی بریتییە لە هەست بەئازادیکردنی دەوڵەت بۆ بەدواداچوونی ئامانجە بنەڕەتیەکان بەبێ ترس و مەترسی دەرەکی بۆ سەر بەرژەوەندییە سیاسی و بنەڕەتیەکانی دەوڵەت) (سلێمان حسێن،٢٠٠٧:ل١١،١٠).

چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی لەم قۆناغەدا ڕەهەندی سەربازی نییە بەڵكو لە پراكتیكدا لە ڕەهەندەكانی ئابووری و بازرگانیدا ڕەنگی داوەتەوە، واتە بوونی تەكنیك و سەرچاوەكانی كەرەستەی بەرهەمهێنان و بازرگانی بووە هۆی بەرەو پێشچوونی هێز و ئاسایشی نەتەوەیی، بۆ نمونە لە ڕابردوودا بنەمای هزری ماكیاڤیلی بەسەر ئاسایشی نەتەوەیدا زاڵ بوو، ئەم بۆچوونەش لە بواری كاركردنی نێوان دەوڵەتان تا ڕووخانی یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو بەردەوام بوو، تەنانەت ژمارەیەكی زۆر لە بیرمەندان، یەكێك لە هۆكارە سەرەكییەكانی ڕووخانی یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو دەگەڕێننەوە بۆ بایەخدانی لە ڕادەبەدەر بە چەمكی سەربازی، بەواتایەكی تر هەموو هەوڵ و سەرمایە گوزاری ئەم دەوڵەتە بۆهێنانە ئارای ئاسایشی نەتەوەیی بریتی بوو لە ڕەهەندی سەربازی. لەم بوارەشدا یەكێتی سۆڤیەت گەشەسەندنێكی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی، لەكاتێكدا لە ڕەهەندەكانی ئابووری، كۆمەڵایەتی، زانستی و پەیوەندییەكان دواكەوتوو مانەوە و ئاكامەكانیشی لاسەنگی و ناسەقامگیری ئابووری و كۆمەڵایەتی لێكەوتەوە (سلێمان حسێن،٢٠٠٧ :ل١٦).

### ٤-١-٢- تایبەتمەندییە سەرەكییەكانی ئاسایشی نەتەوەیی:

بەگشتی دەتوانین سەرەكیترین تایبەتمەندییەكانی ئاسایشی نەتەوەیی بەم شێوەیە دەست نیشان بكەین:

**١ ـ ڕێژەیی بوون:**

دەوڵەت ناتوانێت بە تەنیاو بە شێوەیەكی ڕەها ئاسایشی خۆی دابین بكات، بەبێ ئاسایشی دەوڵەتانی تر، بۆیە پێویستی بە دابین كردنی ئاسایشی نەتەوەیی خۆی لەگەڵ ئاسایشی دەوڵەتانی تر هەیە، ئەمەش وا لە چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی دەكات ڕێژەیی بێت، نەك ڕەها، بەم مانایەی كە ئاسایشی نەتەوەیی هاوكات هەم ڕەهەندی ناوەخۆییە و هەم ڕەهەندی دەرەكی هەیە، بۆیە ئاسایشی

هاوبەش پێویستیەکی نێونەتەوەییە. هەروەها بۆ تاك و دەوڵەتان وەك یەك ڕێژەییە (احمد قدور،٢٠٠٩: ص١٦-١٩) لە جیهانی ئەمڕۆدا ئاسایشی ڕەها بوونی نییە، لەبەر ئەوەی هێز کە بنەمای بەدەستهێنانی ئاسایشە بگۆڕە و ڕێژەییە، لە ئەنجامدا دەتوانین بڵێین ئاسایش ڕێژەییە، بەم هۆیەوە بە گۆڕانی هێز و هەڕەشە، دەوڵەتان ناتوانن ئاسایشی ڕەهایان هەبێت (**کاظمی**،١٩٩١: ص١١٥-١١٦).

## ٢- زەینی بوونی ئاسایش:

هەست کردن یان نەکردن بەئاسایش پرسێکی زەینییە، چونکە ئەو هەستکردنە پەیوەندی بەهێزی دەوڵەت هەیە کە بەشێوەیەکی ڕاستەقینە یان ناڕاستەقینە لە بەرز و نزمی دایە، چونکە کاتێك دەوڵەت لەلایەن دەوڵەتێکی تر هەڕەشە و دەستدرێژی لێدەکرێت، لەوکاتە دەوڵەت هەستی نەبوونی ئاسایشی بۆ دروست دەبێت و هەروەها لەکاتی بارگرژی نێونەتەوەیی و ناوچەیی دا دەوڵەتان هەست بە نەبوونی ئاسایش دەکەن، هەندێ جاریش ئەو هەڕەشانە خوێندنەوەی ناڕاستیان بۆ دەکرێت، هەستکردن بە نەبوون یان بوونی ئاسایش پەیوەندی بەجۆری بیرکردنەوە و ڕوانگەی دەسەڵاتداران یان هاووڵاتیانەوە هەیە، هەندێ جار ئەو ترسەی هاووڵاتیان، دەوڵەتان بەکاری دێنن و گەورەی دەکەنەوە لە بەرژەوەندی خۆیان، بۆئەوەی ئەو کێشە ناوەخۆییانە بشارێتەوە و هاووڵاتیان ئاراستەی بوار و ڕەهەندی تر بکات و یان بە پێچەوانەوە (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٢٧-٢٨). بەمانایەکی تر لەبنەڕەتدا هەستکردن بە ئاسایش یان نەبوونی ئاسایش ڕوانگە و تێگەیشتنێکی زەینییە کە ڕیشەکەی لە بیروباوەر و کەلتوور و ڕەوشتی هاووڵاتیان و نوخبە و ڕێبەرانی دەوڵەت دایە، ئەنجامەکەشی دەبێتە هۆی ئەوەی دەوڵەت، دەوڵەتێکی بە دۆست یان دوژمن بزانێت (**کاظمی،١٩٩١: ص١١٥-١١٦**).

**٣- ئەگەری گۆڕانکاری:**

چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی چەمکێکی گۆڕاوە واتە بەپێی کات و شوێن گۆڕانی بەسەردا دێت، ناکرێت ئەم چەمکە چەق بەستوو بێت، بەڵکو بەپێی بارودۆخ و مێژوو و هەروەها فاکتەرە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان هەڕەشە و مەترسیەکان کە ڕووبەڕووی دەوڵەت دەبێتەوە، وا دەکات تێگەیشتن بۆ ئاسایشی نەتەوەیی گۆڕانی بەسەر دا بێت و بەم پێیەش ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی دەگۆڕێت.

**٤- ڕوونی و ئاشکرایی چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی:**

پێویستە چەمکی ئاسایش ڕوون و ئاشکرا بێت لەلای هاووڵاتیان، هاوڵاتی متمانەی ڕاستەقینەی پێی هەبێت، بە هۆشیاریەوە پابەندی بێت، لەم دۆخەدا هاووڵاتی دەبێتە کۆڵەگەیەك بۆ دامەزراوەکانی ئاسایش لە جێ بە جێ کردنی ئەرکەکانی ئاسایش، هەروەها بۆشایی لەنێوان دامەزراوەکانی ئاسایشی دەوڵەت یان بێ متمانەیی پێیان لەلایەن تاك و گروپە کۆمەڵایەتیەکان دەبێتە هۆی سەرنەکەوتنی ئەم دامەزراوانە لە ئەرکەکانیان و لەمەش گرنگتر دەبێتە هۆی نەبوونی ئاسایش و دوا جار تاك و گروپەکان دەکەونە دژایەتی ئاسایش.

**٥- ڕوون بوونی هەڕەشە و مەترسیەکانی ئاسایش:**

پێویستە ستراتیژیەتی دەوڵەت بۆ ئاسایش بەڕوونی دیاری بکرێت، ناوەرۆکەکەی ڕوون بێت و هەرەشەو مەترسیەکان دیاری بکرێت بە شێوەیەك هاووڵاتیان تێبگەن، چونکە هاووڵاتیان بەشدار دەبن لە دابین کردنی ئاسایشی نەتەوەیی، بۆیە شاردنەوە و ناڕوونی وادەکات هاووڵاتیان گومانیان هەبێت، لە ویست و ئامانجی دەزگاکانی ئاسایش و لەلایەکی ترەوە چونکە ئاسایشی نەتەوەیی پەیوەندی بەبگۆڕەکان و فاکتەر و ڕەگەزە چەسپاوەکان هەیە، بۆیە پێویستە هاووڵاتیان و دەوڵەتیش ئەم ڕەگەز و فاکتەرە چەسپاو و بگۆڕانە دیاری بکەن، کە ئاسایشی نەتەوەیی لەم دوو جۆرە فاکتەر و ڕەگەزە چەسپاو بگۆڕانە پێکدێت و ناکرێت دەوڵەت واز لە بنەما بنەڕەتی و

چەسپاوەکان بێنێت، بۆ نمونە پاراستنی گیانی سیاسی و سەربەخۆیی و سەروەری دەوڵەت یان ماف و ئازادییەکانی تاك و گروپەکان یان سەقامگیری دەوڵەت و پاراستنی لە هەڕەشە و مەترسییە دەرەکیەکان، بەڵام بەپێی هەل و مەرج و کۆمەڵێك فاکتەری نوێ وەکو بگۆر دێتە ناو ئاسایشی نەتەوەیی وەکو مەترسیەکانی ژینگە و تیرۆر و نەخۆشی و ... هتد.

٦- گشتگیربوونی ئاسایشی نەتەوەیی: پێویستە ئاسایش لە دەوڵەت دا بەوپێیەی کە ئاسایشی نەتەوەیی گشتگیرە، دەبێت لەسەر ستراتیژیەتێکی گشتگیر بونیاتبنرێت، بەم مانایەی کە ئاسایشی نەتەوەیی بەجەخت کردنەوە لەسەر ڕەگەزەکانی هێزی دەوڵەت بەشێوەیەك کە ئەم ڕەگەزانە ببنە کۆڵەگە بۆ ئاسایشی نەتەوەیی و پاراستنی ئاسایش و سەربەخۆیی و یەکپارچەیی دەوڵەت و ئەم جۆرە لە ئاسایش تەنیا لەسەر هێزی سەربازی بنیات نانرێت، بەڵکو هەموو ڕەگەزەکانی تری وەك ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی، کەلتووری و ... هتد، دەگرێتە خۆ (احمد قدور، ٢٠٠٩: ص١٦-١٩).

**٣-١-٤- ئامانج و بنەماکانی ئاسایشی نەتەوەیی:**

هەوڵی دەوڵەت بۆ دابینکردنی ئاسایشی نەتەوەیی ئامانجدارە، چونکە هەر دەوڵەتێك بیهەوێت ئاسایشی نەتەوەیی ڕاستەقینە دابین بکات دەبێ ئامانجی پاراستنی پایەکانی دەوڵەت بێت، گرنگیش بەو بنەمایانە بدات کە دەتوانێ ببێتە بنەمایەکی پتەو بۆ ئاسایشی نەتەوەیی.

بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت ئامانجەکانی ئاسایشی نەتەوەیی بەم شێوەی خوارەوە دابەش بکەین:

١- پاراستنی سەربەخۆیی و یەکێتی خاك (هەرێم).

٢ - وەدیهێنانی سەربەخۆیی و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان و پاراستنی سەقامگیری دەوڵەت.

٣- پاراستن و پەرەپێدانی بەرژەوەندییە نەتەوەیی و بیروباوەرە جیاکان.

٤- فەراهەم کردنی هەل و مەرجێك کە تیایدا هاوولاتیان هەست بە ئاسایش و ئارامی بکەن و دڵنیا بن لە بەرامبەر هەرەشە و مەترسیەکان. لەلای زۆربەی دەوڵەتان مانای سەرەکی ئاسایشی نەتەوەیی بریتییە لە پاراستنی سەربەخۆیی و یەك پارچەیی خاك و پاراستنی شێوەی ژیانی نەتەوەیی و رێگرتن لە دەست تێوەردانی دەرەکی، کەواتە ئاسایشی نەتەوەیی لە پلەی یەکەمدا خۆپاراستنە لە هەرەشە و مەترسیە دەرەکییەکان بە مەبەستی سەربەخۆیی سیاسی، هەروەها پاراستنی بەها باڵا کلتووریەکان و دوورکەوتنەوە لە ترس و دڵەڕاوکێ چ دەرەکی بێت چ ناوەخۆیی، ئەوەش وا لە دەوڵەتان دەکات کە پانتایی ئاسایشی خۆیان بەر فراوان بکەن، بەگشتی تا مەترسی و هەرەشەی دەرەکی بەردەوام بێت ئەوا مەترسی لەسەر ئاسایشی ناوەخۆیی دەوڵەت دەبێت (رەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٣٢). لەلایەکی ترەوە مەبەست لە بنەما سەرەکییەکانی نەتەوەیی ڕەهەندە ماددی و نامادیەکانە کە ڕەهەندی ماددی بریتییە لە پاراستن و پارێزگاری لە یەکپارچەیی دەوڵەت (هەرێم) سەربەخۆیی، پێشکەوتن، ئابووری و ... هتد.

ڕەهەندی نامادديش بریتییە لە پاراستنی بەهاو بنەما و ڕەگەزەکانی کلتووری و ئامانج و ئایدیا نەتەوەییەکان، ئامانجە نەتەوەییەکانیش بریتین لە مەبەستە ئاشکراو دیاری کراوەکان کە وێنای داهاتووی کۆمەڵگە دەکەن و لەسەر بنەمای دەستەبەرکردن و وەدیهێنانی بەرژەوەندیە نەتەوەییەکان دەتوانین بە ئامانجە نەتەوەییەکان پێناسە بکەین بەم مانایە کە هەموو ئامانجەکان و مەبەستەکانی بنەڕەتی نەتەوەیەك کە تەواوی سیاسەتەکان بەم ئاراستەیە دەڕوات، هەموو تواناکان و هێزی دەوڵەت بۆ دەستەبەرکردن و بەدیهێنانی بەکار دێنن (تاجیك،٢٠٠٢:ل١٦٩).

هەروەها بەهاکان و پێوەرەکانی نەتەوەیی بریتین لە کۆمەڵە بنەمایەك کە کۆمەڵگا لەسەری ڕێککەوتوون، دەتوانین بە بەهاو پێوەرە نەتەوەییەکانی ئەو

کۆمەڵگەیە یان نەتەوەیە دابنێین، کە ئەم بنەمایانەش دەرهاوێشتەی کەلتوور، پەروەردە، بەکۆمەڵایەتی بوون و ئاڵوگۆری ئەزمونە کەسی و کۆمەڵایەتیەکانن کە پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ ئامانجە نەتەوەییەکان هەیە (رەوشە،٢٠٠٠:ل٧٥).

دەوڵەت بۆ بەدەستهێنانی هێز و ئاسایشی نەتەوەیی خۆی پێویستی بە چەند ڕەگەزێکە کە لە خۆیدا بەرجەستە بکات و کاریگەرییان لەسەر دەوڵەت هەیە وەکو:

١- ڕەگەزە سروشتی و ژینگەییەکان: ئەم ڕەگەزە فاکتەری سروشتی و ژینگەییەکان دەگرێتەوە، بەم مانایەی کە هەموو ئەو ڕەگەز و فاکتەرانەی کە بە شێوەیەکی سروشتی و لەدەرەوەی ویستی مرۆڤ و لە چوارچێوەی جوگرافی و ژینگەیی لەیەکەیەکی سیاسی دا بوونی هەیە وەکو، کشتوکاڵ، سەرچاوەکانی کانزایی، وزە، هەروەها پێگەی هەرێمی و جیۆپۆلۆتیك و ... هتد.

٢- ڕەگەزی مرۆیی و کۆمەڵایەتی: ئەم ڕەگەزانە پەیوەندییان بە تایبەتمەندی ماددی و دەرونی مرۆیی تاکەکانەوە هەیە، وەکو: ڕێژەی دانیشتوان، تەمەن، ڕەگەز، خوێندەواری، هەروەها روحیەتی نەتەوەیی، هەڵسوکەوتی نەتەوەیی، یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی، سازانی کۆمەڵایەتی و فرەیی و ... هتد.

٣- ڕەگەزی ئابووری: ئەم ڕەگەزە پەیوەندی بە توانای ماددییەکانی هەر یەکەیەکی سیاسییەوە هەیە بەپێی توانای ئابووری سیستەمی ئابووری هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت، کە ڕێژەو ئاستی سەربەخۆیی پشت بەخۆبەستنی ئابووری یان پێچەوانەوە، هەڵسەنگاندنی بۆ دەکرێت لەسەر بنەمای بەرهەمهێنان، هەڵاوسان، وەبەرهێنان، قەبارەی، ئاڵوگۆری بازرگانی و ... هتد، تواناکانی پیشەسازی و تەکنەلۆژی ئابووری، هەناردە کردن و هاوردەکردن و ئاستی خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان و سەروەت و سامانی نەتەوەیی پێوانە دەکرێت.

٤- ڕەگەزی سەربازی : ئەم ڕەگەزە دەربڕی توانای هێزی چەکداری دەوڵەتێکە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، هێزە چەکدارەکان و توانای ڕێبەری و توانا تەکنەلۆژیەکانی سەربازی و بەرگری و چەك دەگرێتەوە، لەڕوانگەی

كلاسیكی ئاسایشی نەتەوەیی دا گرنگی زۆری هەبوو بۆ هێزی نەتەوەیی ئاستی توانای هەر دەوڵەتێك لە ڕووی سەربازییەوە، دەست نیشانكەری هێز و ئاسایشی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتە بوو، بەڵام بەهۆی گۆڕانكارییە دەرەكیی و ناوەخۆییەكان، گرنگی ئەم ڕەگەزە كە لە سەرووی هەموو ڕەگەزەكانی تری هێزی نەتەوەیی بوو بۆ ئاسایشی نەتەوەیی، گۆڕانی بەسەر داهات و بوو بە ڕەگەزێك لە تەنیشت یان هاوتەریبی ڕەگەزەكانی تری هێزی نەتەوەیی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی.

٥- ڕەگەزەكانی زانست و تەكنەلۆژیا: ئەم ڕەگەزە دەربڕی كۆمەڵێك لە توانای زاست وپیشەسازییە بۆ بەدیهێنانی ئامانجە نەتەوەییەكان بەكاردێت، ئەم ڕەگەزە بەم هۆیەوە گرنگە كە دەبێتە هۆی ئەوەی كە ڕەگەزەكانی تری هێزی نەتەوەیی باشتر و بەرز سوودی لێوەربگیرێ، بەم مانایە دەتوانێت ڕەگەزەكانی تری بە بەرزترین شێواز لە خزمەتی ئامانجە ئاسایشی و نەتەوەییەكان بەكار بێت، هەروەها ئاستی هەڕەشەكانی دەرەوە بەم ڕەگەزە پێوانە دەكرێت، بۆنمونە دەوڵەتانی جیهانی سێیەم و دەوڵەتانی پێشكەوتوو و پیشەسازی.

٦- ڕەگەزە سیاسییەكان: مەبەست لە ڕەگەزە سیاسییەكانی هێزی نەتەوەیی، ئەو دیاردە و فاكتەرانەن كە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، پەیوەندی بەتایبەتمەندییەكانی سیستەم یان ڕژێمی سیاسی لە یەكەیەكی سیاسی دا هەیە، لەسەر ئەم بنەمایانە دەسەڵاتی ناوەخۆیی و سەربەخۆی دەرەكی هەر دەوڵەتێك هەڵدەسەنگێنرێت، ڕەگەزەكانی سیاسی هێزی هەر دەوڵەتێك دابەشدەكرێتە سەر سیاسەتی ناوەخۆیی و سیاسەتی دەرەكی و دەتوانرێت لە پێكهاتەی سیاسی سیستەم، ڕەوایەتی، یەكپارچەیی و توانای سیاسی سیستەم، دیبلۆماسی ئەو دەوڵەتەدا بەرجەستە بێت، لێرەوەیە كە سیستەمی سیاسی و دیموكراتیك یان نادیموكراتیك و كاریگەریەكانی لە ناوەخۆ و دەرەوە و كاریگەری لەسەر هێزی نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەیی دەردەكەوێت.

٧- ڕەگەزەکانی کەلتووری و ئایدۆلۆژی: ئەمرۆکە گرنگی ئەم ڕەگەزە زۆر گرنگ و بەرچاو بووە، تەنانەت هەندێ زانا وەکو (هانتینگتۆن) بروایان وایە کە ململانێ و جەنگەکانی داهاتوو لەسەر جیاوازی کەلتووری و ئایدۆلۆژی دەبێت، تایبەتمەندییەکانی کەلتووری هەر یەکەیەکی سیاسی چ کەلتووری گشتی و چ کەلتووری سیاسی و ڕوانگەی ئایدۆلۆژی هەر کۆمەڵگە و سیستەمێکی سیاسی ڕۆڵی دیار و دەستنیشانکەری لە پاراستن یان هەرەشەکردن و کەوتنە بەر مەترسی پێگەی هەر دەوڵەتێك هەیە و دۆست و دوژمن لەسەر ئەم بنەمایانە دیاری دەکرێت، بۆ نمونە: ئایدۆلۆژی توندوتیژی ئایینی یان لیبراڵ و دیموکراتیك، کە کاریگەری زۆری لەسەر ئاسایش و تواناکان و ململانێکان و چۆنییەتی تێگەیشتن و ڕوانین بۆ پرس و بابەتە جیاوازەکان و یان تێگەیشتن لەهەرەشە و مەترسی و هاوکاری و ... هتد، هەیە کە ئەمرۆ ئێمە ئەمە بە ڕوونی دەبینین.

٨- ڕەگەزە پەیوەندی و دیپلۆماسییەکان: ئەم ڕەگەزە لە نوێترین ڕەگەزەکانی هێزی نەتەوەییە، هەر یەکەیەکی سیاسی بەتایبەت بەهۆی گۆڕانکاری و شۆڕشەکانی زانیاری و تەکنەلۆژیا و پەیوەندی بە پرسەکانی بەجیهانی بوون، هەم لە ڕووی خێرایی و هەم لە ڕووی ڕۆڵ و کاریگەری لەسەر پەیوەندی و پێکەوە بەستراوە بوونی ژینگەی ئاسایشی ناوەخۆیی و دەرەکی، لێرەوە تواناکانی تەکنەلۆژی و پەیوەندی و ئاستی دەستپێڕاگەیشتنی بە زانیارییەکان و توانای ئەکتەر لەئاستی کۆمەڵگەیی زانیاری جیهانی، دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی هێز و توانای نەتەوەیی، بوار بۆ سوود وەرگرتن لە ڕەگەزەکانی هێزی دەوڵەت فەراهەم دەکات، کە ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەر دەوڵەتێك هەیە لەم سەردەمەدا کە بەسەردەمی بەجیهانی بوون ناسراوە(خلیلی،٢٠٠٣:ل٤٣٨-٤٤٠).

### ٤-١-٤- هەڕەشە و مەترسییەکانی ئاسایشی نەتەوەیی:

لەسەردەمی ئێستادا سەرچاوەکانی دەسەڵات فرە و جۆراوجۆرن وەکو سەرچاوەی کەلتوور، زمان، پەیوەندییەکان و ... هتد، کە وەك سەرچاوەی دەسەڵات هەژمار دەکرێت، لێرەوە بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی نەتەوەیی و بەرگری کردن لە هەمبەر هەڕەشە و مەترسییە نوێیەکان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی، دەبێت دەوڵەت ڕەچاوی ئەم ڕەگەزو فاکتەرانە بکات بۆ گەرەنتی کردنی ئاسایشی ناوەخۆ و دەرەکی (بشیریە،٢٠٠٩ص١٢٥) .

بەشێوەیەکی گشتی هەڕەشە لە ئاسایشی دەوڵەت تەنیا بەهۆی هەڕەشەی دەرەکی، یان دەستێوەردانی سیاسی و سەربازی دەوڵەتانی دەرەکی نییە، بەڵکو هەڕەشەکانی ناوەخۆ کاریگەری بەرچاویان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە وەك: سەرهەڵدانی بزوتنەوەی چەکداری، دواکەوتوویی ئابووری، ناسەقامگیری بەهۆی ناکۆکی نەتەوەیی، ئایینی، هەژاری، جیاکاری کۆمەڵایەتی، پاشکۆیەتی، بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بەهۆی نەبوونی تەندروستی و ... هتد، دەبێتە هەڕەشەیەکی بەرچاو بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی، هەروەها لە ئێستادا بەردەوام هاووڵاتیان گوشار دەخەنە سەر سیستەم بۆ باشتر کردنی ژیانیان (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٢٢٢). یەکێك لە مەترسیەکانی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی بریتییە لە پێکدادانی نێوان گروپە نەتەوەیی و ئیتنیکی و ئایینییەکان کە بەردەوام ڕووی لە زیادبوون دایە، بەتایبەت لە دەوڵەتانی هەژار و دواکەوتوو و نادیموکراتیك، هەرچەندە بوونی فرە ئایینی، نەژادی، کەلتووری، شتێکی ئاساییە لەهەر دەوڵەتێك هەبێت، ئەمە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندی و بەهێز بوونی ئەو دەوڵەتە، بەڵام بەهۆی جۆری سیستەمی سیاسی (دیموکراتیك یان نادیموکراتیك) چۆنییەتی مامەڵە لەگەڵ ئەم جۆرە فرەییە، دەبێتە هۆی هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی و ناسەقامگیری، یان دەبێتە هۆی ئاشتی و ئارامی و

پێکەوە ژیان و بەهێزبوونی دەوڵەت و لەکۆتایی پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٢٢٤).

بەگشتی هەڕەشەکانی ئاسایشی نەتەوەیی لەدوو ئاستی ناوەخۆی و دەرەکی بریتییە لە:

١- ناوەخۆی: بریتییە لە ناکۆکی نەتەوەیی، ئایینی، ڕەگەزی، چینایەتی، کەلتووری و ... هتد، پاشکۆیەتی ئابووری و سیاسی، هەروەها لێکترازانەکانی کۆمەڵایەتی و ژینگە و تەندروستی و هەژاری و نەخوێندەواری و ... هتد.

٢- دەرەکی: پەلاماری سەربازی یان دەستتێوەردان لەکاروباری ناوەخۆی دەوڵەت، یان پرۆپاگەندەی دەوڵەتان و یان پلانی دوژمنکارانەی بەبێ ڕەچاوکردنی یاساو ڕێسا نێونەتەوەییەکان (حوسێن،٢٠١٢: ص٣٢).

هەروەها بازرگانی مادەهۆشبەرەکان و مەترسییەکانی تایبەت بەنەتەوەیەك و ناوچەیەکی دیاریکراو نییە، تۆڕی بەرفراوانی گواستنەوە و گەیاندنی نهێنی و ئاشکرای ئەم جۆرە ماددانە دەتوانیت زیان بە هەموو نەتەوەیەك و بەگشتی مرۆڤایەتی بگەیەنێت، ئەمرۆ بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان و بەکارهێنانی تێکڕای جیهانی گرتۆتەوە، لەبەر ئەوەی بەرهەمهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەم ماددانە بەهۆی تۆڕێکی جیهانییەوە جێ بە جێ دەکرێت، ژمارەیەکی زۆر کۆمپانیای دەرمانی و کیمیایی، گروپە مافیای نێونەتەوەیی و ناوچەییەکان و تەنانەت دەسەڵاتداران بەرپرسانی ژمارەیەك لە دەوڵەتان تێیدا بەشدارن، بۆیە بەربەرەکانی کردنی دیاردەیەك کە هەرەشە لە ئاسایش و هێمنی جیهان دەکات پێویستی بەهاوکاری کردن و هەنگاوێکی جیهانی هەیە دەوڵەتان بەتەنیا ئەو توانایەیان نییە (سلێمان حسێن،٢٠٠٧: ل٢١). بەگشتی پرسی ماددە هۆشبەرەکان دەوڵەتێك یان ناوچەیەك ناگرێتەوە، بەڵکو وەکو تۆڕێك بۆ بەرهەم هێنان، گواستنەوە و دابەش کردن، هەموو دەوڵەتانی جیهان دەگرێتەوە (**بصیری،٢٠١٣: ص١٧٠**) ئەمە جگە لە مەترسی هێرشەکانی سایبری و کۆچ و

پیسبوونی ژینگە و ئاووهەوا و نەخۆشیەكان و هەژاری و ... هتد، كە ڕەهەندی نێونەتەوەییان هەیە.

## ٤-٢- ڕوانگە سەرەكییەكانی ئاسایشی نەتەوەیی:

بەشێوەیەكی گشتی دەتوانین ڕوانگەكانی ئاسایشی نەتەوەیی بەسەر چەند ڕوانگەیەكی سەرەكییدا دابەش بكەین. كە لێرەدا هەوڵ دەدەین باس لە ئەو ڕوانگانە بكەین.

### ٤-٢-١- ڕوانگەی مۆدێرن بۆ ئاسایشی نەتەوەیی:

ئاسایش دەگەرێتەوە بۆ مێژووی مرۆڤ، كە پارێزگاری كردن لە مانەوە و بوونی یەكەم ویست و دڵەڕاوكێی مرۆڤ بوو، بەڵام بەهۆی پەیوەندی توندو تۆڵی ئاسایش و مرۆڤ لەگەڵ ئاسایشی دەوڵەت لەدوای دروست بوونی دەوڵەت نەتەوەكان، پارێزگاری و مانەوە لە ئاستی مرۆڤ و تاك گۆڕا بۆ پارێزگاری كردن لە مانەوە و بوونی دەوڵەت نەتەوە، لێرەوە كەچەمكی ئاسایش گۆڕا بۆ ئاسایشی نەتەوە لێرەوە مانەوە و بوونی دەوڵەت بوو بە چەقی چەمك و پێناسەكان لە ئاسایش (خلیلی،٢٠٠٨:ل٤٩٩). لەدەوڵەت نەتەوەكان لەسەر بنەمای سەروەری و لە چوارچێوەی سنوورە نەتەوەییەكان كە بنەمای پێناسەیەكی نوێ بۆ ئاسایش لەسەر بنەمای بەدەستهێنان و زیاتر كردنی هێز و توانای بوو، بووە هۆی نا ئارامی لەئاستی نێونەتەوەیی بەهۆی ئەو ململانێ و كێشەو گرفتانەی لەسەر هێز ( بەتایبەت سەربازی ) ڕووی دا، لێرەوە پێویستی دووبارە پێناسەكردنی چەمك و تێگەیشتن لە چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی هاتەئاراوە، چونكە سەروەری نەتەوەیی لە چوارچێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە، دەرئەنجامی ڕوانگەیەكی ریالستی لە مرۆڤ و كۆمەڵگا بوو، كە هەوڵیان دەدا لەم چوارچێوەیەدا هێز و توانای نەتەوە زیاتر و

زیاتر بکەن، بەمەبەستی دەستەبەرکردنی ئاسایش کە ئەمەش بووە هۆی توندوتیژی و ململانێ.

لێرەدا ڕوانگەکانی ئایدیالیستی و ئینتەرناسیۆنالیستی دەربڕی سیاسەتی ئەخلاقی و بەهای مۆدێرنە، لەسەر بنەمای سەروەری بۆ مرۆڤ، کە بوونە بنەمای ئاسایش لەرێگەی هاوکاری نێونەتەوەیی، کە لەسەر ئەفکاری (گرۆشیۆس) و (کانت) دامەزرابوو، کە لەم ڕوانگەیەوە دەبووە هۆی ئاشتی و ئاسایش (قاسمی،١٩٩٣:ل٦٢). ئەگەر پاراستن و پارێزگاری کردن لەمانەوە، ناوەندی پێناسە و چەمکی ئاسایش بێت، لێرەوە پێناسەی ئاسایش بە ڕوانگەیەکی نەرێنی لەسەر بنەمای ڕزگاربوونە لەهەر جۆرە هەڕەشەیەك (خلیلی،٢٠٠٣:ل١٧). ئەم پێناسەکردنە یان شیکردنەوەی ئاسایش، لەسەر نەبوونی هەڕەشەی دەرەکی جەخت دەکاتەوە و ئاسایش بە نەبوونی ئەو هەڕەشەیە وێنا دەکرێت، کە خۆی دەتوانێت سەرچاوەی نەبوونی ئاسایش بێت. هەرچەندە ئەم پێناسەکردنەی ئاسایشی نەتەوەیی ڕەهەندی ئەرێنی هەبوو، بەڵام بۆخۆی بوو بە سەرچاوەی نائارامی (نەبوونی ئاسایش) لەبەر ئەوەی ئەوەندەی کە بەدەستهێنانی هێز و توانا دەبووە سەرچاوەی ئاسایش، لەلایەکی تریشەوە دەبووە هۆی ململانێ و کێشەو نائارامی (جلیلی،٢٠٠٨:ل٥٠٢).

ئاسایشی نەتەوەیی نوێ لە ئەنجامی کەم و کورتی و ئاڵۆزی و ناڕوونییەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کلاسیك و هەوڵەکانی چەندین زانا هاتنەئاراوە، بەپێی ڕووداو پێشهات و ئاڵوگۆڕە جیهانییەکان و ناوەخۆییەکان، خوێندنەوەی نوێ بۆ ئاسایشی نەتەوەیی بوو بە پێویستی دەوڵەتان. پێناسە کردنی ئاسایش لەسەر بنەمای نەبوونی هەڕەشە، بەمانای (ئاسایش لە) (Security from) هەڕەشەی دەرەکی بوو بۆ تەرکیز لەسەر بەرگری کردن لە هەمبەر هەڕەشە دەرەکییەکان بوو، بەڵام بەهۆی گۆڕانکارییەکان لە دەوڵەت نەتەوە و چەمکی سیادە (سەروەری) و بەرژەوەندی نەتەوەیی ئەوە هێز و توانا بوونە ناوەندی پێناسەکردنی ئاسایشی

نەتەوەیی، ئەم ڕوانگە ئەرێنییە بۆ ئاسایش بەمانای (ئاسایش بۆ) ( Security to)، پەرەپێدان و خۆشگوزەرانی و ئازادی هاتە ئاراوە لێرەدا رزگاربوونێکی ڕێژەیی لە هەڕەشەکانی دەرەکی کە زۆرتر سەربازی بوون گۆڕدرا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر جۆرە هەڕەشەو مەترسیەکی ناوخۆیی و دەرەکی، ئاسایش هاوتای گەشەپێدان و پەرەسەندن، خۆشگوزەرانی و رەفا و ... هتد، دانرا کە هەموویان دەربری هێز و توانای نەتەوەیی دەوڵەت و دەوڵەتێك یان نەتەوەیەکە (میسرا،١٩٨٨ :ل٣٤٥).

گۆڕانکاریەکانی بواری ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەت دوای ساڵی (١٩٩٠)ـی زایینی وای کردووە کە کۆمەڵێك دەرهاوێشتەی لێبکەوێتەوە کە بریتین لە:

١- چەمکی ئاسایشی دەوڵەت بۆ ئاسایشی گروپەکان و تاکەکان پەرەبستێنێت.

٢- چەمکی ئاسایش لە ئاسایشی دەوڵەتان بۆ ئاسایشی سیستەمی نێونەتەوەیی یان ژینگەی سەروو نەتەوەیی بگۆڕێت.

٣- چەمکی ئاسایش بەشێوەی ئاسۆیی و فرەیی دەگۆڕێت بەم مانایەی کە ئاسایشی (تاکەکان، نەتەوەکان و سیستەمەکان) بە یەك شێوە و یەك ئامراز ناپارێزرێت، چەمکی ئاسایش لە سەربازیەوە بۆ سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و ژینگەیی و ئاسایشی مرۆیی فراوان بکرێت.

٤- بەرپرسیارەتی سیاسی بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایش گەشەی سەندووە و لە بواری بەرفراوان وەکو دەوڵەت نەتەوەکان بەرەو سەرەوە وەکو دامەزراوە نێونەتەوەکان هەروەها بەرەو خوارەوە وەکو سیستەمی ناوچەیی یان رێکخراوە ناحکومیەکان، ڕای گشتی و گروپەکان گوشار و بازار بڵاودەبێتەوە (عباس زادە،٢٠١١ :ل٣٣). لەم ڕووەوە دەتوانین بڵێین:

١- ڕوانگەی نوێ بۆ ئاسایشی نەتەوەیی بەپێچەوانەی ڕوانگەی کلاسیك تەنیا لەسەر نەبوونی هەڕەشە ڕانەوەستاوە، بەم مانایەی کە ڕوانگەی نوێ

لەجیاتی ئەوەی لەسەر ڕوانگەی نەریتی بۆ ئاسایش کە ئاسایش لە نەبوونی هەڕەشەو مەترسی پێناسە دەکرا، لەسەر بنەمای ڕوانگەی ئەرێنییە، کەجگە لە نەبوونی هەڕەشە، لەسەر ئاستێك لە متمانەیی و دڵنیایی بۆ بەدیهێنان و پاراستنی بەرژەوەندیە نەتەوەیەکان جەخت دەکاتەوە، هەربۆیەش (ڕۆبێرت ماندیل ) متمانەو دڵنیایی دەبەستێتەوە بە(هەستی ئازادی لە ترس و دڵەڕاوکێ) یان (هەستی دڵنیایی و متمانە) کە هەردوو ڕەهەندی ماددی و دەرونی یان نامادی دەگرێتەوە (ماندێل،١٩٩٨:ل٤٤).

٢- بەپێچەوانەی ڕوانگەی کلاسیکی، لە ڕوانگەی نوێدا ئاسایشی نەتەوەیی چیتر تەنیا سەربازی نییە، بەڵکو ئاسایشی نەتەوەیی چەمکێکی فرە ڕەهەندە، کە ڕەگەزی سەربازی تەنیا یەکێکە لە ڕەگەز و ڕەهەندەکانی هەر وەکو (باری بۆزان) دەڵێت: ((ئاسایشی کۆمەڵگەکانی مرۆیی بەسەر چەند بابەتی سەرەکییدا دابەشدەکرێت، وەك: سەربازی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ژینگەیی)). لەم ڕوانگەیەوە ڕەگەز و ڕەهەندەکانی هەڕەشەو مەترسی بۆ سەربازی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ژینگەیی وەکو ڕەگەز یان ڕەهەندەکانی ئاسایشی نەتەوەیی هاتونەتە ئاراوە (بۆزان،٢٠٠٠:ل٣٤).

٣- بەپێی چەند ڕەهەندی بوونی ئاسایشی نەتەوەیی لە ڕوانگەی نوێدا، چیتر جەنگ گۆڕەپانی پێکدادانی یان ڕووبەڕووبوونەوە یان گۆڕەپانی شکست و دۆڕاندن و یان هەڕەشە و مەترسی یان دڵنیایی نییە، بەڵکو بوار و زەمینە و ڕەهەند و ڕەگەزی تر و گۆڕەپانی ترئاسایش یان نەبوونی ئاسایش دیاری دەکەن، ماددی بێت یان نامادی بێت، یان ناوەخۆی یان دەرەکی، یان دەرفەت و هەڕەشە و مەترسی بێت (خلیلی،٢٠٠٣: ص٤٤٣).

٤- لەڕوانگەی نوێی ئاسایشی نەتەوەییدا، جگە لە گرنگیدان بە هەڕەشەو مەترسیە دەرەکیەکان، گرنگی بەهەڕەشەو مەترسیە ناوەخۆییەکانیش دەدرێت، وەکو فاکتەری کاریگەر لەسەر نەبوونی ئاسایش یان بوونی ئاسایش، لێرەدا

گرنگی بە سەقامگیری سیاسی، توانای ئابووری و تەکنەلۆژی دەوڵەت، سیستەمی کۆمەڵایەتی و سیستەمی سیاسی دیموکراتیك و یەکگرتوویی و بەهاکانی دیموکراتیك و سەرمایەی کۆمەڵایەتی، ڕەوایەتی سیتەمی سیاسی و ... هتد، دەدرێت، لێرەدا دابین کردنی پێویستە ماددی و ناماددییەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا یان پاراستنی بەهاکانی خودی کۆمەڵگا دەبێتە پێوەر بۆ ئاسایشی نەتەوەیی (تاجیك،٢٠٠٢: ص٤١)

٥- بەپێی گۆڕانکاری لە ڕوانگەی سەربازی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی و هاتنەئارای ڕەهەند و ڕەگەزی ناسەربازی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی لەڕوانگەی نوێدا، گرنگی دەوڵەت وەکو تاکە سەرچاوەی پاراستنی ئاسایشی کۆمەڵگا، لاواز بوە یان کەمتر بۆتەوە، لێرەوە مۆدێلی ئاسایشی نەتەوەیی تەنیا دەوڵەتێکی بەهێز نییە، بەڵکو لەهەلّ و مەرجی نوێدا گرنگی دەوڵەتان وەکو تاکە بکەر یان ئەکتەری ئاسایشی نەتەوەیی بەهۆی گۆڕانکاری لە بوار و بابەتەکان وەکو سنوورە نەتەوەییەکان لە ڕێگەی ئامرازە نوێیەکانی پەیوەندی و هەروەها گرنگی ڕای گشتی و ڕەزامەندی هاووڵاتیان یان ڕەوایەتی سیستەم، هەروەها زاڵبوونی ئایدیای (دەوڵەت لانی کەم) وایکردووە کە هێز و گروپە کۆمەڵایەتیەکان و گروپەکانی مەدەنی لە ئاستی ناوخۆ و ڕێکخراوە سەروو نەتەوەییەکان و بزوتنەوە کۆمەڵایەتیەکان لەئاستی نێو نەتەوەیی، لەپاڵ دەوڵەت ببنە بابەت و سەرچاوەی ئاسایشی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی (خلیلی،٢٠٠٣: ص٤٤٤).

٦- لە ڕوانگەی کلاسیك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی زیاتر و زۆرتر لەسەر بنەمای ڕۆژئاوایی و بەتایبەت لەسەردەمی جەنگی سارددا بەپێی پێکهاتەی سیاسی، تەکنەلۆژیا، کۆمەڵایەتی و... هتد، ڕۆژئاوایی بوو، بەلاّم هەڕەشە و مەترسیەکانی دەوڵەتانی جیهانی سێیەم یان باشوور فرە ڕەهەندن (**ئاذر واین مون،١٩٩٨: ص٥٨**).

٧- گۆڕانکاریەکانی بواری ئاسایش و گۆڕان لە ڕوانگەی نەریێنی ئاسایش بۆ ڕوانگەی ئەرێنی لە ئاسایشی نەتەوەیی نوێدا وای کردووە، کۆمەڵێك بابەت و چەمکی نوێ بێتە ناو خوێندنەوە و شیکردنەوەی ئاسایشی نەتەوەیی وەکو: ڕەوایەتی، یەکپارچەیی، یەکگرتوویی و توانای سیاسی (ئاذر واین مون،١٩٩٨: ص٣٩).

**٢-٢-٤- ڕوانگەی پۆست مۆدێرن بۆ ئاسایشی نەتەوەیی:**

لە کۆتایی سەدەی بیستەم شەپۆلێکی نوێ بۆ دیراسەتی ئاسایشی نەتەوەیی، کە ڕوانگەیان بۆ ئاسایشی نەتەوەیی لەسەر بنەمای گۆڕانکاری لە گوتار و زمان هاتە ئاراوە، گوتار یان ڕوانگەی پۆست مۆدێرن دەربڕی ڕەتکردنەوەی ڕاستی ڕەهایە، کە ریالیزم ڕەتدەکاتەوە (**نوذری،٢٠٠١:ل٢٩**). ڕوانگەی پۆست مۆدێرن لەسەر بنەمای گوتاری ئاسایشی ئەرێنییە، بەڵام بەهۆی ڕەتکردنەوەی ڕۆڵی دەوڵەت نەتەوە لەپرسی ئاسایشی نەتەوەی دا، جیاوازی لەگەڵ هەر دوو ڕوانگەی کلاسیکی و نوێدا هەیە (افتخاری،٢٠٠٠:ل٣٤).

لە ڕوانگەی نوێی ئاسایشی نەتەوەیی، بەپێی ڕەگەز و ڕەهەندەکانی سەربازی، ئابووری، کۆمەلایەتی، ژینگەیی هەڕەشەکان باس لە ڕەگەز و ڕەهەندی جیاوازی ئاسایش دەکرێت، کە ئەم ڕەگەزانە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ پاراستن و مانەوەی خۆی وەکو گرنگترین بابەتی ئاسایشی نەتەوەیی گرنگی پێدەدرا، بەڵام لە ڕوانگەی پۆست مۆدێرن دا لەجیاتی باس لە تاك ڕەگەزی یان فرە ڕەگەز بوونی ئاسایش یان سەروو تری یان خوارووتری ئەم ڕەهەندە یان ڕەگەزانە بکرێت، سەرچاوەی ئاسایش لە دەوڵەت دەسەندرێتەوە و چیتر دەوڵەت بابەتی ئاسایش نییە، چونکە لەم ڕوانگەیەدا دەوڵەت لەبری ئەوەی کە پارێزەری ئاسایش یان سەرچاوەی ئاسایش بێت ئەوە مەترسی دروستکەرە، یان خۆی سەرچاوەی هەڕەشە و مەترسییە نەك ئاسایش. بەپێی ڕوانگەی پۆست مۆدێرن، زمان و گوتار دروستکەر و بنیاتنەری هەموو شتێکە و هیچ ڕاستییەك لە دەرەوەی زمان و گوتار مانادار نییە، بکەر یان ئەکتەرەکان لە

چوارچێوەی زمان و گوتاردا پەیوەندی پێکەوە گرێ دەدەن و بۆیە پەیوەندییەکانیان لەسەر بنەمای ململانێ و کێبڕکێ و شکست و سەرکەوتن نییە بەڵکو لەسەر بنەمای هاوکاری و پەیوەندی دوولایەنە لە چوارچێوەی ڕێسای گەمە زمانییەکان دایە (خلیلی،٢٠٠٣،ل٤٤٦). بەپێی ڕوانگەی دژە ناوەندی پۆست مۆدێرن کە ڕەوایەتی لە دەوڵەت وەکو بابەت و سەرچاوەی ئاسایشی نەتەوەیی وەردەگرێتەوە، بەهۆی نەمانی سنوور و هەرێمی دەوڵەت کە دابەش کردنی بەپێی ناوەخۆ و دەرەکی دەکرد لەهەڕەشەو مەترسیەکاندا،ئەوە چیتر ئەو هەڕەشەو مەترسیانەش مانایان نییە و بێواتان (نوذري،**٢٠٠١:ل٢٩**).

هەرچەندە لە ڕوانگەی نوێی ئاسایشی نەتەوەیدا، گرنگی دەوڵەت کەم کراوەتەوە و لەپاڵ دەوڵەتدا وەکو گرنگترین بایەتی ئاسایشی نەتەوەیی باس لە بزوتنەوە نوێیە کۆمەڵایەتیەکان دەکرا ویان ڕۆڵی ڕێکخراوە ناحکومییەکان لەئاستی نەتەوەیی یان سەروو نەتەوەیی وەکو بابەتی سەرچاوەی ئاسایش هەژمار دەکرێت، بەڵام لە ڕوانگەی پۆست مۆدێرندا کە ڕەوایەتی لە دەوڵەت وەکو بابەت و سەرچاوەی ئاسایشی وەردەگیرێتەوە، ڕەهەندێکی کۆمەڵایەتی وەکو ڕەهەندو ڕەگەزەکانی تر وەردەگرێت، چیتر دەوڵەت وەکو سیمبولێ یان هێمای ناسنامەی نەتەوەیی ناناسرێت و پارت و کارەکانی پارتەکان لە سیستەمی سیاسیدا دەچێتە ژێر پرسیار و لەجیاتی ئەوان باس لە بزوتنەوەی نوێیە ناسنامە پێدەرە کۆمەڵایەتیەکان دەکەن و مرۆڤ دەبێتە سەنتەر (تاجيك،٢٠٠٠:ل٥٦-٥٧). ڕوانگەی مۆدێرن بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ڕۆژئاوایی بوو، بۆیە ئاسایشی پۆست مۆدێرن گشتاندن بۆ هەموو کەسێك و هەموو شوێنێك بۆیە ئاسایشی نەتەوەیی دەخاتە ژێر پرسیارەوە، لەجێگەی یەکسانی و تاقانەیی پرس و بابەتەکان، بڕوای بەوە هەیە کە هەر دەوڵەتێك پێناسەی تایبەت و تێگەیشتنی تایبەتی خۆی لە ئاسایش و هەڕەشە و مەترسی هەیە، بۆیە هیچ مۆدێل و پارادایمێکی تاقانە و یەکسان و هاوتا قبولێ ناکات (نصری،٢٠٠١:ل٤٨).

مەعریفەی پۆست مۆدێرنەکان مەعریفەیەکی زەینی ـ زمانییە، بەم مانایەی کە لە ڕوانگەی کلاسیکی ئاسایشی نەتەوەیی، ئاسایش بابەتێکی فیزیکی و عەینی و ماددی بوو و لە ڕوانگەی مۆدێرندا ئاسایش بابەتێکی عەینی و زەینی بوو، بەڵام لە ڕوانگەی پۆست مۆدێرن بابەتێکی زەینی ـ زمانییە، بەم مانایەی کە هیچ پەیوەندییەکی گەوهەری لە نێوان هێمای ئاسایش لەگەڵ ڕاستی دەرەوە بوونی نییە و تەنها هەر پەیوەندییەکی گرێبەستی و کاتییەکە لە چوارچێوەی گوتارە جیاوازەکان بوونی هەیە (تاجیك،٢٠٠٢:ل٣٢-٣٣).

### ٤-٣- ڕەهەندەکانی ئاسایشی نەتەوەیی:

ئاسایشی نەتەوەیی لە سەردەمی نوێ دا ڕەهەندەکانی جۆراوجۆرن، هەرچەندە لە سەرەتادا ئاسایشی نەتەوەیی سەرەکیترین و گرنگترین ڕەهەندی بریتی بوو لە ڕەهەندی سەربازی. بەهۆی پێشکەوتنەکانی زانست و کرانەوەی جیهان بەشێوەیەکی ئاسۆیی بە ڕووی یەکتردا، وایکرد ئاسایشی نەتەوەیی ڕەهەندەکانی فراوانتر بن. بەتایبەت دوای ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت کە گۆڕانێکی گەورە بەسەر سیستەمی نێونەتەوەیی و هەروەها ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتان دا هات، کە وایکرد دەوڵەت بۆ پاراستنی ئاسایشی خۆی گرنگی بەو ڕەگەز و فاکتەرانە بدات کە بوونەتە ڕەهەندێکی نوێ لە ئاسایشی نەتەوەیی دا، بەپێی ئەو ڕوانگەیەی قوتابخانەی کۆپنهاگن بەتایبەت باری بۆزان هەیەتی بۆ ڕەهەندەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کە پێیوایە ئاسایشی نەتەوەیی چەندین ڕەهەندی جیاوازی هەیە کە جگە لە ڕەهەندی سەربازی لە ڕەهەندەکانی کۆمەڵگەیی و ئابووری و کلتووری و ژینگەیی و سیاسی پێك دێت. بە بڕوای بۆزان لە ئێستادا سەرچاوەی ئاسایشی نەتەوەیی تەنها دەوڵەت نییە بەڵکو کۆمەڵگەش لەتەك دەوڵەت سەرچاوەی ئاسایشە، لێرەوە هەوڵدەدەین باس لە ئەم ڕەهەندانە بکەین:

### ٤-٣-١- ڕەهەندی سەربازی:

لەسەدەی بیستەمدا لەدوای دوو جەنگی جیهانی و بڵاوبوونەوەی ئایدۆلۆژیای مارکسیزم و شەڕی سارد و پرسی چەکی ناوەکی. ئاسایشی نەتەوەیی تەنیا بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشە و مەترسییەکانی لەسەر بنەمای هێزی سەربازی بوو (عسکری،٢٠٠٢: ص١٧٩). هەندێ جار کێشەی تەکنەلۆژیا یان گەشەی ئابووری و خۆشگوزەرانی یان کێشەی ئایدۆلۆژیا کاریگەرییان لەسەر ئاستی نەتەوەیی هەیە، بۆیە کاتێك گۆرانکاری لە هەلومەرج ڕوودەدات، دەبێت جێگۆرکێ لە ئامانجە نەتەوەییەکان بکرێت، وەك ئەوەی کە پێشتر هێزی سەربازی تەنیا ڕەهەندی ئاسایشی نەتەوەیی هەژمار دەکرا، بەڵام دوای ئەو ڕووداو و گۆڕانکارییانە کۆمەڵێك ڕەهەندی تر ڕۆڵیان لە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی و دەسەڵاتی دەوڵەت پەیدا کرد. وەك ڕەهەندەکانی ئابووری، کەلتووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، تەکنەلۆژیا و ... هتد (قەوام،٢٠١٢: ص١٥٧).

هێزی سەربازی لە ڕابردوودا ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی بینیوە لە ئاسایشی نەتەوەیی، لەو سەردەمەدا هێز ئامرازێك بووە بۆ هێرش کردن و بەرگری کردن، چونکە توانیویەتی هەم هەڕەشە بێت، هەمیش توانیویەتی بەرگری بکات، ڕەهەندی سەربازی لە ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەت دوای دروست بوونی دەوڵەت نەتەوە ڕۆڵی زیاتریان پەیداکرد بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆی نەتەوە، بەتایبەت ریالیستەکان پێیان وایە کە ئاسایشی نەتەوەیی و ئاسایشی سەربازی هاوتان، بەڵام ئێستا ئاسایشی نەتەوەیی ڕەهەندی نوێ لەخۆ دەگرێت کە گرنگی خۆیان هەیە وەك ئاسایشی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و ... هتد، هەموویان بریتین لە ئاسایشی ناوخۆیی، کەواتە دەتوانین بڵێین لە سەردەمی ئەمڕۆدا، ئاسایشی نەتەوەیی تەنیا بریتی نییە لە ئاسایشی سەربازی (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٣٣). هەرچەندە هەڕەشەی سەربازی یەکێکە لە هەڕەشەکانی سەر کۆمەڵگا، بەڵام

ئەمڕۆ بەهۆی سروشتی جیاوازی هەڕەشەکان و ڕەگەز و فاکتەری نوێ دەبێت لەرێگەی ناسەربازی کێشەکان چارەسەر بکرێن، بۆ نمونە، پرسی کۆچ، پێکدادانی نەتەوەیی و ئەتنیکی و چینایەتی و تائیفی، کەلتووری، جیاوازی مەزهەبی و ناسنامە و ... هتد، کە ئەمانە ئامرازی سەربازی چارەسەر ناکرێن، بەڵکو بە بەرزکردنەوەی توانای سیستەم و شێوازی سیاسی و لەرێگەی خودی گەلەوە بە ئامرازی دیموکراسی دەکرێت چارەسەر بکرێن و بۆ ئەوەی نەبێتە هۆکارێك بۆ لێکترازان و قەیران و نارەزایەتی. ڕەوایەتی سیستەم و پشتیوانی هاووڵاتیان چارەسەری کێشەکان دەکات (بۆزان و ویڤەر،٢٠٠٧ :ل٨٧).

بەڵام سەرەڕای ئەمانەش دەوڵەت بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەڕەشە و مەترسیەکانی دەرەکی و هەروەها ناوخۆیی، دەبێت خاوەن توانای سەربازی بێت لەناوخۆش بتوانێت ڕووبەڕووی تیرۆریستەکان و کەسانێك ببێتەوە کە دەیانەوێت کودەتا یان شۆڕش و ڕاپەرین بکەن، ئەمەش پەیوەندی بە تەکنەلۆژیای سەربازی و دامەزراوەیی ئاسایشی و توانای ئابووری باش هەیە یان لە ئاستی دەرەوە بەرێککەوتن و هاوکاری و پەیماننامەی سەربازی ئەم کارە دەکرێت.

لە ڕوانگەی بۆزان و هاوکارەکانی ڕەهەندی سەربازی و ڕەهەندی سیاسی پەیوەندی توندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە، بەم مانایەی کە جۆری سیستەمی سیاسی دەستنیشانی ڕۆڵی هێزی سەربازی دەکات لە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی لە بەرامبەر هەڕەشە و مەترسییەکانی ناوەوە و دەرەوەدا، ئەگەرچی لە سەردەمی ئێستادا هەڕەشە و مەترسی جۆراوجۆر بۆ ئاسایشی نەتەوەیی دروست بووە، بەڵام هێشتا هێزی سەربازی لە پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی کاریگەری هەیە بەتایبەت لە ئاستی دەرەوەی دەوڵەت.

### ٤-٣-٢- ڕەهەندی ئابووری:

ئاسایشی ئابووری دوو رەهەندی سەرەکی هەیە، ڕەهەندی یەکەم پەیوەندی بە بەهێزکردنی بنەماکانی ئابووری نەتەوەیی هەیە و ڕەهەندی دووەم پەیوەندی بە سەربەخۆیی ئابووری هەیە، بۆ ئەوەی لە ژێر کاریگەری دەوڵەتانی تر دا نەبێت، هەرچەندە ئەمە بەشێوەیەکی رێژەییە، چونکە لەسەردەمی ئێستادا بەهۆی گۆڕانکاریەکان و پێشکەوتنەکان، پەیوەندی دەوڵەتان لەرووی بازرگانی، تەکنەلۆژیا، دیموکراسی و ... هتد، ئەگەر دەوڵەت لەناوخۆ خاوەنی ستراتیژیەتێکی بەهێز نەبێت، ئەوە زیان بە ئاسایشی دەوڵەت دەگەیەنێت، بۆیە یەکێك لە ڕەهەندەکانی ئاسایشی نەتەوەیی پەرەپێدان و سەربەخۆیی ئابووریە (رەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٣٧).

ئابووری بەچەند شێوازێك کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە، لەلایەك ئەگەر دەوڵەت کۆنترۆڵی ئابووری دەوڵەتی کردبێت پەیوەندی کۆمەڵگا لەسەرەوە بۆ خوارەوە دروست دەبێت، لێرەوە ئاسایشی نەتەوە دەبێتە ئاسایشی رژێمی سیاسی، بەهۆی بەدەستەوەگرتنی ئامرازەکانی بژێوی ژیان و سەرچاوەکانی دارایی گوێ بە داواکاریەکانی تاك و گروپ نادرێت، حالەتێکی سەربەخۆیی لە کۆمەڵگە بەدەست دێت کە لەم حالەتەدا داواکاریەکان بەسەرکوتکردن و توندوتیژی وەڵام دەدرێنەوە، لەلایەکی ترەوە بەهۆی دابەش نەکردنی دادپەروەرانەی داهات و سەرچاوەکان لەنێوان هاووڵاتیان و تەنیا بەپێی بەهاکانی سیستەم و وەفاداری بۆ سیستەمەکان، ئەوە دیسانەوە لێکترازان و لاوازی سەرمایەی کۆمەڵایەتی و دووری هاووڵاتیان لە دەسەڵات و جیاوازی چینایەتی، هەژاری و ... هتد، دروست دەبێت ئەمەش کاریگەری لەسەر ڕەوایەتی سیستەم دروست دەکات و ئەگەر بزوتنەوەی دژی سیستەم دروست بێت، هەردەم کۆمەڵگا لەبەردەم ناسەقامگیری دایە، لەلایەکی تر بەهۆی کۆنترۆڵ کردنی ئابووری لەلایەن

دەوڵەتەوە، ئەوە ئابووری دەوڵەت داخراو دەبێت، کەتوانای سیستەم لە بەردەم گۆڕانکاریەکانی نێونەتەوەیی و بەجیهانی بوون لاواز دەکات و هەر قەیران و ڕووداوێکی دەرەکی دەبێتە هۆی دروستبوونی قەیرانی ناوخۆیی، بەهۆی داخراو بوونی سیستەمی ئابووری و کۆنترۆڵ لەلایەن دەوڵەتەوە، هەروەها ئاسایشی مرۆیی دەکەوێتە مەترسیەوە، کە وابوو بەبڕوای زانایان سەرمایەی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی گەشەی ئابووری دەوڵەت نەك کۆنترۆڵی ئابووری لەلایەن دەوڵەتەوە (عسکری،٢٠٠٤:ل٣٩).

ئابووری داخراو و کۆنترۆڵکراو لەلایەن دەوڵەتەوە دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە بواری کۆمەڵایەتیەوە دەوڵەت چین یان توێژێك لەسەر حیسابی چینەکان و بەرژەوەندیەکانی تر بەهێز بکات و سەرکوتی چین و نەتەوە یان پێکهاتەکانی تر بکات، یان بیەوێت کە سیاسەتێکی ویستراوی خۆی پیادەبکات، لەم ڕووەوە یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی کە بنەمای ئاسایشی نەتەوەییە دەکەوێتە مەترسیەوە، لێرەوە ململانێ و نارەزایەتی و توندوتیژی کۆمەڵایەتی توانای دەوڵەت لاواز دەکات و دەبێتە هۆی ناسەقامگیری و لاوازبوون و نەبوونی ڕەوایەتی سیستەم و لەئاستی دەرەوەش کاریگەری لەسەر پێگەو پرستیژی دەوڵەت و تواناکانی لەبەدواداچوونی ئامانجەکانی دەبێت و نادادپەروەری کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەبێت، لێرەوە وەکو بیرمەندانی قوتابخانەی کۆپنهاگن دەڵێن دەبێت ئابووری بەکۆمەڵگەیی بکرێت (عسکری،٢٠٠٤:ل٤١).

هەر سیستەمێکی سیاسی بۆ بەرزکردنەوەی ڕەوایەتی خۆی دەبێت بتوانێت ئاست یان ڕێژەیەك لە خۆشگوزەرانی ئابووری بۆ کۆمەڵگە بەدی بێنێت، ئەمەش بۆ بەردەوامی ڕژێم و کۆمەڵگا پێویستە، هەروەها لاوازی ئابووری کاریگەری لەسەر ئاسایشی سەربازی و بەرگری دەوڵەت دەبێت، قەیرانەکانی بێکاری و هەڵاوسان، کاریگەری نەرێنی لەسەر ڕەوایەتی ڕژێم هەیە و دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نارەزایەتی و شۆڕش و ناسەقامگیری (جی مارتین،٢٠١٣: ص١٦).

میكائیل گۆرباتشۆڤ سەرۆكی پێشووی یەكێتی سۆڤیەت بڕوای وابوو كە تەنیا بە پاڵپشتی هێزی چەكداری و سەربازی و سیستەمی بەرگری ناتوانرێت ئاسایش بپارێزرێت، ئەمڕۆ كە لەرێگەی ئابووریەوە ئاسایش دەپارێزرێت (گورباچڤ، ١٩٨٧:ل١٩٤). چەمكی ئاسایشی خۆراك لەم دواییانە لەلایەن رێكخراو و دامەزراوە نێونەتەوەییەكان خراوەتە ڕوو، وەكو چەمكەكانی تری بواری ئاسایشی نەتەوەیی وەك ئاسایشی سەربازی،كۆمەڵایەتی، نیشتمانی و ... هتد، كە لەلایەن پسپۆران و توێژەرانی سیاسی، ئابووری، كۆمەڵایەتی گرنگی زۆری پێدراوە، بۆ نمونە لە كۆنگرەی جیهانی بۆ خۆراك كە لەساڵی (١٩٧٤) لە ڕۆما بەسترا سەرنجی دەوڵەتان بۆ كێشەی خۆراك و مەترسیەكانی كە دەبنە هۆی كەمی خۆراك لەسەر كۆمەڵگا راكێشرا، هەر لەو كۆنگرەیەدا باس لە پەرەپێدانی بەرهەمی خۆراك و بازاری ماددە خۆراكییەكان كرا و چەمكی ئاسایشی خۆراك وەك چەمكێكی نوێ بۆ لێكۆڵینەوە لە كێشەی خۆراك و كەمی خۆراك و بەرزبوونەوەی نرخی خۆراك و زۆر بەكار هێنانی، هاتە ناو باسە ئابووری و سیاسییەكان (ئەحمەد،٢٠٠٧: ص٣٢). هەروەها پەیوەندییەكی بەهێز لە نێوان ئاسایشی ئاو لەگەڵ ئاسایشی نەتەوەیی هەیە، چونكە ئاسایشی ئاو پەیوەندییەكی بەهێزی لەگەڵ ئاسایشی ئابووری هەیە، لوتكەی ئاسایشی ئابووریش، ئاسایشی خۆراكە و بڕبڕەی پشتی ئاسایشی خۆراك، ئاسایشی ئاوە، مەبەست لە ئاسایشی ئاو بریتییە لە دابین كردنی ئاو بۆ هەموو دانیشتوان بۆ خواردنەوە و بەكارهێنان بۆ كشتوكاڵ و ئاژەڵداری و پیشەسازی و ... هتد، هەروەها ئاسایشی تەكنەلۆژی و دارایش پەیوەندییەكی پتەویان بە ئاسایشی ئابووری هەیە، چونكە تەكنەلۆژیای پێشكەوتوو كاریگەری لەسەر ئاست و ڕادەی بەرهەم هێنان هەیە و تەكنەلۆژیا ڕۆڵیشی لە گواستنەوە و خستنەڕووی بازاریش دا هەیە، لەلایەكی تر تەكنەلۆژیا پێویستی بەسەر چاوەی بەهێزی دارایی هەیە، بۆیە دەستەبەركردنی سەرچاوە داراییەكان گرنگی تایبەتی هەیە بۆ دابینكردنی تەكنەلۆژیای پێشكەوتوو،

هەروەها بۆ دابین کردنی خۆراك، هەندێ جار دەوڵەت لەڕێگای سەرچاوەکانی داراییەوە بۆشایی ئابووری پڕدەکاتەوە ئەم فاکتەرانە پێکەوە کاریگەریان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە، لەلایەکی ترەوە ئاسایشی خۆراك ئەو کاتە دابین دەکرێت، کە دەوڵەت توانای بەرهەمهێنانی ناوەخۆیی هەبێت بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی کۆمەڵگە، بێ ئەوەی پشت بەدەوڵەتانی تر ببەستێت، کە لەم قۆناغەدا دەتوانێت خۆی لە مەترسی و قەیرانی خۆراك ڕزگار بکات و جۆرێك لە هاوسەنگی ئابووری دروست دەکات. دابین کردنی بژێوی ژیان و بەرژەوەندی ئابووری، بەرژەوەندیەکی نەتەوەییە و بەشێکی گرنگی ئاسایشی نەتەوەیی هەر دەوڵەتێکە کە کاریگەری ڕاستەوخۆی لەگەڵ ژیان و خۆشگوزەرانی مرۆڤەوە هەیە و دەتوانێت بواری سیاسی و کۆمەلایەتی بخاتە مەترسیەوە یان بەپێچەوانەوە ببێتە هۆکاری سەقامگیری و گەشەی تاك و کۆمەڵگا (ئەحمەد،٢٠٠٧،ص٤٩-٥٢). ئەمرۆ کە ئاسایشی ئابووری، کاریگەری لەسەر ئاسایشی مرۆیی و کۆی ئاسایشی نەتەوەیی هەیە، تەنانەت فاکتەری ژینگە و ئاو و هەوا کاریگەری لەسەر ئابووری دەوڵەت و ئابووری ئاسایشی مرۆیی هەیە، بەم مانایە کە ئابووری خۆراك، تەندروستی، ژینگە، تاك، کۆمەڵگا و سیاسەت پێکەوە گرێدراون و بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی مرۆیی پێویستە دامەزراوەکانی سیاسی و ئابووری بەپێی پێداویستیەکانی ماددی و نامادی مرۆڤ بێت و خودی مرۆڤ بەشدار بێت لەم پرۆسە سیاسی و ئابووریانە کە کاریگەریان لەسەر ژیان و دابین کردنی پێداویستیەکانی هەیە بۆیە نەهێشتنی هەژاری و بێ بەش بوون. هەروەها بوونی ئاستێکی شیاو لە ژیان و دەستەبەرکردنی مافە سەرەتایی و بنەڕەتیەکان لەژێر ناوی ئاسایشی مرۆیی، تیایدا ڕۆڵی گاریگەرییان لەسەر دابین کردنی ئاسایشی نەتەوەیی و ئاسایشی نێونەتەوەیی هەیە (ویلکن،٢٠٠٢:ل٢٥). دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی و بژێوی ژیان و پێشکەوتنی ئابووری هاوولاتیان لە ڕێگەی ڕێوشوێنی گونجاو ئەرکی دەوڵەتە و کاتێك دەوڵەت لەبواری ئاسایشی ئابووریدا

سەركەوتوو دەبێت، كە توانای دروستكردنی كەشێكی گونجاوی كێبڕكێی ئازادی هەبێت، هەروەها لەكاتی قەیرانی ئابووری دا توانای دانانی سیاسەت و پلان و یاسا و ڕێسای پێویستی هەبێت بۆ چارەسەركردنی پرسە ئابووری و كۆمەڵایەتیەكان و بتوانێت لەئاستی ناوخۆیی و دەرەكی دا پێگەیەكی ئابووری بەهێزی هەبێت. ئامانجی فەراهەمكردنی ژیانێكی ئابروومەندانە و دابین كردنی پێداویستیەكانی ژیان و بەرزكردنەوەی ئاستی خزمەتگوزاری و باشتركردنی ژیانی هاووڵاتیانە، هەروەها ڕەخساندنی هەڵ و دەرفەتی كاری گونجاو و شیاو بۆ ئەوانەی توانا و پسپۆری پێویستیان هەیە، بەپێی تایبەتمەندییەكان و لەبەر چاوگرتنی بەهرەو تواناكانیان، لەمیانەی بەرنامەی فێركردن و ڕاهێنان و پەروەردەكردن، كردنەوەی بوار و دەرفەتی كاری ئازاد لە چوارچێوەی یاسا (الساعدی،٢٠٠٩:ل٧٠٩).

### ٤-٣-٣- ڕەهەندی كۆمەڵگەیی:

ئاسایشی كۆمەڵگەیی بریتییە لە ئاسایشی تاك و كۆمەڵەكان لە مەترسی و هەڕەشە ناوەخۆی و دەرەكییەكان، وەك كوشتن، دزی، دەستدرێژی، سەركوتكردن و مەترسی و هێرشی سەربازی. لە ڕوانگەی قوتابخانەی كۆپنهاگن كەم بوون و زیاد بوونی تاوانەكان پەیوەندی بە ئاسایشی كۆمەڵایەتیەوە هەیە،ئەمەش پەیوەندی بە دامەزراوە حكومی و ناحكومیەكانەوە هەیە بۆ سنوور دانان و ڕووبەڕوو بوونەوەی تاوانەكان، بۆیە پاراستنی تاك و كۆمەڵگا ئەركی دەوڵەتە لەرێگەی بەكارهێنانی دامەزراوەكان و هێز بۆ دەستەبەركردنی ئاسایش و دادپەروەری كە پابەندی و ڕەوایەتی بۆ دەوڵەت دروست بكات. بەو پێیەی كە پارێزەرە، واتە پارێزەری ژیان و سامانی هاووڵاتیانە، بۆیە ئاسایش بەرپرسیاریەتێكی كۆمەڵایەتیە (**الساعدي**،٢٠٠٩: ص٢). بەشێوەیەكی گشتی چەمكی ئاسایش لەسێ بازنەی پەیوەندی دار پێكدێت، **یەكەمیان:** بازنەیی مرۆیی كە لەسەر بنەما و چوارچێوەی

پاراستنی مرۆڤە بەوپێیەی مرۆڤ بێ لەبەرچاوگرتنی ئایین، ڕەنگ، زمان، نەژادی و ... هتد، ئەمەش لە سیستەمە دیموکراسییەکان بوونی هەیە. **دووەمیان** بازنەی ئاسایشی نەتەوەیی کە پەیوەندی دارە بە پاراستنی دەوڵەت کە لە تاك و کۆمەڵگا پێکهاتووە، کۆمەڵگا دەبێت ئاسایشی دەوڵەت بپارێزێت و لە هەمان کات دا دەوڵەتیش بەرپرسیارە لە ئاسایش و پاراستنیان.

لەم چوارچێوەدا ئاسایشی ناوخۆیی دەوڵەت بریتییە لە بەهێزکردن و سەقامگیری و گرنگی دان بە سەروەری یاسا و بەرجەستەکردنی یەکسانی و دادپەروەری کۆمەڵایەتی و دەستەبەرکردنی دەرفەتی ژیانێکی شەرەفمەندانە بۆ هەمووان، هەروەها کارکردن بۆ فەراهەم کردنی ئاسایشی دەرەکی لەو هەڕەشە و مەترسیانەی کە لەدەرەوەی سنوور دێن و تەنیا لەلایەن دەوڵەتانەوە نییە، بەڵکو لەلایەن ڕێکخراو و گروپ و کۆمەڵە و ...هتد، کە هەوڵی تێکدانی ئاسایشی نەتەوەیی دەدەن لەرێگەی ئامرازی جیاواز. بازنەی **سێیەم:** پەیوەندی دارە بە ئاسایشی کۆمەڵایەتی کەدەتوانین بڵێین ئەمە لە گرنگترین پێکهێنەرەکانی ئاسایشی نەتەوەییە، بەهۆی ئەوەی کە دامەزراوەکانی کۆمەڵگە بەشدارن لە بەدەست هێنانی ئاسایشی نەتەوەیی وەك خێزان کە بنەمای ئاسایشی کۆمەڵگەییە، دەتوانین بڵێین ئەم سێ بازنەیە پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە وەك مرۆیی، نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی، هەرچەندە جیاوازیان لە ئەولەویەت پێدانە، ئەگەرنا بنەمای هەموویان ئاسایشە، بۆیە دەتوانین بڵێین بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایش، دەبێت بەرپرسیارەتی تاك و کۆمەڵ لەیەك کاتدا کۆ بکرێتەوە، کە هەموویان بۆ دوورکەوتنەوەیە لە مەترسی **(الساعدي،**٢٠٠٩: ص٥).

ئاسایشی کۆمەڵگەیی (Societal Security)، پەیوەندی توند و تۆڵی لەگەڵ سیستەمی کۆمەڵایەتی، ناسنامەی کۆمەڵایەتی، یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی و متمانە و سەرمایەی کۆمەڵایەتی هەیە، لەم ڕوانگە کاتێك کۆمەڵگەکان ئاسایشیان هەیە کە ناسنامەیان نەکەوێتە ژێر مەترسی، مەبەستیش لە مەترسی

ناسنامەی كۆمەڵایەتی ئەو مەترسیانەن كە مانەوەی كۆمەڵگا دەخەنە ژێر هەڕەشە، لێرەوە بەردەوامی و گەرەنتی مانەوەی ناسنامەیەكی كۆمەڵایەتییە جیاجیاكان و بەرژەوەندی و پێگەیان و میكانیزمی گونجاو و گەرەنتی كردنیان، هەروەها چارەسەر كردنی ئاشتیانە و دیموكراتیانەی كێشەكان مەبەستە و گروپە كۆمەڵایەتیەكان دەبنە سەرچاوەی ئاسایشن نەك دەوڵەت (غرایاق زندی،٢٠٠٧:ل١٧٥).

بە بڕوای (ئیمانوێل ئادلێر)، لەبڕی دەوڵەت ئەوە كۆمەڵگا دەتوانێت سەرچاوەی ئاسایش بێت، ئەگەر دەوڵەتەكە لیبرال و دیموكراسی بێت و تەنیا ئەم جۆرە دەوڵەتانەن دەتوانن كێشە و گرفتەكانیان لە ڕێگەی ئاشتیانە و دیموكراسیانە چارەسەر بكەن و بەپێچەوانە دەوڵەتانی نادیموكراتیك (تۆتالیتەر و دیكتاتۆری) كە ئایدۆلۆژیەكانیان پیرۆزی دەداتە ئامانجەكانیان و هەموو ئامرازێكی (نادیموكراتیك) بۆ ئەم مەبەستە بەكاردێنن ئاسایشیان نییە (بنكە،٢٠٠٢:ل٢١٩).

هەروەها ڕەهەندی كۆمەڵایەتی ئاسایش پەیوەندی هەیە بە فەراهەمكردنی ئاسایشی هاووڵاتیان، بەو ئاراستەیەی كە هەستی پابەندی و وەفاداری زیات دەكات و كاركردن لەسەر بەرزكردنەوەی توانای دامەزراوەكان بۆ بەهێزكردنی ڕۆحی نەتەوەیی و گیانی هاوكاری و بەرزركردنەوەی هەستی نەتەوەیی بۆ دەستكەوتە نەتەوەییەكان و ڕێز گرتن لە مێژوو و كەلتووری نەتەوە، كەدەربڕی ناسنامەی نەتەوەییە و هەروەها كاركردن لەسەر دروستكردنی دامەزراوەی كۆمەڵگەی مەدەنی بۆ دەرخستنی بەهرە و تواناكانی تاكەكان و ئاراستەكردنی تواناكان و بەهێز كردنی هزری كاری خۆبەخشانە لەبەرژەوەندی گشتی كۆمەڵگە، بۆ ئەوەی ئەو دامەزراوانە توانایان هەبێت بۆ جێ بەجێ كردنی ئەركەكانیان ببنە پاڵپشت بۆ كاروبارەكان (**الساعدي**،٢٠٠٩:ل٧٠٩).

بۆیە دەتوانین بڵێین مرۆڤ جەوهەر و ناوەرۆکی ئاسایشی کۆمەڵایەتییە. لێرەوە چەمکی ئاسایشی مرۆیی دێتەئاراوە. پێناسەی نەتەوەیەکگرتووەکان و بەرنامەی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتوەکان (UNDP) بۆ ئەم چەمکە بریتییە لە دوو ڕەهەند، ڕەهەندی یەکەم پارێزراو بوون لە هەمبەر لە هەڕەشە و مەترسیەکان وەکو برسیەتی و نەخۆشی و سەرکوتکردن، ڕەهەندی دووەم پارێزراو بوون لە هەمبەر پەشێوی و توندوتیژی و مەترسیەکانی ژیان یان کۆمەڵگا کە ئەم بوارانە لەخۆ دەگرێت:

١. ئاسایشی ئابووری.
٢. ئاسایشی خۆراك.
٣. ئاسایشی ژینگەیی.
٤. ئاسایشی تەندروستی و سەلامەتی.
٥. ئاسایشی کەسی.
٦. ئاسایش بە کۆمەڵ.
٧. ئاسایشی سیاسی.

لێرەوە دەتوانین بڵێین هەڕەشە و مەترسیەکانی سەر ئاسایشی مرۆیی تەنیا دەرەکی و لەلایەن هێزێکی سەربازی دەرەکی نین، بەڵکو هەندێجار خودی دەوڵەتان پێشێڵ کردنی مافەکانی مرۆڤ دەبنە هەڕەشە بۆ سەر مرۆڤ (قاسمی،٢٠٠٨:ل٥٢٩). چەمکی ئاسایشی مرۆیی گرنگی بەمرۆڤ دەدات نەك دەوڵەت، بەپێی ئەم چەمکە هەر سیستەمێکی سیاسی دەبێت ئامانجی بنەڕەتی دەستەبەرکردنی ئاسایشی مرۆڤ بێت، هەرچەندە چەند هۆکارێك هەیە کاریگەریان لەسەر ئاسایشی مرۆیی هەیە وەکو: نادادپەروەری لەدابەش کردنی سامانی دەوڵەت، بوونی جیاوازی نەرێنی ئەتنیکی لەو کۆمەڵگەیانەی کە پێکهاتەی ئەتنی جیاوازی تێدایە و هەروەها کاتێك کە بارودۆخێکی نالەباری سروشتی وەکو کارەساتە سروشتییەکان، بوومە لەرزە، لافاو، بورکان و ... هتد، یان ململانێیە

توندوتیژیەكان بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەت، وادەكات لایەنی بیانی و هەرێمی دەستێوەردان بكەن.

نەتەوە یەكگرتوەكان لە ڕاگەیاندراوێكی دا لە ساڵی (١٩٩٧)ـی زایینی چەند بنەمایەكی وەكو هەڕەشە لەسەر ئاسایشی مرۆڤ دیاریكردوە، وەك: ناسەقامگیری دارایی، نەبوونی ئاسایشی ئابووری وا دەكات داهاتی تاك نزم بێتەوە، نەبوونی ئاسایشی تەندروستی بەتایبەت لە ژینگەیەكی پیس، نەبوونی ئاسایشی كەلتووری، نەبوونی ئاسایش بۆ تاك، بڵاوبوونەوەی توندوتیژی و تاوانە رێكخراوەكان و مادەهۆشبەرەكان و دەستبەسەرداگرتنی نارەوایی داهێنانەكان، لەرێگەی تەزویر و فێڵ، نەبوونی ئاسایشی ژینگەیی و بڵاوبوونەوە و پیس بوونی ژینگە و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی و هەروەها نەبوونی ئاسایشی كۆمەڵگەیی بەهۆی گواستنەوەی چەك و ئامرازی كۆمەڵكوژی و توندوتیژیەكان و توندڕەوی و كوشتنی بەكۆمەڵ كە دەگاتە ئاستی جینۆساید (**الساعدي**، ٢٠٠٩: ص٤).

چەمكی ئاسایشی مرۆیی (Human security) بەمانای ئازاد بوون لە ترس و دڵەڕاوكێ و رێزگرتن لە كەرامەتی مرۆیی بۆ بەشداری چالاك لە ژیانی كۆمەلایەتی، سیاسی و ... هتد، دێت. لێرەدا گرنگی بەتاكەكان دەدرێت و لێرەوە ئامانج و مەبەست دەستەبەركردنی لانی كەمی ژیانی ماددی و نامادی بۆ مرۆڤە، سەرەڕای بوونی هەرجۆرە بیروبۆچوون و بڕوا و ئایدیا و ڕەنگێك. بەم مانایە رەخساندنی هەل و دەرفەت بۆ ژیانێكی ئابڕومەندانە و دابین كردنی پێداویستییە سەرەتاییەكانی ژیان و پەروەردە و تەندروستی و بەشداری و كار و ... هتد. ئەم ڕەهەندەی ئاسایش دەوڵەت وەكو تەنیا سەرچاوەی ئاسایش دەخاتە ژێر پرسیار. واتا ئەمە مرۆڤە كە دەبێت ئاسایشی هەبێت و مرۆڤ كە سەرچاوە و مەبەستی ئاسایشە نەك دەوڵەت (غراياق زندی،٢٠٠٨:ل٥٧٦).

هەر دەوڵەتێك بۆ دروست كردنی ئاسایشی نەتەوەیی پێویستی بە ئاسایشی مرۆیی هەیە، بەم مانایەكە دەوڵەتێك لە ڕووی مرۆیی و سەرچاوە مرۆیەكانەوە

لاوازبێت، ئەوە دەوڵەتێکی بەهێزی نییە، واتە پەیوەندییەکی قووڵ لە نێوان ئاسایشی نەتەوەیی و ئاسایشی مرۆڤ هەیە، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین ئاسایشی مرۆیی لە هەر سیستەمێکی سیاسی دا، دەستەبەرنابێت، بە هەردوو ڕەهەندی ماددی و نامادد‌ی ئاسایشی مرۆڤەوە (قاسمی،٢٠٠٥،ل٨٣٠). ڕوانگەی نوێ بۆ ئاسایشی نەتەوەیی گرنگی بە چۆنایەتی ژیان و ئەو هەل و مەرجە دەدات کە لە چوارچێوەی ئەوەدا مافەکانی هاووڵاتیان پارێزراو بێت و ڕێزیان لێبگیرێت، ئاسایشی مرۆیی یەکێکە لەم ڕوانگانە و کەم کردنەوەی هەژاری و کێشە و گرفتەکانی نەتەوەیی، خوارنەتەوەیی و سەرووی نەتەوەیی گرنگی پێدەدرێت، واتە ئاسایشی جێگیر بەبێ پاراستن و دەستەبەرکردنی ئاسایشی مرۆیی دەکەوێتە مەترسیەوە، وەکو پرس و کێشەکانی وەکو ئایدز و مەترسیە ژینگەییەکان و تیرۆریزم و ... هتد (پورسعید،٢٠١٠:ل٢٠٨).

ئامانج لە ئاسایشی مرۆیی پارێزگاری کردنە لە ناوەرۆك یان گەوهەری ژیانی هەموو کۆمەڵگەکان لەهەمبەر هەڕەشە و مەترسییەکان، بەجۆرێك گونجاو بێت لەگەڵ کەرامەت و پەرەسەندنی مرۆیی، لێرەوە دەردەکەوێت کە ئەم ناوەرۆك یان گەوهەری نەتەوەییە هەردوو ڕەهەندی ژیانی ماددی و نا ماددی دەگرێتەوە، لێرەوە ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و مافی دیاریکردنی چارەنووس و بەشداری ئازادانە لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕزگار بوون لە چەوساندنەوە و سەرکوتکردن لەلایەن پێکهاتەیەکی نادیموکراتیك پێویستی ئاسایشی مرۆییە، لەم ڕوانگەیەوە پەیوەندی ئاسایشی مرۆیی و دیموکراسی بەهەموو ڕەهەندەکانییەوە دەردەکەوێت (کارۆڵین،٢٠٠٣:ل٢٦-٢٧).

لەلایەکی تر پێشێلکردن و لەبەرچاو نەگرتنی مافی مرۆڤ لەلایەن سیستەمە سیاسییەکانەوە بەردەوام کێشە و گرفت و قەیرانی لێ دەکەوێتەوە و جۆرێك لە لێکترازان لە نێوان خودی کۆمەڵگا و هەروەها کۆمەڵگا و دەسەڵات دروست دەبێت ئەمەش وا دەکات دەوڵەت نەبێتە سەرچاوەی ئاسایش بۆ کۆمەڵگا. بۆیە

لە نێوان توندوتیژییەكان و هەژاری و دەسەڵاتداریەتی خراپ پەیوەندی هەیە، لێرەوە تەنیا نەبوونی ترس و هەڕەشە ئاسایش ناپارێزێت بەڵكو پێویستە مرۆڤ ئازاد بێت لە هەموو بەربەست و كێشە و مەترسییە ماددی و نامادیەكان. لە زۆربەی حالەتەكاندا خوودی دەوڵەت سەرچاوەی هەڕەشە و مەترسی و توندوتیژییە واتە دژی ئاسایشی هاووڵاتیانە. بەتایبەت لە دەوڵەتانی نادیموكراتیك و دواكەوتوو دەوڵەت لاوازە لە پاراستن و دابین كردنی بنەماكانی ئاسایشی مرۆڤی. لێرەوە دەردەكەوێت كە دەوڵەتان بەبێ دابین كردنی ئاسایشی هاووڵاتیان ناتوانن ئاسایشی نەتەوەییان هەبێت (پائولین، ٢٠٠٨: ل٦١٠).

بەشێوەیەكی گشتی ئاسایشی مرۆیی لەسەر دەستەبەركردن و دابین كردنی چەند بنەمایەك ڕاوەستاوە: ١. ڕزگاركردنی مرۆڤ لە ترس.

٢. كەم كردنەوە و لابردن و دژایەتی هەژاری.

٣. باشتركردنی دۆخی ئابووری بەتایبەت ئاسایشی خۆراك.

٤. باشتر كردنی ڕەوشی تەندروستی مرۆڤەكان.

٥. پاراستنی ژینگە.

٦. دابین كردنی ماف و ئازادیە مەدەنی و سیاسییەكان بۆ تاك و كۆمەڵ.

٧. پاراستنی كەسایەتی و كەرامەتی مرۆیی (موسى البدانيية،٢٠١١: ص٢٤).

هەروەها دەتوانین هەڕەشەكانی سەر ئاسایشی مرۆیی بەم شێوەیەی خوارەوە پۆلین بكەین:

١- توندوتیژی و كوشتن و كەم ئەندام كردن و تاوانەكان دژی ژنان و منداڵان و دەستدرێژی سێكسی، تیرۆریزم، ململانێ و جەنگی نێوان هێز و گروپەكان، جینۆساید، ئەشكەنجەدان و ڕاوەدوونانی ناڕازیان و ئۆپۆزسیۆن و ... هتد.

٢- ڕەفتارە نامرۆییەكان وەكو: قاچاغی مرۆڤ و ژنان و منداڵان و بەكۆیلەكردنی سێكسی، بەكارهێنانی منداڵان وەكو سەرباز، ڕەفتاری خراپ لەگەڵ ژنان و منداڵان تەنانەت لەماڵەوە و لە كۆمەڵگا، دەستبەسەركردنی

ناياسايى ئۆپۆزسيۆن و دژبەران و دادگايى كردنى بێ بەزەييانە و دوور لە پێوەرەكانى جيهانى و ديموكراسى.

٣- جياكارى دژى كەمينەكان و ياساى ناديموكراتيك و هەڵبژاردنى ناشەفاف و ساختە و نەبوونى راگەياندن و ئازادى و بەگشتى پێشێڵ كردنى مافەكانى مرۆڤ و ئازادييە سياسى و كۆمەڵايەتيەكان.

٤- جەنگ و ململانێى ناوەخۆيى و دەرەكى.

٥- دەستەبەرنەكردنى پێداويستيە سەرەتاييەكانى ژيان وەكو: خۆراك، ئاو، تەندروستى، پەروەردە، كار، شوێنى نيشتەجێبوون و ... هتد.

٦- دواكەوتوويى لە ڕووى ئابوورى و گەشەسەندن، هەروەها نايەكسانى سياسى و كۆمەڵايەتى، هەژارى، ناسەقامگيرى.

٧- پيسبوونى ژينگە و سەرچاوە سروشتيەكان (قاسمى،٢٠٠٥:ل٨٢١).

بۆيە دەكرێت بڵێين ئەگەر دەوڵەت بە تەنها بيەوێت ببێت بە سەرچاوەى ئاسايش ئەوا بۆ خۆى دەبێت بە هەڕەشە و مەترسى لەسەر كۆمەڵگا، لە سەردەمى ئێستادا چەندين پرس وەكو ناسنامە و ژينگە گرنگى زۆريان پەيدا كردووە، وەك بارى بۆزان باس لە پرسى ناسنامە و گروپە كۆمەڵايەتييەكان دەكات لە كۆمەڵگا. بۆزان جياوازى كردووە لە نێوان ئاسايشى كۆمەڵايەتى و ئاسايشى كۆمەڵگەيى، لە ئاسايشى كۆمەڵگا دەبێت ناسنامە و بەرژەوەندى هەموو گروپە كۆمەڵايەتييەكان بپارێزرێت بە هەموو ڕەهەندەكانييەوە، وەك ڕەهەندى ئابوورى، سياسى، كۆمەڵايەتى، كلتوورى، ژينگەيى. بەڵام ئاسايشى كۆمەڵايەتى تەنها پاراستنى بارودۆخە كۆمەڵايەتييەكەيە كە تيايدا گرنگى بە پرسى ناسنامە نادات. بۆيە دەوڵەت بۆ پاراستنى ئاسايشى نەتەوەيى دەبێت ڕەهەندەكانى ئاسايشى كۆمەڵگەيى بپارێزێت و كۆمەڵگا ببێت بە سەرچاوەى ئاسايش، ئەمەش پێويستى بە پلان و ميكانيزمى نوێ هەيە بۆ پاراستنى ئاسايشى نەتەوەيى.

### ٤-٣-٤- ڕەهەندی كلتووری:

كێشە و گرفتەكانی سیاسەتی ڕەهای دەوڵەت ـ نەتەوە لە هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ نەتەوە و مەزهەب و بەگشتی ناسنامەكانی تر، بەهۆی گۆڕانكاریەكان و دەرهاوێشتە نەرێنییەكانی ئەم سیاسەتە تاك ڕەهەندیە و زیاد بوونی هەژاری و نادادپەروەری و نەبوونی ئازادی بۆ كەلتوور و ناسنامەكانی تر وایكرد كە ڕوانگەیەكی دیموكراتیكی تر بۆ ئەم پرسە كە پرسی ئاسایشی كۆمەڵگەیی لەلایەن بۆزان و وەیڤەر بێتە ئاراوە، كە ئەوان داننان و پاراستنی ناسنامە بەناوەرۆك و بابەتی ئاسایشی كۆمەڵگەیی دابنێن و لێرەوە ئەم ڕوانگە نوێیە بووە هۆی ئەوەی كە بوار و دەرفەتی زیاتر بڕەخسێنێت بۆ هێز و گروپەكانی تر، بە فەرمی بناسرێن و ڕۆڵ و مافیان بپارێزرێت، ئەمەش لە چوارچێوەیەكی ناسراو بە رژێمی دیموكراتیك یان سیستەمێكی دیموكراسی دەكرێت (نویدینا،٢٠٠٦:ل٥٩).

ئاسایشی كەلتووری واتا توانای بەرهەمهێنان و كۆكردنەوە و تایبەتمەندییەكان بۆ نەهێشتنی مەترسی لە دەستدانی ئەو بەها كەلتووریانەی كۆمەڵگە كە لە هزر و ویژدانی هاووڵاتیان دا هەیە، ئەم پێناسەیە لەسەر ئاستی ئابووری و خۆراكیش جێ بە جێ دەكرێت، چونكە ئاسایش بە هەموو جۆرەكانییەوە پێویستی بە ستراتیژیەتێكی تایبەت هەیە بۆ پاراستنی كۆمەڵگا، وەك چۆن ئاسایشی ئابووری دەبێتە هۆی پاراستن لە دواكەوتوویی و سەربەخۆیی بەهەمان شێوە ئاسایشی كەلتووری هۆكارێكە بۆ پاراستنی بەهاكان بۆ ئەوەی نەكەونە ژێر كاریگەری هەڕەشەی دەرەكی، ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت لەڕووی ئابووری سیاسی و سەربازی پێویستی بە ئاسایشێكی كەلتووری هەیە كە پشتیوانی بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بەهێز بەرگری بكات و ئەمەش مافی دەوڵەتە كە خۆی بپارێزێت لەو هەڕەشەو مەترسیانەی كە كەلتووری كۆمەڵگا تێك دەدات (**هلال العامري،٢٠١٢: ص٢٧**). پێویستە لەسەر دەوڵەت كە هەندێ بەها هەن بیان

پارێزێت، وەك بەهاكانی پێكەوە ژیان، دراوسێیەتی، ڕێزگرتن، پەیوەندی ئەرێنی و پشت بەیەكتربەستن، كرانەوە بەڕووی یەكتری و ... هتد. چونكە گرنگی نەدان یان پێشێلكردنی ئەم بەهایانە دەبێتە هۆی پێكدادان و ململانێ و بڵاوبوونەوەی كەلتووری ڕق و كینە لە كۆمەڵگەدا و تاكەكان هەست بە ئاسایش ناكەن (هلال **العامري**،٢٠١٢: ص٢٧).

هەروەها ئازادی بنەمای سەرەكییە بۆ پاراستنی ئاسایشی مرۆیی و هۆكارێكە بۆ بەردەوامی ژیان، چونكە ئەمە دەبێتە بنەمایەك بۆ داهێنان و پێشكەوتن و خۆشگوزەرانی مرۆیی، چونكە ئاسایشی تاك یان هاووڵاتیان كۆڵەگەی سەرەكی ئاسایشی ناوەخۆی دەوڵەتە و پاراستنی مافە تایبەتیەكان لە چوارچێوەی یاسادا بەبێ جیاكاری. هەروەها پێویستە ژینگە كۆمەڵایەتیەكەش دوور بێت لە تاوان و توندوتیژی، لێرەوەیە كە ئاسایشی كەلتووری دەبێتە ئامرازێك بۆ پاراستنی ئاسایشی تاك لە هەڕەشە و پاراستنی تایبەتمەندییەكان. كە ئامانجی پارێزگاری كردنە لە ئازادی بیركردنەوە و ڕادەربڕین بەبێ ئەوەی جیاوازی بكرێت لەنێوان تاك و گروپە جیاوازەكان (هلال العامری،٢٠١٢: ص٣١).

هەندێ لە دەوڵەتان گرنگی بە ئاسایشی سەربازی دەدەن، چونكە مەبەستیان پاراستنی دامەزراوەكانی دەسەڵاتە و پاساویان ئەوەیە كە ئەگەر دەسەڵات پارێزراوبێت ئاسایشی دەوڵەت و تاكەكان پارێزراو دەبێت، بەڵام ئەزموونە مێژوویەكان ئەوەیان سەلماندووە كە ئەمە ڕاست نییە، چونكە سەرچاوەكانی توندوتیژی، هزری و ئایدۆلۆژی بە ڕووبەڕووبوونەوەی سەربازی چارەسەر ناكرێت، بەڵكو پێویستی بە چارەسەرێكی كەلتووری و مەعریفی هەیە، ڕەگەزپەرستی، بێكاری، هەژاری، تاوانە جیاوازەكان، توندوتیژی خێزانی و ... هتد، نەخۆشیەكی مەعریفین لەبنەڕەتدا، بۆیە ئاسایشی كەلتووری زۆر لە بوارەكانی تری ئاسایش گرنگترە (هلال **العامري**، ٢٠١٢: ص٣٢).

بەگشتی ئەم ڕەهەندە بریتییە لە دابینكردنی ئازادی بۆ كەمینەكان و بیر و باوەر و كلتووریان، كە لەسەر بنەمای ڕێزگرتنە لە هزر و داهێنانەكان و پاراستنی مێژوو و داب و نەریتیان، هەروەها پاراستنی بەهاكانیان كە بۆتە بەشێك لە ویژدانی بە كۆمەڵیان (**الساعدي**، ٢٠٠٩:ل٧٠٩).

**٤-٣-٥- ڕەهەندی سیاسی:**

سروشتی سیستەمی سیاسی كاریگەری لەسەر بەرژەوەندی نەتەوەیی هەیە، كە ئایا دیموكراسییە یان نادیموكراسییە، چونكە كاریگەری لەسەر بەهێزی یان لاوازی دەوڵەت هەیە، لەبەر ئەوەی پەیوەندییەكی دوولایەنە لە نێوان سیستەمی سیاسی و بەهێزی دەوڵەت هەیە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیە نەتەوەییەكان و دابین كردنی ئاسایشی نەتەوەیی، هەرچەندە دوو بۆچوونی سەرەكی هەیە كە یەكەمیان بڕوای وایە كە سیستەمە نادیموكراتیەكان، باشتر دەتوانن ئاسایشی نەتەوەیی بپارێزین، چونكە پێیانوایە دەوڵەت دەتوانێت هەموو ئامرازەكانی هێز لەدەست خۆیدا كۆبكاتەوە، لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی و ئاسایشی نەتەوەیی، بەڵام ئەزمونە مێژووییەكان ناڕاستی ئەم بۆچوون و ڕوانگەیان دەرخستووە، بۆ نمونە دەوڵەتانی دیموكراسی لەسەردەمی جەنگی جیهانی یەكەم و دووەم سیستەمە دیموكراسییەكان باشتر توانیان پەرەپێدانی ئابووری و یەكگرتوویی كۆمەڵایەتی بپارێزن و ئاسایشی نەتەوەیی دابین بكەن، وەكو دەوڵەتانی ڕۆژئاوایی، بۆیە ڕوانگەی دووەم جەخت لەسەر بوونی سیستەمێكی دیموكراسی دەكاتەوە لە بەدیهێنان و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص١٢٤).

سەقامگیری هەر كۆمەڵگەیەك پەیوەندی بە ئاستی بەشداری سیاسی، ڕەوایەتی و ڕەزامەندی هاووڵاتیان لە دەسەڵات و بوونی دامەزراوە مەدەنییەكانەوە هەیە وەك پارتە سیاسییەكان، جیاكردنەوەی ڕەهەندی سیاسی ئاسایش لە بوارەكانی تر كارێكی ئاسان نییە، لەئاسایشی سیاسی باس لە

سەقامگیری و جێگیربوونی دامەزراوەیی دەکرێت، بوونی کێشە و گرفتی ناوەخۆیی و هەڕەشەی دەرەکی کێشەی سیاسی و نائاسایشی سیاسی دروست دەبێت و لەناوخۆ پەیوەندی بە توانای سیستەم و ڕەوایەتی هەیە، کەواتە هەموو ئەو بابەت و کێشە و پرسانەی کەپەیوەندییان بە سەقامگیری سیاسی و بەشداری و ڕەوایەتیەوە هەیە کاریگەری لەسەر ئاسایشی سیاسی هەیە و بەگشتی کۆی ڕژێم و یان سیستەمی سیاسی دەخاتە مەترسیەوە (عباس زادە و کرمی،٢٠١١:ل٤٤).

خوێندنەوەی نویٚ بۆ ئاسایش دەکرێت لە چاچێوەی ڕەزامەندیدا خوێندنەوەی بۆ دەکرێت. بەم مانایەی کە داواکارییەکان پێویستە وڵام بدرێنەوە، کە ئاڵۆز و فرەن لە چوارچێوەی سیستەمی سیاسی، کە پەیوەندی بەتوانای سیستەمی سیاسییەوە هەیە، بەم مانایەی کە ئاسایشی دەوڵەت تەوەر جێگەی خۆی دایە ئاسایشی کۆمەڵگە تەوەر، بۆ نمونە:

١- سەرچاوەی ئاسایش لەسەروەری (سیادە) و هێزی دەوڵەت تێپەری کردووە و دەوڵەت وەکو فاکتەر و ئامرازی بەدیهێنانی ئاسایش بۆ کۆمەڵگە ڕۆڵی گۆڕاوە.

٢- بەرهەمهێنانی ئاسایش وەکو مەرجی پێویستی سەقامگیری کۆمەڵایەتی و ئاشتی هەژمار کرا لە پەنا دابەشکردنی بوارەکانی ئاسایش (سیاسی، ژینگەیی، کۆمەڵگەیی و ئابووری) لەنێوان تاکەکان و گروپەکۆمەڵایەتیەکان (عباس زادە و کرمی،٢٠١١:ل٣٧). بەگشتی ئەو هۆکار و پاڵنەرانەی کە کاریگەریان لەسەر ڕوانگەی دەوڵەتان لە هەمبەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە جۆراوجۆرن وەکو: ڕادەی هێز و توانای دەوڵەت، پێگەی جوگرافیا، ژمارەی دانیشتوان، توانای ئابووری، ڕەهەندی مێژووی دەوڵەت و داب و نەریت و ئایدۆلۆژی و ... هتد. هەرچەندە ئەو هۆکارانە بەپێی کات و شوێن گۆڕانیان بەسەردا دێت، بۆیە ئاسایشی دەوڵەتان جیاوازە بەپێی کات و شوێن و هەڵکەوتەی جوگرافیش گرنگی تایبەتی هەیە (ڕەوشەندڵ،٢٠٠٩: ص٤٠).

ئاسايشى نەتەوەش پەيوەندييەكى نزيكى لەگەڵ پەرەسەندوويى سياسيدا هەيە، ئەم چەمكە بەتايبەت لە دەوڵەتانى پەرەسەندوو كە لەگەڵ كێشەكانى ناوەخۆيى وەك ململانێ و پێكدادانە نەتەوەييەكان، بزاڤ و سەرهەڵدانەكانى ناوەخۆيى، گەندەڵى دام و دەزگا كارگێڕييەكان و مەترسى كودەتاى چەكدارى بەرەوڕوون. لەم دەوڵەتانەى كە جووڵەى ئابوورى و كۆمەڵايەتيەكان لەگەڵ دواكەوتوويى دامەزراوە سياسييەكاندا نارێكن ئەم نارێكيەش دەبێتە هۆى نا ئارامى و پشێوى و ئاڵوگۆڕە نێوخۆيەكانى ئەم دەوڵەتانە بەهۆى ئەم چەشنە كێشانە سەرهەڵدەدات و بوارى ئاسايشى ئەوانيش كاردەكاتە سەر ناوچەكە (ڕەوشەندڵ، ٢٠٠٩:ل٣٥). لەلايەكى تر ئاسايشى ناوخۆيى، بريتييە لە بارودۆخێكى كۆمەڵايەتى كە هاووڵاتيانى دەوڵەتێك دەتوانن بەشێوەى يەكسان بەكەڵك وەرگرتن لەياسا لە ژيان سياسى، ئابوورى، كۆمەڵايەتى، كەلتوورى، خۆيان دابەش بن و يان سوودى لێببينن، بەبێ گوشارى نەرێنى گوشارەكانى نەرێنى بريتين لە تاوانكارى، توندوتيژى، ناسەقامگيرى، زۆرەملێ و ... هتد. ڕەهەندى ناوخۆيى ئاسايش لە چێوارچێوەى سيستەمى سياسى دەوڵەتە كە بنەما و سەرچاوەى ئاسايشە، بۆيەش سيستەم و پێكهاتەى فەرمى دەوڵەت دەستنيشانكەرى ڕەهەندەكانى ئەم ئاسايشەيە، كە سيستەمە سياسييەكە و پێكهاتە سياسى و نوخبە سياسييەكان ڕۆڵى سەرەكيان تێدا هەيە (غراياق زندى، ٢٠٠٩:ل١٣).

ئاسايشى نەتەوەيى پەيوەندى توندوتۆڵى لەگەڵ پەرەپێدانى سياسى هەيە جگە لە بوارەكانى تر، لەدەوڵەتانى دواكەوتوو لەگەڵ تەنگژە و قەيرانە ناوەخۆييەكان، وەك پێكدادان و توندوتيژيە ئيتنيكەكان، مەترسى كودەتاى سەربازى، هەژارى و ... هتد، بەرەو ڕوون، بۆيە لەم دەوڵەتانەدا لەنێوان ڕەهەندەكانى ئابوورى، سياسى، كۆمەڵايەتى هاوسەنگى بوونى نييە، چونكە دامەزراوەكانيش دواكەوتوون، چونكە ئەم دواكەوتوويە ناسەقامگيرى لێدەكەوێتەوە و ئەمەش وادەكات هەم ئاسايشى ناوەخۆييان تێك بدات هەميش كاريگەرى نێگەتيڤى لەسەر ئاسايشى ناوچەيى هەبێت. ئەو دەوڵەتانەى كە

تووشی ناسەقامگیری و نائارامی ناوخۆیین، ناتوانن ئاسایش و ئامانجەکانیان بپارێزن، ئەمەش ڕێگا بۆ دەستێوەردانی دەرەکی خۆش دەکات (رەوشەندڵ، ٢٠٠٩: ص٣٦).

بۆیە جۆری سیستەمی سیاسی (دیموکراسی یان نادیموکراسی) کاریگەری لەسەر ئاسایشی سیاسی و بەگشتی ئاسایشی نەتەوەیی هەیە. ڕەهەندی سیاسی پێك دێت لە پاراستنی کیانی سیاسی دەوڵەت و پاراستنی بەرژەوەندیە باڵاکانی و ڕێزگرتن لە سیمبۆلە نەتەوەیی و نیشتمانییەکان و ئەو بنەمایانەی کە زۆرینەی کۆمەڵگە لەسەری ڕێککەوتوون، پەنا نەبردنە بەر بێگانە بە هەر پاساوێك بێت، پەیرەوکردنی ئازادی لە چۆنییەتی هەڵبژاردنی شێوازی ژیان بەپێی یاسا بە ئامرازەکانی ئاشتی کە ئاسایش و سەقامگیری دەوڵەت بەهێز دەکات (**الساعدي**، ٢٠٠٩:ل٧٠٩).

بۆزان سەبارەت بە ڕەهەندی سیاسی ئاسایشی نەتەوەیی پێی وایە کە شێوازی مامەڵەکردنی سیستەمی سیاسی لەگەڵ کۆمەڵگا کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەبێت. چونکە کاتێك سیستەمێکی سیاسی بیەوێت لە ڕێگەی توندوتیژی سیاسەتێکی دیاریکراو یان ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو بسەپێنێت، ئەوا دۆخێکی نائاسایشی دروست دەکات، هەروەها بۆزان گرنگی بە ڕەوایەتی سیستەمە سیاسییەکان دەدات و بڕوای وایە ناڕەوایەتی ئەم سیستەمە سیاسییانە دەبێتە مایەی پشێوی و نائارامی لە کۆمەڵگا. هەروەها بۆزان لەسەر ئاستی دەرەوەش پێی وایە کە جۆری سیستەم و ئەو سیاسەتە توندوتیژەی کە لە ناوخۆ دەیگرێتەبەر وادەکات کە لەسەر ئاستی دەرەوەش تووشی قەیران ببێت، کە هەندێکجار وادەکات دەوڵەتانی تر لەسەر ئاستی هەرێمی و نێونەتەوەیی ئاسایشییان بکەوێتە مەترسییەوە و پێی وایە ئەو دەوڵەتانەی کە دەبنە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی ناوخۆ، هەرێمی، نێونەتەوەیی بە دەوڵەتی لاواز ناسراون و کە ئەمەش دەرئەنجامی نەبوونی ڕەوایەتییە لە ناوخۆ و دەرەوە.

## ٥- كاریگەرییەكانی دیموكراسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی:

لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا ئاسایش بریتییە لە دەستەبەركردنی بارودۆخێكی سەقامگیر لە چوارچێوەی ناوخۆ و دەرەوە، هەروەها لە سیستەمێكی دیموكراسی ئاسایشی نەتەوەیی تەنها ئاسایشی دەسەڵاتداران یان چین یان گروپ و پارتێكی سیاسی دیاریكراو نییە، بەڵكو ئاسایشی پایەكانی دەوڵەتە بەتایبەت هاووڵاتیان، چونكە لە سەردەمی ئێستادا پارادایمی زاڵ دەستەبەركردن و پاراستنی ماف و ئازادییەكانی مرۆڤە. ئەو سیستەمانەی كە گرنگی بە پاراستنی مافی مرۆڤ نادەن، بەهۆی گۆڕانكارییەكان تووشی قەیران بوونەتەوە، بەو پێیەی كە ئاسایشی مرۆڤ لە سەرووی ئاسایشی سیستەم و دەوڵەتە، جاران دەوڵەت بە تەنیا پێناسەی ئاسایشی نەتەوەیی دەكرد و خۆی بە سەرچاوەی ئاسایش دەزانیّ و سنوورەكانی ئاسایشی دیاری دەكرد، بەڵام ئێستا لە سەردەمی شۆڕشەكانی زانیاری و پەیوەندی و تەكنەلۆژیادا، ئەكتەری تری بەهێز لەتەك دەوڵەت كاریگەرییان لەسەر پرسی ئاسایشی نەتەوەیی و هەروەها ڕەوایەتی ئەم دەوڵەتانە هەیە. زۆر لەو دەوڵەتانەی كە نەیانتوانیوە هەنگاو بەرەو دیموكراسی بنێن زۆربەیان نەیانتوانیوە ئاسایشی نەتەوەییان بپارێزن. هەندێكیان تووشی هەڵوەشانەوە بوون، چونكە ئاسایشی نەتەوەیی ئەمڕۆكە پێویستی بە ڕەهەندەكانی ئابووری و كۆمەڵایەتی و كلتووری و سیاسی و ژینگەیی و ... هتد، هەیە. ئەم ڕەهەندانەش لە سایەی سیستەمێكی دیموكراسی ڕاستەقینە دەتواندرێت دەستەبەر بكرێت، بۆ ئەم مەبەستەش لەم بەشەدا باس لە كاریگەرییەكانی دیموكراسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەكەین.

### ١.٥- دیموکراسی و ئاسایشی نەتەوەیی:

پەیوەندی نێوان سیستەمی دیموکراسی و ئاسایشی نەتەوەیی دوولایەنەیە، کە ڕەهەندەکانی ئاسایشی نەتەوەیی لەگەڵ بنەماکانی دیموکراسی پەیوەندی توندوتۆڵیان هەیە و بەیەکەوە گرێدراون. دەتوانین بڵێین ئاسایشێکی ڕاستەقینە لە سیستەمی دیموکراسی دێتەکایەوە. بۆیە سیستەمی دیموکراسی کاریگەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لەسەر هەموو بوار و ڕەهەندەکانی کۆمەڵگا بەگشتی و ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەت هەیە. کە لێرەدا هەوڵ دەدەین گرنگترین ڕەگەزەکانی کاریگەری دیموکراسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی بخەینە بەر باس و لێکدانەوە.

#### ١.١.٥- پەرەپێدان:

دەوڵەتانی پێشکەوتوو ئەو دەوڵەتانەن کە خاوەن پرۆژە و ستراتیژییەتی پەرەپێدانن لە بوارە جیاجیاکانی سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری، ژینگەیی، مرۆیی و ... هتد. ئەمەش پێشکەوتنی کۆمەڵگە بەگشتی و دەوڵەتی بەتایبەت لێدەکەوێتەوە. ئەو دەوڵەتانەی کە دواکەوتوو یان شکستخواردوون ئەو دەوڵەتانەن کە لە بواری پەرەپێدان لاوازن یان شکستییان خواردووە. لەلایەکی تر بارودۆخی ناوخۆیی هەر دەوڵەتێك کاریگەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لەسەر پێگە و ئاسایشی دەوڵەت لە ناو هاوکێشە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان دا هەیە، بۆیەشە پەرەپێدان لە ئەنجامدا دەبێتە مایەی دەستەبەرکردنی ئاسایشێکی نەتەوەیی فرەڕەهەند لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە. هەروەها پەرەپێدان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ دیموکراسی هەیە بەم مانایە کە سیستەمێکی دیموکراسی بوار بۆ پەرەپێدانێکی فراوان و گشتگیر دەڕەخسێنێت.

برينگتۆن مۆڕ لە كتێبى (ڕيشە كۆمەڵايەتييەكانى ديكتاتۆرى و ديموكراسى) لەسەر ئەم باوەڕە سوورە كە پەرەپێدان كارێكى ناوخۆييە و بە چينە كۆمەڵايەتيەكانى هەر دەوڵەتێك بەستراوەتەوە، لەم ڕوانگەيە پەرەپێدان كارێكى سياسييە. ئەو نيشانيدا كە دوو ڕێگەچارەی پەرەپێدان هەيە: نوێكردنەوە لە سەرەوە و نوێكردنەوە لە خوارەوە. ئەم ياسايە بيردۆزى كلاسيك دەشكێنێت و ديموكراسى و پەرەسەندن بە هاو لقى يەك دەزانێت، بۆ نمونە دەوڵەتێكى دواكەوتوو وەك هيند لە ماوەيەكى دياريكراو توانى بە سەقامگيرى سياسى و گەشەكردنى ئابوورى بگات (قەوام، ٢٠٠٩: ل٢٧٨).

هەروەها (مارتين سيمۆرليپيست) لە توێژينەوەيەكدا بەو ئەنجامە گەيشتووە كە لە نێوان سيستەمى ديموكراسى و ناديموكراسييدا بەراوردكارى كردووە، كە جياوازى زۆر هەيە لە نێوانياندا لە ڕووى گەشە و پەرەسەندنى ئابوورى و بوونى ئاستێكى بەرزى كێبڕكێى سياسى، يەكێك لە هێماكانى سەرەكى ديموكراسييە، چونكە لە سيستەمە ديموكراسييەكان پەيوەندييەكى ئەرێنى و مانادارى دۆزيوەتەوە و دەركەوتووە كە سيستەمى ديموكراسى پەيوەندى لەگەڵ پێشكەوتنى دامەزراوەكانى ئابوورى مۆدێرن هەروەها سيستەمى سياسى هەيە و دەركەوتووە كە تا گەشەى ئابوورى زياتر بێت بەشدارى سياسى هاوولاتيان و هەروەها پابەندبوونيان بە ياسا بەرزتر دەبێتەوە (بشيريە، ٢٠٠٩: ص٢٣٩).

سيستەمێكى سياسى ناتوانێت ديموكراسى لە كۆمەڵگەيەكدا بونيات بنێت كە لە هەموو بوارەكانى ژيانيدا پاشكەوتووە و مەترسيدارترين هۆيەكانى پاشكەوتوويش لە ئەنجامدا پاشكەوتوويى سيستەمى سياسييە، بەم مانايە كە پاشكەوتوويى كۆمەڵگە دەبێتە هۆى كاريگەرى نەرێنى لەسەر سيستەمى سياسى، واتا بۆ دروستكردنى سيستەمێكى سياسى پێشكەوتوو و ديموكراسى پێويستە كۆمەڵگە لە هەموو ڕوويەكەوە هەوڵى پێشكەوتن و پەرەپێدانى بدرێت (بەلقزيز، ٢٠٠٤: ص٩١).

پەرەپێدانی سیاسی چەمکێکی نوێیە و ڕەهەندێکی بنەڕەتیە لە پەرەپێدانی گشتگیر. پەرەپێدانی سیاسی بریتییە لە بەرزکردنەوەی توانای هاوولاتیان لەسەر تێگەیشتن لە کێشەکانیان بە ڕوونی و بەرزکردنەوەی تواناکانیان لە کۆکردنەوە و مۆبلیزەکردنی سەرچاوەکان بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەی ڕاستەقینە و یان ڕێکخستنی ژیانی سیاسی و چاودێری کردنی کاری سیاسی لە چوارچێوەی دەوڵەتدا و پێشخستنی سیستەمی سیاسی و پەیڕەوکردنی کاروباری سیاسی، بۆ ئەوەی دیموکراسییەتی ڕاستەقینە دەستەبەر بکرێت کە ڕێز لە شکۆ و کەرامەتی مرۆڤ بگرێت. لێرەوە هاوولاتیان دەبنە خاوەنی بەهاکانی دیموکراسی بۆ دەستەبەرکردنی یەکسانی سیاسی (حسين **كاظم الشمري، ٢٠١٣: ص٢)**. هەر دەوڵەتێك بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی دەرەکی پێویستی بە ڕادەیەکی دیاریکراو لە سەقامگیری سیاسی و ئاسایشی ناوخۆیی هەیە، ئەوەش تاڕاددەیەکی زۆر پێویستی بە گەشەسەندنی ئابوورییەوە هەیە، لە ڕاستیدا دواکەوتوویی جۆرێك نەبوونی ئاسایشە، چونکە دەبێتە هۆی ئاڵۆزی و قەیرانی ناوخۆ و هاندانی دەستێوەردانی دەرەکی، دەسەلاتداران و هاوولاتیانی دەوڵەتانی پەرەسەندوو گرنگیەکی زۆر دەدەنە پەرەسەندنی ئابووری، هەتا ئەو جێگایەی هەندێکیان ڕاشکاوانە دەڵێن ئاسایشی نەتەوەیی لە پەرەسەندنەوە سەرچاوە دەگرێت و ڕێژە و پێوەری پەرەسەندن پێشاندەری ڕێژە و پێوەری ئاسایشی نەتەوەییە (ڕەوشەندڵ، ٢٠٠٩: ل ٢٤).

پێناسەی گونجاو بۆ پەرەپێدانی سیاسی بریتییە لە پرۆسەیەك بۆ دروستکردنی سیستەمێکی سیاسی ڕەوا و کارامە کە توانای هەیە بۆ بیناکردن و ئامادەکردنی کۆڵەگەیەکی سیاسی، ویستی پەرەپێدان دەبێتە هۆی هاتنەدی سیستەمێکی سیاسی کە پارێزگاری لە بوونی دامەزراوە سەرەکییەکان لەسەر بنەمای بەها یەککگرتوو و هاوبەشەکان لەگەڵ جەوهەری دیموکراسی دەکات کە ئەویش بریتییە لە ئازادی، یەکسانی، شەفافیەت، فرەیی سیاسی (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص١٠١).

پەیوەندییەكی بەهێز و دوولایەنە لەنێوان ئاسایش و پەرەپێدان هەیە، هەر كاتێك ئاسایش بەدیهات ئەوە پەرەپێدان دەستەبەر دەكرێت، بەڵام ئەمە بەس نییە بۆ پەرەپێدان، پەرەپێدان مەرجێكی جەوهەرییە بۆ دەستەبەركردنی ئاسایش، هەرچەندە ئەمەش بەس نییە، واتە دوو لایەنەیە. نەبوونی ئاسایشی ناوخۆ كاریگەری نەرێنی لەسەر پەرەپێدانی كلتووری و سیاسی و ئابووری و هەروەها لەسەر ئاسایشی دەرەوە هەیە (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص١٣٨). لە هەمان كاتدا چەمكی ئاسایش تەنیا بواری سەربازی ناگرێتەوە، بەڵكو بوارەكانی كاروباری تاك و كۆمەڵگە دەگرێتەوە، بە هەموو ڕەهەندە سیاسی و ئابووری و كلتووری و كۆمەڵایەتییەوە (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص ١٣٦). هەروەها ئاسایش بە مانا گشتیەكەی پشت بە دوو بنەما دەبەستێت، یەكەمیان بەدەستهێنانی داواكارییەكانی پەرەپێدان بە مانا بەرفراوانەكەی، دووەمیان گەرەنتی كردنی توانا و ئازادی و سەربەخۆیی دەوڵەت لە وەرگرتنی بڕیاری سیاسی، كەواتە پەرەپێدان جیاناكرێتەوە لە ئاسایش و بەپێچەوانەوە (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص١٣٨).

بەگشتی پەرەپێدانی ئابووری سەركەوتوو نابێت، ئەگەر لە چوارچێوەی دیموكراسیدا نەبێت، چونكە تەنیا بە ڕێگەی دیموكراسی دەتواندرێت جەماوەر ببێتە ئامرازێك بۆ پەرەپێدان و ئامانجی پەرەپێدان، كەواتە مرۆڤ لە یەك كاتدا، لە سیستەمی دیموكراسی ئامراز و ئامانجی پەرەپێدانە، لە سیستەمێكی دیموكراسیدا توانا و وزەكانی مرۆڤ بەرەو ئاراستەی پەرەپێدانی كۆمەڵگە مۆبلیزە دەكرێت (**اخوان كاظمي، ٢٠٠١: ص١١١**).

پەرەپێدانی سیاسی لە بنەڕەتدا، گرنگی دەدات بە سیستەمی سیاسی لە ناوخۆ، كە ئەمە خوێندنەوەی كاریگەرییەكانی سیاسی لەسەر پەرەپێدانی ئابووری و كۆمەڵایەتییە، ئەمە لە ڕێگەی چەند میكانیزمێك بۆ دەستەبەركردنی

تەواوکاری نەتەوەیی دەبێت لە ڕێگەی نەهێشتنی جیاوازییە کلتووری و ڕەگەزی و ئایدیۆلۆژییەکان بە ئاراستەی نەتەوەیی (صادق الشریف، ٢٠٠٧: ص٩٧).

هەروەها پەرەپێدان و ئاسایش دوو ڕەهەندی سەرەکییان هەیە، ئەویش ڕەهەندی ناوخۆ و دەرەوەیە، ئەوەی کە پەیوەندی بە دەرەوە هەیە، هەموو ئەو فاکتەرانە دەگرێتەوە کە پەیوەندییان بە کاروباری دەرەوە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانەوە هەیە، بۆیە بەهێزی سیاسەتی دەرەوە و پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان لەسەر ئاسایش و پەرەپێدانی سەقامگیر ڕادەوەستێت و لەسەر ئاستی ناوخۆش بریتییە لە گرنگپێدان بە ئاسایشی ناوخۆ و یان ئەوەی پێی دەگوترێت سەقامگیری ناوخۆیی، بەبێ ئەوەی کە گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵگە کاریگەری نەرێنیان لەسەر سەقامگیری ناوخۆ هەبێت. لاوازی پەرەپێدان و کەمبوونی ڕێژەی داهاتی تاك لە کۆمەڵگادا دەبێتە هۆی لاوازی ئاسایش و ئەمەش هەڕەشەیە بۆ بڵاوبوونەوەی تاوانە جیاوازەکان وەکو: دزی، کوشتن و .... هتد، دواتر پەرەدەسێنێت بۆ دروستبوونی تاوانی ڕێکخراو، کە ئەو کاتە ڕووبەڕووبوونەوە و چارەسەرکردنی ئەرکێکی قورسە. ئەزموونە مێژووییەکان پێمان دەڵێن کە ئەو دەوڵەتانەی کە گەشەی بەرچاویان بەخۆوە بینیووە ئاسایش تیایدا فاکتەری کاریگەر و بنەڕەتی بووە، بە واتایەکی تر ئاسایشی نەتەوەییان لە ئاستێکی بەرزدابووە، چونکە تاك یان مرۆڤ هەستی بە ئاسایش کردووە، ئەمە بۆتە پاڵنەر و ڕێگەخۆشکەرێك بۆ پەرەپێدان و بوژانەوەی ئابووری دەوڵەت (توندرات، ٢٠١٢: ص٥).

بە تەنیا دانپێدانان بە پرەنسیپی فرەیی سیاسی مانای ئەوەی نییە کە دیموکراسییەت دەستەبەر دەکرێت، بەڵکو دیموکراسییەت پێش لە هەموو شتێك بریتییە لە ڕێگەگرتن لە قۆرخکردنی دەسەڵات و سامان و دارایی لەلایەن یەك گروپ یان لایەنێکی دیاریکراو. لەسەر ئەو بنەمایە بۆ دەستەبەرکردنی پەرەپێدان لە دەوڵەت و ئامانجەکانی پێویستە پەرەپێدان فرە بوار و فرە ڕەهەند بێت و تەنیا

لەسەر لایەن و بوارێك نەبێت، بەڵكو دەبێت هەموو بوارەكانی ئابووری، سیاسی، كۆمەڵایەتی و كلتووری بگرێتەوە و هاوسەنگی لە نێوانیاندا هەبێت و هەروەها پێویستە هاوسەنگی لە نێوان پەرەپێدانی ناوەند و پەراوێزدا هەبێت، چونكە گرنگی نەدان بە پەرەپێدان دەبێتە گرفتی گەورە لە یەكگرتوویی نەتەوەیی. ئەم كارلێكە لە نێوان ناوەند و پەراوێز زۆر گرنگە بۆ پرۆسەی دەستەبەركردنی یەكێتی نەتەوەیی لە نێوان گروپە جیاوازەكانی ڕەگەزی، ئایینی، نەتەوەیی و .... هتد، لەناو دەوڵەت. ئەم كارلێكە دەبێتە هۆی بەرزكرنەوەی ئاستی یەكگرتوویی نەتەوەیی (**حسين كاظم الشمري، ٢٠١٣: ص٢**).

لەلایەكی تر پەرەپێدانی مرۆیی بریتییە لە پەرەپێدانی تواناكانی مرۆڤ و بەرزكردنەوەی ئاستی ماددی و مەعنەوی مرۆڤ، بەم مانایە كە تاك پێویستە هەموو پێداویستیە بنەڕەتی یان سەرەتاییەكانی ژیانی وەكو: خواردن، جلوبەرگ، شوێنی نیشتەجێ بوونی گونجاو و شیاو، دەستەبەركردنی فێربوون و پەروەردە و هەروەها ڕەخساندنی هەلی كار و بەدەستهێنانی پسپۆڕی بۆ ئامادەكردنی تاك و دەستەبەركردنی تەندروستی و فەراهەمكردنی دۆخێك كە تیایدا تاكەكان ئازادی سیاسی و مەدەنییەكان پیادە بكەن. هەروەها ئازاد بن لە بەشداری سیاسی و كۆمەڵایەتی. هەرچەندە پەرەپێدانی مرۆیی پرۆسەیەكی جێگیر نییە و بەپێی كات و شوێن گۆڕانكاری بەسەردا دێت (توندرات، ٢٠١٢: ص١).

هەندێك جار پێوەندی پێچەوانە هەیە لە نێوان تەرخانكردنی دارایی و داهات و سەرمایەی دەوڵەت بۆ بواری سەربازی و بواری پەرەپێدان، چونكە ئەم تەرخانكردنەی سەرچاوە داراییەكانی دەوڵەت بۆ بواری سەربازی بە مانای وەبەرهێنان نییە، بەڵكو دەبێتە هۆی دروستكردنی بەربەست لەبەردەم پەرەپێدان، بەم هۆیە پرۆگرامی داماڵینی چەك لە جیهان لە بنەمادا دەگەرێتەوە بۆ چارەسەركردنی پرسەكانی جەنگ، ئاشتی، ئاسایش، سەقامگیری و پەرەپێدان لە دەوڵەتان (كامل محمد، ٢٠٠٨: ص٥١). بانكی جیهانی لە ساڵی (١٩٨٩)

دەوڵەتانی لەسەر بنەمای داهاتی تاك پۆلێن كرد و بێجگە لە دەوڵەتانی هەناردەكەری نەوت و سەنگاپورا، دەوڵەتانی تر كە بەرزترین ئاستی داهاتی تاكیان هەبووە، دەوڵەتانی دیموكراتیك بوون و ئەو دەوڵەتانەی كە لە ئاستی مام ناوەندیدا بوون دەوڵەتانێك بوون كە لە قۆناغی گواستنەوە دابوون بۆ دیموكراسی (**اخوان كاظمي، ٢٠٠١: ص١٠٩**).

(لۆسیان پای) دەربارەی پەرەپێدانی سیاسی بڕوای وایە كە گرنگترین ڕەگەزی پەرەپێدانی سیاسی بریتییە لە یەكسانی، كە بە شێوەی سروشتی و گشتی لەسەر هەموو تاكەكانی كۆمەڵگە جێبەجێ دەبێت، هەروەها بریتییە لە تواناكان كە بە مانای پەرەپێدان لە تواناكانی سیستەمی سیاسییە، كە پەیوەندی هەیە بەچۆنییەتی جێبەجێكردنی ئەركەكانی سیستەم كە ئەمەش كاریگەری لەسەر سەقامگیری سیستەم هەیە، ئەمەش ڕۆڵ و ئەرك دیاری دەكات لە كۆمەڵگەدا، هەروەها جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە گەشەپێدانی سیاسی بەدەست دێت لە ڕێگەی توانای سیستەمی سیاسی بۆ چارەسەركردنی كێشە و قەیرانەكان كە بریتین لە: قەیرانی ناسنامە، قەیرانی ڕەوایەتی، قەیرانی بەشداری، قەیرانی نفوز، قەیرانی دابەشكردن (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص ١٠٠).

پەرەپێدانی ڕاستەقینە و فراوان و گشتگیر و فرە ڕەهەند دەبێت بە پەرەپێدانی سیاسی دەست پێ دەكات، كە لەسەر بنەمای بەشداری سیاسی ڕاوەستاوە، ئەوەش فەراهەمكردن و ڕەخساندنی بواری مافەكانی مرۆڤە و هەروەها ڕێزگرتن لێی و هەڵبژاردنی پاك و بێگەرد و ئازادی ڕاگەیاندن، بۆ ئەوەی سیستەمی سیاسی ملكەچی چاودێری سیاسی و كۆمەڵایەتی بێت و سندوقەكانی دەنگدان ببێتە بڕیاردەری كۆتایی بۆ كارەكانی دەسەڵات، چونكە لە نەبوونی شەفافییەت و لێپێچینەوە لە داهاتەكانی ئابووری دەوڵەت خزمەتی گروپێكی بچووك و دەست ڕۆیشتوو دەكات و زۆرینەی هاووڵاتیان ئاستی داهاتیان

دادەبەزێت و دیاردەی بێکاری سەرهەڵدەدات و ئەمەش دەبێتە هۆی پەراوێزخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی.

دەتوانین بڵێین نەبوونی دیموکراسی بەمانای نەبوونی پەرەپێدانە، لەبەر ئەوە ئەو کۆمەڵگایانەی کە لەو دۆخە نالەبارە نادیموکراتیکەدا دەژین، ئەوە لەم دۆخەدا ئاسایشی نەتەوەییان نییە و بە پێچەوانەوە سیستەمی دیموکراسی دەبێتە مایەی پەرەپێدانی ڕاستەقینە و پەرەپێدانیش ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت بەشێوەی ڕاستەقینە و بەردەوام دەستەبەر دەکات، لەبەر ئەوە پەیوەندی لە نێوان دیموکراسییەت و ئاسایشی نەتەوەیی پەیوەندییەکی توندوتۆڵە و هیچ ئەلتەرناتیڤێکی تری نییە و نەبوونی یەکێك لەوانە دەبێتە هۆی شکستی دەوڵەت (غانم ساتیك، ٢٠١١: ص١).

### ٢.١.٥- گەشەپێدانی ئابووری:

بەهۆی گۆڕانکارییەکان و بەتایبەت بەجیهانیبوون، گۆڕانکاری لە سروشت و سەرچاوەکانی هێز کراوە، ئەمڕۆکە بازرگانی ئەلکترۆنیك، چالاکی ئابووری تۆڕی و گرنگی زانیاری، ئەمڕۆ ئاڵوگۆڕە ئابوورییەکان لە جۆری زانیارین نەك تەنیا کاڵایی. لێرەوە زاناکان بڕوایان وایە کە سەرچاوەی هێز دروست کردن گۆڕاوە و بۆ هەڵسەنگاندنی هێز فاکتەری تەکنەلۆژیا و گەشەی ئابووری هاتۆتەئاراوە لە تەنیشت پەروەردە کە وایکردووە ڕۆڵی جوگرافیا و سەبازی و ماددەی خاو کەمتر ببێتەوە (نای، ٢٠٠٨: ص٩٨).

لە سەردەمی بەجیهانیبوون بەهۆی گرنگی بواری ئابووری و بەرهەمهێنان و بەکاربردن و شۆڕشەکانی تەکنەلۆژی و زانیاری و پەیوەندی و بڵاوبوونەوەی بەرهەمهێنان لە هەموو جیهان، بەپێی ئامارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان وای کردووە کە لە نێوان ساڵانی (١٩٦٠ — ١٩٩٢)ـدا ڕێژەی هەژاری بۆ نیوە دابەزێت و لە دەوڵەتانی ناسراو بە "باشوور" ناوەندی داهاتی تاك لە نێوان

ساڵانی (١٩٥٠ – ١٩٨٠)ـدا دوو بەرامبەر بێت و (هیوا بە ژیان) کە پێوەرێکی نێونەتەوەییە لە نێوان ساڵانی (١٩٦٠ – ١٩٩٤)، (١٧) بەرامبەر بێت و ڕێژەی مردنی منداڵان زیاتر لە نیوە دابەزیوە و ڕێژەی نەخوێندەواری (٦٠٪) دابەزیوە و ڕێژەی دەستپێڕاگەیشتن بە ئاوی خواردنەوەی پاك (٤٠٪) لەساڵی (١٩٩٠) بۆ (٧٢٪) لە ساڵی (١٩٩٧) زیادی کردووە و ڕێژەی بە پیشەسازی کردن لە دەوڵەتانی ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات و ئەمریکای لاتین زیاتر بووە و لە دەوڵەتێکی وەکو (شیلی) تا کۆتایی (٩٠)ـەکانی سەدەی ڕابردوو (١) یەك ملیۆن کەس لە هەژاری ڕزگاری بووە (شولت، ٢٠٠٣: ص٩٠٤).

ڕەهەندی ئابووری لەسەردەمی بەجیهانیبووندا وایکرد دامەزراوەکانی وەك سندوقی دراوی نێودەوڵەتی، بانکی نێودەوڵەتی، ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی و ڕێکخراو و دامەزراوەکانی تایبەتمەند سەر بە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان هەروەها دامەزراوە هەرێمیەکان، کاریگەری لەسەر دەوڵەتان هەبێت و دەسەڵاتی دەوڵەت سنووردار بکات، کە ئەمەش سەروەری دەوڵەت کەم دەکاتەوە، چونکە ئەم ڕێکخراوانە سەروو نەتەوەیین و لەلایەکی ترەوە ئەم ڕێکخراوە نێونەتەوەیی و هەرێمیانە بەهۆی سروشتی کارکردنیان کاریگەرییان لەسەر بارودۆخی ناوخۆیی دەوڵەتان هەیە، لەم هەلومەرجەدا دەوڵەتان و ئەم ڕێکخراوانە پێویستیان بە سیستەمێکی کارا و چالاك هەیە و لێرەوە دیموکراسی ئەم سیستەمە جێگرەوەیە، بەتایبەت لە دەوڵەتانی لە دۆخی پەرەسەندندا، چونکە ئەم سیستەمە یارمەتی کۆمەڵ و ڕێکخراوە مەدەنی و تایبەتەکان و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان دەدات بۆ ئاوێتەبوون لەگەڵ پرۆسەی بەجیهانیبوون و یان ڕووبەڕووبوونەوەی (الزعیم، ٢٠١١: ص١١٩).

بەبێ بوونی ئابووریەکی پتەو و باش و ئاستێکی باش لە خۆشگوزەرانی پرۆسەی دیموکراسی پێش ناکەوێت، بۆ ئەوەی گرنگی بە ڕەهەندەکانی دیموکراسی بدەین پێویستە بایەخ بە پەرەپێدانی ئابووری کۆمەڵگە بدرێت، ئەوەش دەبێت

لەسەر بنەمای ئابووری ئازاد و كراوە لە ئاستی دەوڵەت كە هەموو لایەك تیایدا بەشێوەیەكی ئازاد و دادپەروەرانە هەلی كار و چالاكی ئابووری یەكسانیان بۆ دابین بكرێت و گرنگی بە خۆشگوزەرانی كۆمەڵگە بدرێت و ئاسایشی خۆراك مسۆگەر بكرێت، چونكە لایەنی ئابووری بە بڕبڕەی پشتی سیستەمی سیاسی هەژمار دەكرێت، بەتایبەت سیستەمێكی سیاسی دیموكراسی، بۆیە ئابووری لە سیستەمێكی دیموكراسی لەسەر سێ ڕەگەزی سەرەكی و جۆری پەیوەندی نێوانیان ڕادەوەستێت، وەكو: ڕەگەزی بەكاربەر، بەرهەمهێنەر و دەوڵەت و لێرەوەیە كە دەوڵەت ئەركی دروستكردنی هاوسەنگی و پەیوەندییەكی تەندروستە لە قازانجی هاووڵاتیان بۆ بەرەوپێش چوونی ئابووری دەوڵەت و دابینكردنی خۆشگوزەرانی (ژاژڵەیی، ٢٠٠٦: ل١١٥).

ئەو دەوڵەتانەی كە خاوەن سیستەمێكی دیموكراسین، بەبەراورد لەگەڵ دەوڵەتانی نادیموكراسی لە بواری ئابووریدا ڕوو لە گەشەن، بەهۆی ئەوەی كە لە سیستەمێكی دیموكراسیدا بازاڕی ئابووری ئازادە، بە مانا بەرفراوانەكەی كە هاتوچۆی تاك، مرۆڤ، زانیاری و زانست و تەكنەلۆژیا و بیر و هزر، سەرمایە و ... هتد، بە ئازادی ئاڵوگۆڕ دەكرێت، ئەمەش دەبێتە هۆی هاتنەئارای هەل و مەرجێك كە گەشەكردنی ئابووری دەوڵەتی لێی بكەوێتەوە و ئاستی ژیانی تاك بەرز ببێتەوە، كە دەبێتە هۆی سەقامگیری كۆمەڵگە، ئەمەش لە سیستەمێكی دیموكراسی دێتەدی بەهۆی ئەوەی كە:

١- لە سیستەمێكی دیموكراسیدا سەروەری یاسا و سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری هەیە، ئەمەش وا دەكات كە باشتر مافی خاوەنداریەتی پارێزراو بێت.

٢- دەستێوەردانی سیستەم كەمترە لە بازاڕ و ئەمەش بوار بۆ قۆرخكاری دەوڵەت یان دەسەڵاتداران كەمدەكاتەوە.

٣- لە سیستەمێکی دیموکراسیدا کەمتر کۆسپ لەبەردەم پەیوەندییە ئابوورییەکان لەناوخۆ و دەرەوە دادەنرێت و ڕێگە بۆ هاتوچۆی ئازادی سەرمایە و کالاّ و ... هتد، خۆشدەکرێت.

ئەگەر دیموکراسی لەسەر بنەمای یاسایی و دامەزراوەیی بەهێز و پتەو بونیات نرابێت، ئەوە دیموکراسی چوارچێوەیەکی سەقامگیر بۆ چالاکی ئابووری فەراهەم دەکات، بۆ ئەوەی کە ئەم چوارچێوەیە بە باشی کار بکات، پێویستە کارەکتەرە سیاسییەکان گرنگی بە هەڵبژاردنەکان بدەن وەك میکانیزمێك بۆ لێپێچینەوە هەژمار بکەن و هەست بە مەترسی بکەن دەربارەی ڕەفتارەکانیان. کە هەم یاسا و سیستەم و هەم ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و هاوولاّتیان دەتوانن چاودێرییان بکەن، سیستەمێکی سیاسی کە کێبڕکێی تێدایە ئەوە گەندەڵی کەم دەکاتەوە، چونکە ئەم جۆرە سیستەمە دەبێتە سەرچاوەی لێکۆڵینەوە لە گەندەڵی، لەم سیستەمانەدا باشترین سزا لە کاتی هەڵبژاردن دایە و ڕێگەگرتنیش لە گەندەڵی دەبێتە هۆی پەرەسەندنی زیاتری دەوڵەت و دابینکردنی خۆشگوزەرانی زیاتری هاوولاّتیان و زیاتربوونی متمانە لەنێوان هاوولاّتیان و سیستەمی سیاسی و بەرزبوونەوەی ڕەوایەتی سیستەم (ڕۆژئەیکەرمان، ٢٠٠٧: ل١٨٤).

هانتگتۆن لە کتێبی (شەپۆڵی سێیەم)ـدا دەڵێت: ((کە لە شەپۆڵی یەکەمی دیموکراسی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، دیموکراسییەت لە باکووری ئەوروپا سەری هەڵدا، کە داهاتی نەتەوەیی لە نێوان (٣٠٠) تا (٥٠٠) دۆلار بوو بۆ هەر تاکێك و لە نێوان ساڵەکانی (١٩٢٠) و سەرەتایی دەیەی (٣٠) بە چەندین هۆکار قەیرانی ئابووری ڕوویدا، کە بووە هۆی کاردانەوەی پێچەوانەوە بۆ دیموکراسی و دەسەلاّتی نادیموکراتیك زاڵ بوو. ئەم گۆڕانکارییە بووە هۆی جیاوازی لە نێوان سیستەمە دیموکراتیك و نادیموکراتیکەکان)). دواتر لە شەپۆڵی سێیەمدا پەیوەندی دەبینێت لە نێوان گەشەی ئابووری دەوڵەتان و بەرزبوونەوەی داهاتی

تاك و هەنگاونان بەرەو ديموكراسی. واتا پەیوەندی هەیە لە نێوان گەشەی ئابووری و ديموكراتیزاسیۆن (اخوان **كاظمی**، ٢٠٠١: ٢ ١١٠). بەهۆی نەبوونی ديموكراسی لە زۆر لە دەوڵەتانی كیشوەری ئەفریقیا، نەیانتوانیوە سوود لە سەرچاوەكانی ئابووریان وەربگرن و نەبوونەتە خاوەنی تەكنەلۆژیای پێشكەوتوو، بۆ نمونە (٨٠٪) كانزاكانی زێڕ و پڕ بەهاكان لە ئەفریقیایە، بەڵام تاوەكو ئێستا چاویان لە یارمەتیەكانی دەوڵەتانی پێشكەوتوو و نەتەوە یەككگرتووەكان بۆ یارمەتیدانیان (ڕەسول شینكی، ٢٠١١: ل٤٣٤). ئەمەش وا دەكات كە ئاسایشی نەتەوەییان بەردەوام لە ژێر هەڕەشە و مەترسیدا بێت.

### ٣.١.٥- توانایی سیستەم:

توانای سیستەمی سیاسی بریتییە لەو توانایەی كە سیستەم هەیەتی بۆ چارەسەركردنی گیروگرفت و كێشەكان، بۆ ڕێگەگرتن لە لێكترازان و ڕێگەگرتن لە ناسەقامگیری كە لەناو كۆمەڵگەدا ڕوو دەدات. توانای سیستەم لە پەرەپێدانی سیاسی ڕێكخستنی تواناكانی سیستەمە لە بەرزكردنەوەی توانای دامەزراوەیی بەشێوەی ڕێكخراو كە بریتییە لە دادپەروەری لە دابەشكردن و داهێنان و خۆگونجاندن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی گۆڕانكارییەكان، توانای سیستەمی سیاسی لەسەر ڕێكخستنی ڕەفتاری تاك و گروپەكان لەناو كۆمەڵگە بەپێی یاسا ڕادەوەستێت و دەركردنی ئەو بڕیارانەی كە پەیوەستن بە كۆكردنەوەی سەرچاوەكان و مۆبلیزەكردنی توانا مرۆییەكان و دابەشكردنی سەرچاوەكان بەپێی بنەمای دادپەروەری (**حسين كاظم الشمري، ٢٠١٣: ص٣**).

گەشەسەندن، پێشكەوتن و ئاوەدانی بەرئەنجامی هەماهەنگی و سەقامگیری و ئارامی و بەڕێوەبردنی باش و بە كۆمەڵە كە لە كۆمەڵگەیەك كە ململانێ و جیاكاری مەزهەبی و نەتەوەیی و هەژاری هەبێت، ئەوا یەككگرتوویی نەتەوەیی بوونی نییە و سەرمایەی كۆمەڵایەتی لاوازە، لە كۆمەڵگەی ديموكراتیكدا

سەرمایەی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی سەقامگیری و ئاسایش و یەکگرتوویی و متمانە و بەشداری سیاسی هاووڵاتیان، کە ئەویش یارمەتی یەکپارچەیی و یەکگرتوویی نەتەوەیی دەدات، کە کاریگەری لەسەر ئاسایش هەیە. لە دەوڵەتێکدا کە سیستەمێکی سیاسی کارامە و ئاستێکی باشی سەرمایەی کۆمەڵایەتی هەیە، دەوڵەت و کۆمەڵگە تەواوکەری یەکترن و بەرپرسیاریەتی پەرەدەسێنێت لە کۆمەڵگە، ئەرکی دەوڵەت کەمتر دەبێتەوە (عباس زادە و کرمی، ٢٠١١: ص٥٠).

سیستەمێکی سیاسی کارامە، کە خاوەن کارایی و ڕەوایەتییە، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی چونکە بەپێی ویست و داواکاری هاووڵاتیان و باوەڕ و متمانەی جەماوەر کار دەکات و بەهۆی ئەوەی کە سیستەمێکی سەقامگیرە، کەواتە سیستەمی سیاسی بریتییە لە چەندین یەکە و میکانیزم بۆ چارەسەرکردن و ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە و گیروگرفتەکان کە دامەزراوەکانی دەوڵەت پێی هەڵدەستن (صادق الشریف، ٢٠٠٧: ص٩٧). سیستەمی دیموکراسی بەرپرسیارە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی بۆ بەدیهێنانی ئازادی و یەکسانی و هەروەها بەرپرسە لە چارەسەرکردنی قەیرانە ئابوورییەکان، چونکە ئەوە هێز و توانای دەوڵەتی دەوێت بۆ کۆنترۆڵکردنی و ئەگەر سیستەم ئەم تواناییانەی نەبوو، بنەماکانی دیموکراسی دەکەوێتە ژێر پرسیار (بشیریە، ٢٠١١: ص٢٥٥).

ئەو سیستەمە سیاسییەی کە باوەڕی بەهێز و بە ڕەوایەتی خۆی هەیە و لە ڕاستیشدا دەسەڵاتێکە کە بەشێوازێکی دیموکراسیانە ڕەوایەتی لە هاووڵاتیانەوە وەرگرتووە، ئەگەر ڕووبەڕووی کێشە و گرفتی سیاسی، سەربازی، ئابووری و ئاسایشی بێتەوە، باشتر دەتوانێت خۆی لە بەرامبەر ئەو قەیرانانە ڕابگرێت و چارەسەری گونجاوی بۆ بدۆزێتەوە و بە پێچەوانە سیستەمێکی نادیموکراسی کاتێك ڕووبەڕووی ئەم جۆرە کێشانە دەبنەوە توانای بۆ چارەسەرکردن و تێپەڕاندنی قەیرانە کە لاوازە و تووشی ناسەقامگیری و قەیران دەبنەوە (بشیریە، ٢٠١١: ص

١١٥). ئەزموونە مێژوویەکانیش ئەم ڕاستیانە دەردەخەن بۆ نمونە لە دەوڵەتێك وەکو یۆنان کە لە ساڵی (٢٠١٣) تووشی قەیرانی ئابووری بووەوە بەڵام چونکە سیستەم دیموکراسی بوو دەوڵەت توانی داخوازی کێشە و گرفتەکانی هاووڵاتیان بداتەوە و چارەسەری قەیرانی ئابووری بکات. بەڵام بۆ نمونە لە دەوڵەتێکی نادیموکراسی وەکو تونس کاتێك کە تووشی گێروگرفت و داتەپینی ئابووری بووەوە بووە هۆی ڕووخانی سیستەم، چونکە توانا و کارامەیی سیستەمی سیاسی لە تونس بەهۆی نادیموکراسی بوونی لاواز بوو و نەیتوانی چارەسەری کێشە و گێروگرفتەکان بە شێوازێکی ئاشتیانە بکات.

بێهێزی دەسەڵات بنەمای سەروەری دەوڵەت لاواز دەکات، چونکە سیستەمی نوێی جیهانی وایکردووە کە ئەو دەوڵەتانەی کە لاوازن ببنە هۆی کێشە و گرفت بۆ دەوڵەتانی تر، بۆیە ئەوە دەرفەت دروست دەکات بۆ دەستێوەردانی دەرەکی و یان چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکانی دەوڵەت. لاوازی و بێهێزی دەوڵەت لە ڕاستیدا بەمانای نەبوونی توانای سیستەم بۆ وەڵامدانەوە و هەروەها نەبوونی ڕەوایەتی و نەبوونی دامەزراوەی دیموکراسییە (فۆکۆیاما، ٢٠٠٩: ص٢٠٧).

توانای سیستەمی سیاسی، پلاندانان و ڕێکخستن و جێبەجێ کردنی سیاسەتی ئاسایشی نەتەوەییەکان لەخۆ دەگرێت. هەروەها هەڵسەنگاندنی هەڕەشە و مەترسییەکان و بڕیارەکان و دارشتنی سیاسەتەکان و تەرخانکردنی سەرچاوەکان لەو بوارەدا جێبەجێ دەکرێت، بەم مانایە کە سیستەمێکی سیاسی گونجاو، یەکگرتوویی لە بڕیارەکان و جێبەجێ کردنیان لەخۆ دەگرێت. توانای سیستەمی سیاسی دیموکراسی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ڕەوایەتی و یەکگرتوویی هەیە و دەگوترێت کە هەڵبژاردنی ئامانجەکان و ئامرازەکان لە زەمینەیەکی ڕاوێژکردندا دەکرێت و لێرە گرنگی بە ڕای گشتی دەدرێت، واتە بڕیارە ئاسایشییەکان دوور لە قۆرخکاری و گەندەڵی و بە پشتیوانی جەماوەری دەدرێت، بەڵام لە دەوڵەتانی نادیموکراسی سەرچاوەکانی پێویست بوونی نییە و توانای

سیستەم لاوازە و ئەمەش کاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە و لەسەر هەڕەشە و مەترسییەکان ڕێککەوتنی گشتی نییە، یان بەهۆی زاڵبوونی تاك یان پارت و لایەنێك، ئەوە ڕێککەوتنی نەتەوەیی فەرامۆش دەکرێت کە کاریگەری نەرێنی لەسەر توانای سیاسی دەبێت، واتە ڕەوایەتی لاواز، توانای سیستەم بۆ بەرەنگاربوونەوەی مەترسییە ئاسایشییەکان لاواز دەکات (وەکو میسر، لیبیا، سوریا و ... هتد) **(آذرواین مون، ١٩٩٨: ص٥٢).**

لە سیستەمێکی نادیموکراسیدا دیاردەی دەستێوەردان و هەڕەشە لەسەر ئاسایش زیاتر دەبێت، بە پێچەوانەوە سیستەمێکی دیموکراسیی سیستەمێکی کراوەیە و هەموو هێز و لایەنەکان تێدا بەشدارن و لە ڕێگەی بەشداری هێز و لایەنەکانەوە ئاستێکی بەرز لە سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەستەبەردەکرێت، بۆیە ئاسایش بەبێ دیموکراسی بوونی نییە و سەقامگیریش بەبێ ئازادی بوونی نابێت و هەموو هەوڵێکیش بۆ فەراهەم کردنی ئاسایش و سەقامگیری لە دەرەوەی سیستەمێکی دیموکراسی بێ ئەنجام دەبێت. سەرکوتکردنی سیاسی تەنیا کاریگەری نەرێنی لەسەر ئاسایش دانانێت بەڵکو سەردەکێشێت بۆ کێشە و قەیرانی قوڵتر کە دواجار دەبێتە مایەی هەڵوەشانەوە و ڕووخانی سیستەم، چونکە ئەگەر سیستەم توانای ئەوەی نەبێت کە چارەسەری کێشە و گرفتەکان بکات، ئەوە هەڵوەشانەوەی سیستەم دەبێتە ئەگەرێکی چاوەڕوان کراو **(محفوظ، ٢٠١٢: ص٢).**

بەرفراوانی و ئاڵۆزی پێویستەکانی مرۆڤ لە کۆمەڵگەیی هەنوکەیی و سەرهەڵدانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیە نوێیەکان و هەروەها جیاوازی و ئاڵۆزی و فرەیی مەترسی و کێشەکان وایکردووە کە بۆ دەستەبەرکردنی ئاسایشی جێگیر دەبێت دەوڵەت بتوانێت توانای وەڵامدانەوەی پێویستە جیاوازەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری لە ئاستی ناوخۆیی هەبێت و لە ئاستی دەرەکیش خاوەن پێگە و پرستیژی شیاو بێت و بە قەیرانێك نەکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسییەوە،

چونکە ئاستی شیکردنەوەی ئاسایش تەنیا دەوڵەت نییە بەڵکو تاك و گروپ و ناسنامەکانیانە (نصری، ٢٠٠٥: ل٣١٧).

قەیرانی ناکارامەیی سیستەمە سیاسییەکان لە ڕووی توانای دابینکردنی ئاسایش و خزمەتگوزاری سەرەکییەکان بۆ کۆمەڵگە سەرچاوە دەگرێت، لە کێشە و گرفتەکانی دارایی، ئابووری، جەنگ، پرسی داهات یان بەرزبوونەوەی داواکارییەکانی هاووڵاتیان لە سیستەم بە بەراوردکردنی خۆیان لەگەڵ دەوڵەتانی تر و ... هتد، ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە توانا و کارامەییان لە ئاستێکی بەرزدایە باشتر دەتوانن چارەسەری ئەو کێشە و گرفتانە بکەن و کاتێك قەیرانی ڕەوایەتی و کارامەیی پێکەوە سەرهەڵدەدەن، پاراستنی دەسەڵات بۆ دەسەڵاتداران بەبێ میکانیزمی توندوتیژی و سەرکوتکردن زۆر ئەستەم دەبێت و ئەگەر قەیرانەکەش قەیرانێکی قوڵ و جیددی بێت تەنانەت هێزی سەربازی و توندوتیژی دەسەڵاتیش توانای کۆنترۆڵ کردنی هاووڵاتیانی نامێنێت و تەنانەت هێزە چەکدارەکانیش دەبنە بەشێك لە نارەزایەتی (بشیریە، ٢٠٠٩: ص١٣٩).

کاتێك کە بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری، کلتووری، ئاسایش و ... هتد، خراپ دروست دەبێت. ئەوە دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی نارەزایی هاووڵاتیان لە دەسەڵاتی سیاسی، ئەم نارەزایەتیانەش هەندێکجار لەچوارچێوەی دامەزراوەکانی ئۆپۆزیسیۆن لە ڕێگەی میکانیزمی جۆراوجۆر ئاراستە و مۆبلیزە دەکرێت، لە هەلومەرجێکدا کە دیموکراسییەت هەیە نارەزایی هاووڵاتیان لە ئاستێکی نزمدایە، بەڵام لە ڕژێمە نادیموکراسییەکان بەردەوام بەهۆی هۆکاری جۆراوجۆر و گوێ پێنەدان بە داواکاری و ویستی هاووڵاتیان و پێشێل کردنی مافە بنەڕەتیەکانی هاووڵاتیان ئەوە بەردەوام ئەگەری سەرهەڵدانی نارەزایی لە ئارادایە (بشیریە، ٢٠١١: ص١١٦).

ئەگەر سیستەمی سیاسی لەلایەن ڕای گشتیەوە پشتیوانی لێ بکرێت، ئەوا بەشداری سیاسی و چالاکی هاووڵاتیان لە ئاستێکی بەرزە، ئەو کاتەش دەتوانرێت

بواری پێویست بۆ پەرەپێدانی تواناکانی دەوڵەت بڕەخسێنێت و ئەو هۆکارانەی کە کاریگەرییان لەسەر پەرەپێدانی تواناکانی دەوڵەت هەیە بریتین لە سەقامگیری سیاسی، توانا و کارامەیی بەرپرسان، چۆنییەتی ڕێبەرایەتی، تێگەیشتن و وشیاری هاووڵاتیان و ڕاددەی پشتگیری کردن لە سیاسەتەکانی دەوڵەت (قەوام، ٢٠١٢: ل ١٢٦). لەسایەی کێشە و ململانێ و توندوتیژی سیاسی ئاسایشی نەتەوەیی دەستەبەر نابێت و هەروەها لە ڕێگەی هێزی سەربازیش دەستەبەر نابێت، چونکە ئاسایشی نەتەوەیی بەپێی تواناکانی سیستەم پێوانە دەکرێت نەوەك هێزی سەربازی (**ذكي ابراهيم، ٢٠١٢: ص٥**).

هەروەها دەوڵەتێك کە تووشی قەیران و تێکهەڵچوونی ناوخۆیی هاتووە، ناتوانێ لە بەرامبەر دەوڵەتانی دەرەوەدا خاوەنی پشتگیرییەکی پتەو بێت، چونکە قەیرانی ناوخۆیی ڕێگا بۆ دەستێوەردانی دەرەکی خۆش دەکات، لایەنەکەی تری ئەم پرسەش جێگای هەڵوێستەیە، ئەویش ئەوەیە ستراتیژی دەوڵەتێك لە بەرامبەر هەڕەشەی هێزەکیەکانی دەرەوەدا، تواناکانی ئەم دەوڵەتە بۆ وەدیهێنانی یەکێتی نەتەوەیی، ئارامی سیاسی و یەکگرتوویی کۆمەڵایەتی زیاتر دەکات، شێوازی وەڵامدانەوەی هەڕەشەکان و دوژمنانی دەرەوە، لە هەردوو بەشی دەرەوە و ناوخۆدا هەم دەتوانێت ببێتە هۆی بەهێزکردنی یەکێتی و سەقامگیری و هەم دەتوانێ ببێتە هۆی لاوازکردنیان، زیادەڕۆیی سەبارەت بە پێداگری بۆ گەیشتن بە ئامانجە دەرەکیەکان دەتوانێ ببێتە هۆی دژایەتی کردنی هاووڵاتیان (ڕەوشەندڵ، ٢٠٠٩: ل٣٦).

لەلایەکی تر لە سیستەمێکی نادیموکراسی، سیستەم هەوڵدەدات کار لەسەر پەرتەوازەکردنی زەینی تاك بکات بۆ ئەوەی دۆخێك دروست نەبێت کە ببێتە هۆی دروست بوونی ئۆپۆزیسیۆنێکی ڕێکخراو و کارا و چالاك لە دژی سیستەم، چونکە زۆرجار دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی وەکو: پارتی سیاسی، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دەبنە کەناڵێك بۆ دەربڕینی ویست و داخوازی و

داواکارییەکان و دواتر دەربڕینی نارەزایی لەهەمبەر پێشێلکردنی مافەکانیان و رەچاونەکردنی بەرژەوەندییەکانیان، بەڵام لە سیستەمە دیموکراسییەکان بەهۆی کراوەیی سیستەم و هەبوونی کەناڵ و دامەزراوەی جۆراوجۆر کە خۆیان بەشێکن لە سیستەمی سیاسی ئەو دەوڵەتە وادەکات لێکترازان و ناکۆکی نەکەوێتە نێوان تاك و گروپە جۆراوجۆرەکان و توانای سیستەم بۆ وەڵامدانەوەی داواکارییەکان لە ئاستێکی بەرز دابێت (بشيريه، ۲۰۱۱: ص۱۱۸).

هەروەها (لۆسیان پای) باسی لە قەیرانی یەکگرتوویی کردووە و بە بڕوای ناوبراو چارەسەری گونجاو بۆ ئەم قەیرانە لەسەر توانای سیستەم بۆ ڕێکخستنی سیستەمی سیاسی دەگەڕێتەوە، دەربارەی ئەوەی کە سیستەم تا چ ڕادەیەك دەتوانێت تۆڕی پەیوەندییەکان ڕێك بخات، لەنێوان گروپە جیاوازەکان و بەرژەوەندییە جیاواز و ناکۆکەکان، هەروەها لە نێوان دەسەڵات و هاووڵاتیان، بەم مانایە کە سیستەمی سیاسی گرنگی بە هەموو داواکارییەکان دەدات و هەر کاتێك سیستەمێکی سیاسی کارامە هەبوو، ئەوە توانای بەرز دەبێتەوە (صادق الشريف، ۲۰۰۷: ص۱۱۸).

قەیرانی یەکگرتوویی لە هەوڵەکانی دەوڵەت بۆ ئەسیمیلاسیۆنی نەتەوە و گروپە کۆمەڵایەتی و سیاسییە جیاوازەکان دروست دەبێت بە مەبەستی ئەوەی کە هەست بە جیاوازی نەکەن، کە ئەمەش دیسانەوە دەبێتە هۆی قەیرانی یەکگرتوویی و هەروەها ئەمە لە ڕێگەی دەستەبەرنەبوونی بەرژەوەندییە جیاوازەکان و نەبوونی کەناڵ و دامەزراوەیی پێویست بۆ ئەم مەبەستە بەرجەستە دەبێت، هەروەها ئەمە لە ڕێگەی هەوڵی دروستکردنی کلتوورێکی هاوبەش کە لایەن دەوڵەتەوە ئەولەویەتی پێ دەدرێت بە بێ گوێدان بە کلتوورەکانی تر دروست دەبێت (صادق الشريف، ۲۰۰۷: ص۱۳۱).

کەواتە تا یەکگرتوویی زیاتر بێت، توانای سیستەمی سیاسی زیاتر دەبێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی لە بەرهەمهێنان و دابەشکردن، ئەگەر ئاستی

یەکگرتوویی کەم بێت توانای سیستەمی سیاسی کەم دەبێت لە دەستەبەرکردنی ئامانجی هاوبەشی کۆمەڵگە کە ئەمەش کاریگەری لەسەر پێشکەوتنی دەوڵەت هەیە (صادق الشریف، ٢٠٠٧: ص١٣١). سیستەمێکی سیاسی کارامە بە مانای بەڕێوەبردنی کۆمەڵگەیە بەشێوازێکی لێهاتوانە، لە ڕووی دابینکردنی کاڵا و خزمەتگوزارییە گشتییەکان و بەڕێوەبردنی ئابووری نیشتمانی و پاراستنی ژینگەدێت و پەیوەندی بە ئاستی بەرزی بیرۆکراسی و سەربەخۆیی ئەندامان لە بەرژەوەندییە تایبەتەکانیان و زاڵبوونی بەرژەوەندی گشتی هەیە (محمد مسعد، ٢٠٠٩: ص١٤٤).

بۆیە مەبەست لە کارامەیی ئەوەیە کە دەوڵەت خەریکی کۆمەڵێك کێشە بێ کە لە ڕوانگەی هاوولاتیانەوە بە کێشە و گرفتە گرنگەکانی دادەندرێت و بە کردەوە دەوڵەت لەو بوارەدا بەباشی هەڵدەسەنگێندرێ. سیستەمی سیاسی کارامە لەکاتی بارودۆخە گرژەکاندا کە بەهۆی شەڕ، هەڕەشەی شەڕ، ململانێی توندی نێونەتەوەیی، گێروگرفتی توندی ئابووری، هەروەها قەیرانەکانی لەم چەشنە ڕوودەدەن و بەتایبەتی گرنگی بە دەست دێنێ (داڵ، ٢٠٠٣: ل ١٣٥).

بەرپرسیارەتی وادەکات کە (کەناڵێکی دڵنیایی) دروست بێت و تەنیا بۆ دامەزراوەکانی دەوڵەت نییە بەڵکو دامەزراوە و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و کەرتی تایبەت مافیان هەیە کە داوا لە بەرپرسان بکەن ڕوونکردنەوە بدەن لە چۆنییەتی بەکارهێنانی دەسەلاتیان و جێبەجێ کردنی ئەرکەکانیان و ڕەخنەکان لەبەرچاو بگرن کە ئاراستەیان کراوە، کە ئەمەش کۆمەڵێك پێوەر لەخۆ دەگرێت وەکو: پارتە سیاسییەکان، ئازادییە مەدەنی و گشتییەکان، کارامەیی سیستەمە سیاسییەکان لەسەر بنەمای بەدیهاتنی ئامانجە گشتییەکانی سیستەم کە بریتین لە ئەرکە گشتییەکان کە دەتوانین بەچوار پێوەر هەڵیبسەنگێنین:

١. دروستکردنی پەیوەندی و هەماهەنگی.
٢. چارەسەرکردنی کێشە و ململانێ و پێکدادانەکان.

٣. خۆگونجاندن لەگەڵ هەلومەرجی نوێ.
٤. بەدەستهێنان و دەستەبەرکردنی ئامانج و بەڵێنەکان.

یەکێك لە گرنگترین ئەرکەکانی سیستەمە سیاسییەکان لەسەردەمی مۆدێرندا رێکخستنی ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیە بە مەبەستی خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان لە رێگەی دابینکردنی کار، سەقامگیری بازاڕ، دابەشکردنەوەی دادپەروەرانەی سامان و سەرچاوە ئابوورییەکان و پەرەپێدانی ئابووری، چونکە لەسەردەمی مۆدێرن پرسە ئابوورییەکان بنچینە و رەهەندێکی سیاسییان هەیە، سیستەمی سیاسی وەك میکانیزمی پەیوەندی و بەیەکگەیاندنی ئابووری و کۆمەڵایەتییە، ستراتیژی بۆ سیستەمی ئابووری و پەرەپێدان و گەشەکردنی سەرمایە و دابەشکردنی دادپەروەرانەی سەرچاوەکان، راکێشان و بەدەستهێنانی پشتگیری هاووڵاتیانە بۆ سیستەمی سیاسی (بشیریە، ٢٠١١: ص١١٢-١١٣).

بۆ پاراستنی ئاسایش دەبێت جیاوازی لە نێوان دەوڵەتی دیکتاتۆر یان تۆتالیتەر و سەرکوتکەر لەگەڵ دەوڵەتی بەهێز بکەین، (جۆیل میگدال)[*] لە کتێبی (کۆمەڵگاکانی بەهێز و دەوڵەتانی لاواز)، بە روونی باس لەوە دەکات و دەوڵەتانی تۆتالیتەر و ناوەندگەرا و زۆردار لە رێگەی سەرکوت لە هەوڵی یەکێتی و یەکگرتووین بەڵام دەوڵەتانی بەهێز سیستەمێکی کارامەن کە بە پاڵپشتی بە رێککەوتنی گشتی و رەزامەندی ئەکتەرەکان و تاکەکان، بەردەوام هێزی سیاسی خۆیان پەرەپێدەدەن (**عطا زادە، ٢٠٠٨: ص١٠٣**).

هەروەها بەشداری کارا و کاریگەر و چالاکانەی تاك لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و بەهێزبوونی سەرمایەی کۆمەڵایەتی بەگشتی دەبێتە هۆی

[*] بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە:

- Migdal, Joel S. **Strong Societies and weak States (State-Society Relations and state Capabilities in the Third World)**, Princeton University Press, UK, 1998.

بەهێزتربوونی ئاسایشی کۆمەڵایەتی و بە پێچەوانەوە دەستێوەردانی سیستەم لە کۆمەڵگەی مەدەنی کە وەکو زەمینە و بەستێنی بەرهەمهێنانی سەرمایەی کۆمەڵایەتی کار دەکات دەبێتە هۆی نەبوونی ئاسایشی کۆمەڵایەتی، کە ئەمەش کاریگەری لەسەر متمانەی نێوان هاووڵاتیان و گەشەی بەها و پێوەرەکانی دیموکراسی هەیە کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی ڕەوایەتی سیستەمی سیاسی، بۆیە بەهێزکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی و بەهێزکردنی سەرمایەی کۆمەڵایەتی کاریگەری لەسەر ئاسایشی کۆمەڵایەتی هەیە کە هەم تاك و هەم کۆمەڵگە هەست بە ئاسایش دەکات (تقی لو، ٢٠٠٥: ص٢٥٥).

هەروەها پەیوەندی هەیە لەنێوان ئاست و ڕێژەی بەشداری هاووڵاتیان لەگەڵ بەرزبوونەوەی ویست و داواکارییەکانی جەماوەر لە سیستەمی سیاسی، بەم مانایە کە تا زیاتر هاووڵاتیان بەشدار بن لە پرۆسەی سیاسی داواکاری نوێیان زیاتر دەبێت لە سیستەمی سیاسی، چونکە تاوەکو ئەم داواکارییانە زیاتر بێت ئەمە توانای وەڵامدەرایەتی سیستەم زیاتر دەکات (صادق الشریفی، ٢٠٠٧: ص١١٧).

بوونی دامەزراوەی بەهێز لە دەوڵەتدا کە لە ڕێگەی بەشداری هاووڵاتیانەوە دروست دەبێت، دەبێتە مایەی سەروەری یاسا و مافە مەدەنییەکان و دروستبوونی ڕاگەیاندنی ئازاد و کارا و چالاك و دروست بوونی سیستەمێکی هەڵبژێردراو کە نوێنەرایەتی گەل دەکات، لێرەوە گرنگی دامەزراوەکان دەردەکەوێت بەهۆی بەشداری سیاسی لە پرۆسەیەکی دیموکراسی، چونکە ئەوانەی سیاسەتی دەوڵەت بەڕێوە دەبەن بەرپرسن لە بەرامبەر هاووڵاتیاندا، بوونی دامەزراوەی بەهێز لە ڕێگەی بەشداری هاووڵاتیان، سەرچاوەی دیموکراسی و پاراستنی ئاشتییە (بارانی، ٢٠١٢: ص٣٠٨).

**٤.١.٥ـ سەقامگیری:**

سەقامگیری سیستەمی سیاسی یەکێکە لە بنەماکانی دەوڵەتێکی سەرکەوتوو و دەبێتە هۆی پێشکەوتنی کۆمەڵگە لە هەموو بوارەکان، هەمیشە ئەو دەوڵەتانە سەقامگیرن توانیویانە ئازادی و ئاسایش بۆ هاووڵاتیانیان دابین بکەن. سەقامگیری سیاسی یەکێکە لە مەرجە هەرە سەرەکییەکانی پرۆسەی پەرەپێدان و لەهەمان کاتدا ئامانجی سەرەکی ئەو پرۆسەیەیە، مامەڵەی نادادپەروەرانەی دەوڵەت لەگەڵ پێکهاتە جیاوازەکانی ناو دەوڵەت دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی ئاژاوە و ناسەقامگیری سیاسی لە دەوڵەتدا، لە سیستەمە نادیموکراسییەکان چینێکی دیاریکراو دەست بەسەر دەوڵەتدا دەگرن، دەسەڵاتیش لە خزمەت بەرژەوەندی یەك پێکهاتە یان چینێك یان گروپێکدا دەبێت، لە دەرئەنجام ئەم نایەکسانی و نادادپەروەریەی دەوڵەت لەبەرامبەر پێکهاتە و لایەنەکانی تر وادەکات، چەندین بزووتنەوەی سیاسی ـ کۆمەڵایەتی دروست بن و ئامانجیان بریتی بێت لە کۆتایی هێنان بەو نایەکسانی و نادادپەروەری و پەراوێزخستنە یان هەوڵدان بۆ جیابوونەوە لە دەوڵەت بۆ ئەوەی کە بتوانن گوزارشت لە ناسنامە و بەرژەوەندی خۆیان بکەن، لە ئەنجامی ئەم ململانێیە کە ئاماژەمان پێدا، ناسەقامگیری سیاسی سەر هەڵدەدات (کەریم مەحمود، ٢٠٠٩: ص١٥٤-١٥٥).

لە دەوڵەتانی نادیموکراتیك و دواکەوتوو ئاسایشی دەسەڵاتداران یان ڕژێمی سیاسی لەگەڵ ئاسایشی نەتەوەیی بە یەك دادەنرێت، لێرەوە حکومەتە نادیموکراتەکان بە سەرکوتکردن هەوڵی سەقامگیری و پاراستنی ئاسایش دەدەن کە ئەوەش لە ئەنجامدا دەبێتە زیاتربوونی هەڕەشە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی **(آذر و جونك، ١٩٩٨: ص٤٥)**. بۆ ئەوەی سیستەمی دیموکراسی بەهێز بێت، پێویستە سیاسەتێکی عەقڵانی پەیڕەو بکات و سیاسەتەکانی خۆی لەسەر

بنەماکانی دیموکراسی دابڕێژێت. ئەمەش لە دەوڵەتێکدا دەکرێت کە لە ڕووی ئاسایش و دامەزراوییەوە سەقامگیر بێت، چونکە ئاسایش و سەقامگیری سیاسی دەبنە فاکتەرێك بۆ ئەوەی کە کاریگەری ئەرێنیان هەبێت لەسەر هەموو بوارەکانی تری ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەمەش دەبێتە هۆی دروستبوونی سەرمایەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و دەستەبەربوونی ئاشتی کۆمەڵایەتی (بەلخەیی، ٢٠١٣: ص٧٠).

دیموکراسی پێویستی بە گەرەنتی نییە، بەڵکو خودی دیموکراسییەت گەرنتییە بۆ ڕێگەگرتن لە ناسەقامگیری و توندوتیژی لە کۆمەڵگەدا بەهۆی ئەوەی کە دیموکراسی سیستەمێکە بەردەوام ڕیفۆرم دەکات و خۆی لەگەڵ پێشهاتە و گۆڕانکارییەکان دەگونجێنێت و ئەم جۆرە سیاسەتە دەبێتە هۆی چارەسەرکردنی لێکترازانە مێژووییەکانی کۆمەڵگە، چونکە دیموکراسی لەچوارچێوەی یاسا و بەشێوازی ئاشتیانە باشترین میکانیزمی عەقڵانی بۆ چارەسەری کێشەکان دەدۆزێتەوە بەهۆی بەشداری هەموو تاك و گروپەکان لە پرۆسەی سیاسی و ڕێزگرتن لە ماف و ئازادییەکان (غلیون، ٢٠٠١: ص١٦٠).

دڵەڕاوکێی ئاسایشییەکان زۆربەی کات بەهۆی پڕ چەك کردنەوە دروست دەبێت، چونکە خۆپڕ چەك کردن تێچووی زۆری هەیە و گوشار دەخاتە سەر سەرچاوە سنووردارە داراییەکانی دەوڵەتان کە دەبێتە هۆی لاوازبوونی پەرەپێدان و دواکەوتنی گەشەسەندنی دەوڵەت و ڕاوەستانی پەرەپێدان دەبێتە هۆی دروست بوونی ناسەقامگیری و ناسەقامگیریش بەمانای لەرزۆك بوونی ئاسایشی دەوڵەتە (کامل محمد، ٢٠٠٨: ص٥١)، سەقامگیری سیاسی و سەقامگیری کۆمەڵایەتی لە درێژخایەندا پەیوەندی بە چەسپاندنی دیموکراسییەوە هەیە و هەر گۆڕانگارییەك بۆ وەدەستهێنانی دیموکراسی پەیوەندی بەهێزی هەیە بە سروشتی دەوڵەت و ئاستی گەشەسەندوویی و تواناکانی سیستەمەوە هەیە (کامل محمد، ٢٠٠٨: ص٣٠).

بەگشتى ناسەقامگيرى سياسى پەيوەندى بە وەڵامدەرايەتى و كارامەيى سيستەم لەهەمبەر ويست و داواكارييەكانى هاووڵاتيانەوە هەيە و بە پێچەوانەوە ناسەقامگيرى و نارەزايەتى ڕوودەدات و سيستەم شێواز و ميكانيزمى جياواز بۆ وەڵامدانەوەى نارەزايەتى دەگرێتەبەر كە ئەگەر بە (هێز و زۆر) وەڵامدەدرايەوە، ئەوە سەقامگيرى سياسى كاتى و پەيوەندى بە زۆرەوە هەيە، بەڵام ئەگەر لەسەر بنەماى ڕازى كردن بوو ئەوە ڕەوايەتى دەداتە سيستەم و دەبێتە هۆى سەقامگيرى سياسى، كەواتە جۆرى سيستەمى سياسى (ديموكراتيك) يان (ناديموكراتيك). بەگشتى شێواز و ميكانيزمى جياواز و ئەنجامى جياوازى لێ دەكەوێتەوە (**محمدى لرد، ٢٠١١: ص١٦٠**). لێرەوە دەتوانين بڵێين فاكتەرەكانى كاريگەر لەسەر سەقامگيرى سياسى بريتين لە:

١- بێبەش بوونى ڕێژەيى: بەشێوەيەكى گشتى لەم ڕوانگەيەوە، نارەزايەتى دەرئەنجامى تەسەوركردنى لێكترازانى قەبوڵ نەكراوە لەنێوان ئەو شتەى كە تاك هەيەتى و ئەوەى كە هەست دەكات شايانى ئەوەيە كە هەيبێت و لێى بێبەش كراوە، لەم ڕوانگەيەدا گۆڕانكارى خێراى كۆمەڵايەتى ناسەقامگيرى دروست دەكات و دەبێتە هۆى نارەزايى و توندوتيژى بەم مانايە كە ئەم توندوتيژيە دەرئەنجامى نارەزايەتيە و نارەزايەتيەكەش دەرئەنجامى نەبوونى هاوسەنگى لە نێوان پێكهاتە (ستراكچەر)ـى كۆمەڵگە و وەزيفەكانييەتى و بەبڕواى هانتيگتۆن دەوڵەتانێك كە گەشەسەندون ئەوە سەقامگيرى زياتريان هەيە بەم مانايە كە پێويستە گەشەسەندنى ئابوورى و سياسى هاوتەريب بن و سيستەم بتوانێت لە ئاست گۆڕانكارى و داواكارييەكانى كۆمەڵگە بێت (**عظيمى دولت آبادى، ٢٠٠٨: ص٨٦-٩٠**).

٢- دەرفەت و هەلى سياسى: لەم ڕوانگەيەوە نارەزايەتى نابێتە هۆى توندوتيژى بەڵكو ئەوە پێكهاتەى دەرفەت و هەلەكانە كە ئاست و ڕێژەى ململانێ و پێكدادانى سياسى ديارى دەكات، بەم مانايە كە تواناى بەرزى سيستەم و

ساناگیری لەلایەك و لەلایەکی تر سەرکوتکردنی سیستەم ئەوە دەگۆڕێت (**عظیمی دولت آبادی، ٢٠٠٨: ص٩١**). لەسەر ئەو بنەمایە (جۆزێف نای) لاوازی میکانیزمەکانی کۆنترۆڵ کردنی کۆمەڵایەتی و سیاسی بەهۆکاری سەرەکی ناسەقامگیری دەزانێت (ساندرز، ٢٠٠١: ص٤٢)، بەم مانایە کە ناسەقامگیری سیاسی دەرئەنجامی لاوازی دەوڵەت و دامەزراوەکانە و بە بڕوای (ئەپتەر و ئاندرین) تێگەیشتنی تاك لە دەرفەتەکان و ئەگەری سەرکەوتن هانیان دەدات کە بەشداری بزووتنەوەی ناڕەزایەتیەکان بکەن، هەرچەندە سیستەم بە سەرکوت دەتوانێت کۆنترۆڵی بکات لە کورت خایەندا بەڵام ئەگەری سەرهەڵدانی ناڕەزایەتی و شۆڕشی لەناکاو زیاتر دەبێت (اپتر و اّندین، ٢٠٠١: ص٢١).

٣- فاکتەری دەرەکی و نێودەوڵەتی: لەم ڕوانگەیەوە سەرچاوەی ناسەقامگیری بۆ گرێدراوی سیاسی و ئابووری دەوڵەت بە دەرەوە دەگەڕێتەوە، بەم مانایە کە هەر ڕێژە و ئاستێك لە نفوزی فاکتەر و هۆکاری دەرەکی زیاتر بێت، ئەوە ناسەقامگیری سیاسی زیاتر دەبێت (محمدی لرد، ٢٠١١: ص١٦٤).

٤- پەرێشانی (ئانۆمی) سیاسی: بەپێی بیروڕای (ئیمیل دۆرکهایم) پەرێشانی سیاسی حالەتێکە کە تیایدا بکەرە کۆمەڵایەتیەکان لە هەمبەر ڕێسا و بەهاکانی کۆمەڵگەی سیاسی پابەندیان نییە، کە بە بڕوای دورکهایم پیشەسازی خێرا و ئابووری هۆکاری سەرەکییە، بەم مانایە کە چۆن پێشتر هاووڵاتیان پێویستیان بە ئایین هەبوو (ئایینی هاوبەش) بۆ بەردەوامیان، ئێستاکەش هاووڵاتیان پێویستیان بە دادپەروەرییە، بەگشتی هۆکاری سەرەکی بۆ ناسەقامگیری لەم ڕوانگەیەوە پابەند نەبوونە بە بەها ئەخلاقیەکان و لەم حاڵەتەدا بەتایبەت کە بەهاکانی فەرمی سیستەم لەگەڵ بەهاکانی قبولکراو یان ویستراوی کۆمەڵگە دژایەتیان هەبێت یان جیاواز بن و یەك نەگرنەوە (رجب زادە و **کوثری، ٢٠٠٣**: ص٣٢٩).

٥- ڕەوایەتی: بەبڕوای دوو زانا بەناوی (هۆرۆڤیتز و میللەر ـ Horowitz & Miller) سەرەکیترین سەرچاوەی ناسەقامگیری، لاوازبوونی ئاستی ڕەوایەتی

سیستەمە (ساندرز، ٢٠٠١: ص٤١). زانایەكیتر بەناوی (ڕۆستۆڤ) سەقامگیری سیاسی لەگەڵ ڕەوایەتی دەسەڵاتداران و دامەزراوەكان بە هاوتا دەزانێت (خواجەسروی، ٢٠٠٦: ص٩٧)، هەروەها هەندێك لایەن سەقامگیری سیاسی و ڕێككەوتنی بەردەوام لە كۆمەڵگە بە ئەنجامی ڕەوایەتی سیاسی دەزانن، كە لە ئەنجامی بەشداری هاووڵاتیان لە پرۆسەی بڕیار وەرگرتن دێتەدی و هەروەها هەندێكی تر ئاسایشی سیاسی بە پەیوەندی نێوان ڕەوایەتی سیاسی و سەقامگیری سیاسی دەزانن (عباس زادە و كرمی، ٢٠١١: ص٤٥).

٦- فرەیی نەتەوەیی و مەزهەبی: لە كۆمەڵگەیەكی فرەیی كە گروپی جیاوازی كۆمەڵایەتی و كلتووری بەڵام بە پێگە و ڕۆڵی جیاواز بوونیان هەیە، بەهۆی جیاكاری و ستەم و سەركوتكردن ئەوە ناسەقامگیری سیاسی و توندوتیژی دەبینین، بەم مانایە كە لە دەوڵەتێكدا كە پەیوەندییەكان لەسەر بنەمای یەكسانی و دادپەروەری نییە لە نێوان هێز و گروپە نەتەوەیی و مەزهەبییە جیاجیاكاندا و نەتەوە یان مەزهەبێك دەسەپێنرێت و ئەوانی تر سەركوت دەكرێن، ئەوا ئێمە لێكترازان و نەبوونی یەكپارچەیی و یەكگرتوویی دەبینین كە هەڕەشەیە بۆ سەر سەقامگیری سیاسی و ئاسایشی نەتەوەیی (ازغندی، ٢٠٠٦: ص٢١٥).

٧- لاوازی دیموكراسی: (ئەلێكسی دۆ تۆكڤیل) جەخت لەسەر یەكگرتوویی نێوان تاكەكانی كۆمەڵگە دەكاتەوە و بڕوای وایە كە دۆخێكی دیموكراتیك لە دەوڵەتدا دەبێتە هۆی دروست بوونی پێكهاتەی پێویست بۆ تێپەڕین لە قەیرانە سیاسی و كۆمەڵایەتیەكان و لە ئەنجامدا سەقامگیری سیاسی (ازغندی، ٢٠٠٦: ص٢٢٩). بەگشتی دیموكراسی ئامرازێكی گونجاوە بۆ گۆڕانكارییەكانی سیاسی و كۆمەڵایەتی و بەهۆی بەرزكردنەوەی توانای سیستەم و لە ڕێگەی ئاشتیانەوە سەرمایە ماددی و مرۆییەكان كۆ دەكاتەوە و دەبێتە هۆی سەقامگیری سیاسی بەڵام بە مەرجێك دوو ڕەگەزی (بەشداری) و (كێبڕكێی ئازاد) بوونی هەبێت و هاوسەنگیەكیش لە نێوانیاندا هەبێت، چونكە لە هەندێ دەوڵەتی نیمچە

دیموکراسی بەشداری هەیە بەڵام کێبڕکێی ئازاد نییە (محمدی لرد، ٢٠١١: ص١٦٦).

٨- بوونی بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان لە دژی سیستەم: بەهۆی زیادبوونی بەشداری سیاسی لە سەدەی بیستەمدا، ئەمرۆکە هاووڵاتیان داواکاری جیاوازیان هەیە و بۆ بەدیهێنانیان بزووتنەوەی جیاجیا دروستبووە و ڕەفتاری نارِەزایەتی لەچوارچێوەی ڕێپێوان و مانگرتن و شەڕ و پێکدادان لەنێوان سیستەم و هاووڵاتیان زیاتر بووە (اپتر و آندین، ٢٠٠١: ص١٨). هەروەها (مارتین سیمۆر لیپیست) لە کتێبی (مرۆڤی سیاسی)ـدا سەرچاوەی سەرەکی ناسەقامگیری دەگەڕێنێتەوە بۆ بزووتنەوە سیاسییەکان لە دژایەتی لەگەڵ یاسا و ڕێساکانی دەوڵەت (ساندرز، ٢٠٠١: ص٢٨). هەرچەندە هەندێ لایەن بڕوایان وایە کە بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی وێرانکەر و هۆکاری ناسەقامگیری نییە، بەڵکو ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ داواکاری و کێشە و گیروگرفتەکانی کۆمەڵایەتی و دەبێت ڕێگە و میکانیزمی چارەسەری گونجاوی بۆ دابنرێت، بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان دەوڵەت بە بەرپرسیاری کێشەکان و بەرپرسی چارەسەرکردنیان دەزانن، ئەم بزووتنەوانە یاسا و ڕێساکانی زاڵ و هەنووکەیی دەخەنە ژێر پرسیار و دەیانەوێت بگۆردرێن و لێرەوە بەپێی ئەوەی کە سیستەم دیکتاتۆر و سەرکوتکەر بێت یان دیموکراتیك، بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان فۆرم و شکلی جیاواز وەردەگرن، بەگشتی دەتوانین بڵێین کە بزووتنەوە نارِەزایەتیەکان دەرهاوێشتەی ناکارامەیی و ناتوانایی فەرمانڕەواکانە بۆ کۆنترۆڵ و وەڵامدانەوەی داواکارییە ئابوورییەکان یان چارەسەرکردنی فرەیی نەتەوەیی و مەزهەبی یان کێشەی ژینگە و ... هتد، بەم مانایە لە حاڵێکدا کە داواکارییەکان فرە و ئاڵۆزن، ئەگەر سیستەم نەتوانێت لەئاست پێویستی و چاوەڕوانییەکانی کۆمەڵگە و تاکەکان بێت و میکانیزمی گونجاوی دیموکراتیك بۆ ئەم پرسانە نەبێت، ئەوە بزووتنەوەکان دژی سیستەم دەبن

و دەبنە هۆی ناسەقامگیری و لە كۆتاییدا ئاسایشی نەتەوەیی دەكەوێتە مەترسیەوە (شفیعی، ٢٠٠٣: ص ٦٥٧).

٩- كلتووری سیاسی دوژمنكارانە: ئەم فاكتەرە لە سیستەمە سیاسییەكان كە هەوڵی سڕینەوە و پەراوێزخستنی ئەوانی تر دەدات دەبینرێت، واتە لەم سیستەمەدا یەكپارچەیی و یەكگرتوویی دروست نابێت، بەڵكو بەردەوام لەژێر هەڕەشەدایە، واتە كەلتوورێكی سیاسی كە توانای خۆگونجاندن و سازانی هەموو پێكهاتە و هێز و گروپەكانی (نەتەوەیی، مەزهەبی، سیاسی و ... هتد) نەبێت. بەم مانایەی كە سیستەمی سیاسی هەوڵ بدات بە پەراوێزخستنی ئەوانی تر بیانكاتە دوژمنی سیستەم كە ئەمەش سەقامگیری دەخاتە مەترسییەوە و ناسەقامگیری بەردەوام لەم جۆرە سیستەمانەدا دەبینرێت، لێرەدا دەسەڵاتداران و كلتوور ڕۆڵی سەرەكی دەبینن بەتایبەت كلتووری سیاسی نادیموكراتیك كە فرەیی قبوڵ ناكات و دەسەڵات لە سیستەمی نادیموكراتیكدا قبوڵی ئۆپۆزیسیۆن ناكات (محمدی لرد، ٢٠١١: ص١٦٨).

١٠ـ كێشە ئابوورییەكان: بوونی كێشە و گرفتی ئابووری پەیوەندی بە ناسەقامگیری سیاسییەوە هەیە، هەروەها نادادپەروەری لە دابەشكردنی داهاتەكان و بە پێچەوانەوە لەو دەوڵەتانەی كە ئاستێكی ڕێژەیی باش لە گەشەكردنی ئابووری و داهاتی بەرز دەبیندرێت، ئەوە ڕێژەیەكی بەرچاو لە سەقامگیری سیاسی هەیە و ناكارامەیی سیستەمی سیاسی لە بواری گەشەپێدانی ئابووری دەبێتە هۆی ناسەقامگیری و پەشێوی سیاسی و كۆمەڵایەتی (دوهان و زیرمن، ١٩٩٩: ص٩١). بێكاری، هەژاری، گەندەڵی، هەڵاوسان و نابەرابەری و نادادپەروەریی دەبێتە هۆی ناسەقامگیری سیاسی. ئەوە دەركەوتووە كە لە دەوڵەتانی دیموكراتیكدا بە كەمبوونەوەی گەشەی ئابووری نارەزایەتی ڕوودەدات و لە دەوڵەتی نادیموكراتیك بەهۆی خێرایی گەشەی ئابوورییەوە ناهاوسەنگی ڕوودەدات و دەبێتە هۆی ناسەقامگیری. لە دەوڵەتانی نادیموكراتیكدا بەهۆی

زۆربوونی خەرجییەکانی سەربازی دەبێتە هۆی لاوازی ئابووری و ناسەقامگیری و ناڕەزایەتی و کێشە. گرفتە ئابوورییەکانیش پەیوەندی بە ناکارامەیی سیستەم و توانای سیستەمەوە هەیە کە کاریگەری لەسەر ڕەوایەتی سیستەم هەیە (محمدی لرد، ٢٠١١: ص١٦٩).

١١ـ نەبوونی ئازادی ڕادەربڕین و ڕاگەیاندن: لێکۆڵینەوەکان دەریان خستووە کە بوونی ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی ڕاگەیاندن پەیوەندی بە سەقامگیری سیاسییەوە هەیە. لەلایەك بەهۆی ئازادی و ئازادی ڕاگەیاندن و ڕادەربڕینەوە ئەو گەندەڵی کەمتر دەبێتەوە کە ئەمەش کاریگەری لەسەر ئاستی ئابووری و ناڕەزایەتی هاووڵاتیان و ڕەوایەتی سیستەم هەیە و لەلایەکی ترەوە ئەم ئازادییە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەهۆی گوشاری ڕاگەیاندنەوە سیستەمەکان ویست و داواکارییەکانی هاووڵاتیان جێبەجێ دەکەن، کە دیسانەوە ئاستی ڕەوایەتی سیستەم بەرز دەبێتەوە و لەلایەکی ترەوە داواکارییەکان بەشێوازی سەردەمیانە و ئاشتیانە و دوور لە توندوتیژی دەخەنەڕوو. دەوڵەتانی نادیموکراتیك ستراتیژی هەڵەیان هەیە کە هەوڵ دەدەن کۆنترۆڵی ئازادی ڕادەربڕین و ڕاگەیاندن بکەن بۆ سەقامگیربوونیان، چونکە ئەو دەوڵەتانە لە کۆتاییدا خۆیان دەبنە قوربانی ئەم نەبوونەی ئازادی و بە شۆڕش و ناڕەزایەتی بەردەوام لەژێر هەڕەشەدان بەهۆی گوێ نەدان و نەزانینی داواکارییە ڕاستەقینەکانی هاووڵاتیان و لێکترازان لە نێوان سیستەم و هاووڵاتیان (افتخاری، ٢٠٠٢: ص٨٩).

لە ئەنجامدا ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە دیموکراسیین خاوەنی سەقامگیری ڕاستەقینەن. هەروەها ئەم سەقامگیرییەش دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی دەوڵەت ئاسایشی نەتەوەیی بە باشی بپارێزێت. لە سیستەمە دیموکراسییەکان کۆمەڵگە سەرچاوەی ئاسایشە، چونکە ئاسایشی دەوڵەت بریتییە لە ئاسایشی هەموو تاکەکان و کۆمەڵگە بۆیە بە هی خۆی دەزانێت، لێرەوەیە کە هاووڵاتیان

سەقامگیری بە سیستەمی سیاسی دەبەخشن و پشتیوانی لە سیاسەتەكانی سیستەمی سیاسی دەكەن لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە.

**٥.١.٥- ڕەوایەتی:**

چەمكی ڕەوایەتی بەگرنگترین چەمكەكانی پەیوەندیدار بە سیستەمی سیاسی دادەنرێت. هەموو سیستەمە سیاسییەكان جەخت لەسەر ڕەوایەتی خۆیان دەكەنەوە، بۆیە پەیوەندی ڕەوایەتی بە دەسەڵات پەیوەندارە بە ئاسایشی كۆمەڵگا بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ، چونكە ڕەزامەندی هاووڵاتیان ڕەوایەتی دەداتە سیستەمی سیاسی، تاوەكو پارتێكی سیاسی ڕەزامەندی زیاتری هاووڵاتیانی بەدەست هێنابێت، ڕەوایەتی زیاتری هەیە لە بەرامبەریش سیستەمە سیاسییەكە هەوڵدەدات كەمترین توندوتیژی بنوێنێت لەهەمبەر پارتە سیاسییەكاندا كە بەشدارن لە پرۆسەی سیاسی و بەشێوازێكی دیموكراسیانە، چونكە هاووڵاتیان لە سیستەمێكی دیموكراسی بە ڕەزامەندی خۆیان پابەند دەبن بە ڕێسا و یاساكانی سیستەمی سیاسی چونكە خۆیان ڕەزامەندن لەسەری و بەشدارن لە داڕشتنی بڕیارەكان (هلال، ٢٠١٣: ص١).

ڕەوایەتی بریتییە لەوەی كە هاووڵاتیان، دەسەڵاتی دەوڵەت قبوڵ دەكەن و بەشێوەیەكی ڕێژەیی ڕازین و بڕوایان وایە كە دامەزراوەكان ئەركەكانی خۆیان بەباشی بەڕێوە دەبەن. لێرەوە ڕەوایەتی دەبێتە هۆی ئەوەی كە دەسەڵات بتوانێت لەهەمبەر ئامانجەكانی نەتەوەییدا، كۆ دەنگی كۆمەڵگەی هەبێت و سەرچاوە مرۆیی و ماددییەكان بە سانایی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان بكات، لە دەوڵەتانی دواكەوتوو بەهۆی ئەوەی كە سیستەمەكان ناتوانن وەڵامی داواكارییەكانی هاووڵاتیان و بەشداری سیاسی و دادپەروەری و ... هتد، جێبەجێ بكەن تووشی قەیرانی ڕەوایەتی دەبن و لێرەوە بەردەوام كودەتای سەربازی یان بەردەوامی سیستەمی پشتاوپشت و سیستەمی دیكتاتۆری دەبینرێت، بەم مانایە كە

ڕەوایەتی و سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی پەیوەندی ڕاستەوخۆیان پێکەوە هەیە (**آذر و جونك، ١٩٩٨: ص٤٣**).

ڕەوایەتی لە سیستەمێکی دیموکراسی، بریتییە لەو دەسەڵاتەی کە لە ڕێگەی پرۆسەی هەڵبژاردن هاووڵاتیان نوێنەرانیان بۆ دەسەڵاتداریەتی دەست نیشان کردووە، ئەمەش بە ڕێگەی ئازادی هاووڵاتیان بەبێ هەبوونی گوشار دەکرێت و لە سایەی دەوڵەتێك کە ئاسایش و سەقامگیری پارێزراوە و دەرفەتی یەکسان بۆ کێبڕکێ کردن دەستەبەرکراوە، هەروەها دادپەروەری لە نێوان کێبڕکێ کاران دا هەیە، بۆیە مەرجە و گرنگە کە لە سیستەمی دیموکراسیدا هاووڵاتیان لە ڕێگەی هەڵبژاردنەوە نوێنەرانیان هەڵبژێرن و بەبێ ئەم بنەمایانە وا دادەنرێت کە دیموکراسییەت و ڕەوایەتی ڕاستەقینە نییە و ڕواڵەتیە (**سلطان، ٢٠١٣: ص١**).

ڕەوایەتی تەنیا ئەوە نییە کە سیستەم لە ڕوانگەی یاساییەوە خاوەن ڕەوایەتی بێت بەڵکو ڕەوایەتی پەیوەندی بە ڕەزامەندی ڕاستەقینەی هاووڵاتیانەوە هەیە، بۆیە ڕەوایەتی سیستەمە سیاسییەکان لەم ڕوانگەیەوە هەستکردنی هاووڵاتیانە بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر سیستەم، چونکە هاووڵاتیان خۆیان ڕەوایەتیان داوەتە ئەم سیستەمە یان ڕەزامەندن لەسەری. ماکس ڤیبەر لەسەر ڕەوایەتی بڕوای وایە کە دەوڵەت بریتییە لە قۆرخکردنی دەسەڵاتی توندوتیژی ڕەوا، واتا ئەو توندوتیژی بەکارهێنانە لەلایەن دەوڵەتەوە، ڕەزامەندی هاووڵاتیانی لەسەرە، ئەمەش وادەکات کە هاووڵاتیان بە ڕەزامەندی خۆیان گوێڕایەڵی بڕیارەکانی دەسەڵات بن، بەهۆی ئەوەی کە ئەم بڕیارانە خۆیان بەشداربوونە لە دارشتنیدا (بشيريه، ٢٠٠٩: ل٢٧).

کاتێك ڕەوایی سیاسی سیستەم، کارایی دامەزراوە سیاسییەکان و بەشداری هاووڵاتیان لە سیاسەتدا بەرز بێت ئەگەری ڕوودانی کودەتا کەم دەبێتەوە، لەوەها هەلومەجێکدا ڕادەی خۆڕاگری لە بەرانبەر کردەوەی سوپادا زۆرتر دەبێت، بەپێی ئەزموونی مێژوییش ئەو دەوڵەتانەی کودەتایان تێدا کراوە بێبەش بوونە لە

كۆمەڵگەى مەدەنى بەهێز و پێكهاتەى فرە پارتى جێگرتو و بیروڕاى گشتى ڕێكخراو (بشيريه، ٢٠٠٩: ل ١٣٦-١٣٧).

دەسەڵاتێكى ڕەواى ديموكراسى وادەكات، ئەو هێزە ياسايى و ماددیەى كە هەيەتى بەكاربێنێت و ئەويش لە ڕێگەى ڕەزامەندى كۆمەڵگا، بەو پێیەى كە دەوڵەت مافى دەسەڵاتداريەتى هەيە لەسەريان و بەو پێیەى كە دەوڵەت هەموو كۆمەڵگە لەخۆدەگرێت و تەنانەت ئەگەر كۆمەڵگە لە ناوخۆشدا ململانێ و جياوازى و ناكۆكييان هەبێت، ئەوە دەبێتە هۆى ئەوەى كە دەوڵەت يەكێك لە ئەركە گرنگەكانى جێبەجێ بكات و پەيڕەوى بكات كە ئەويش ڕاگرتنى هاوسەنگيە لە نێوان پێكهاتەى كۆمەڵايەتى و لايەنە سياسييەكان ئەويش لە پێناو بەدەستهێنانى بەرژەوەندى كۆمەڵگا، كە ئەم هێزەى دروستكردنى هاوسەنگى لەلايەن دەوڵەتەوە سەرچاوەكەى لە ڕەوايەتييەوە هاتووە، كە ئەم هاوسەنگييەش وادەكات كە ڕێگە لە قۆرخكردنى دەسەڵات لەلايەن هێزێكى دياريكراو بگيرێت و ئەمەش دەبێتە هۆى بەردەوامى دەستاودەستكردنى ئاشتيانەى دەسەڵات و ڕەوايەتى و سەقامگيرى و ئاسايشى دەوڵەت (**المواسي**، ٢٠١٣: ص٨-٩).

لە هەر سيستەمێكى سياسى ئاستى بەشدارى سياسيدا لاواز بێت ڕووبەرووى قەيرانى ڕەوايەتى دەبێت، كە ئەمەش دەبێتە هۆى لاوازى سيستەم و ئەو كاتە سيستەم بۆ چارەسەركردنى پەنا دەباتە بەر توندوتيژى بۆ بەردەوامبوون بە ڕەوايەتى پێدان بەخۆى، كە ئەمەش بەشدارى نەكردنى زياترى هاووڵاتيانى لە هەڵبژاردن و پرۆسەى سياسى لێدەكەوێتەوە كە ئەمەش دەبێتە هۆى سەركوتكردن و زەوتكردنى ئازادى و مافە بنەڕەتيەكانى تاك و هاووڵاتيان و دەبێتە هۆى لە دەستدانى تەواوى ڕەوايەتى سيستەمى سياسى و ئەگەرى سەرهەڵدانى ناڕەزايى و دژايەتى بۆ دامەزراوەكانى سيستەمى سياسى بەرز دەكاتەوە، كە دواتر دەبێتە هۆى ناسەقامگيرى كۆمەڵگە و سيستەمى سياسى. كەواتا نەبوونى ديموكراسى

وادەکات کە سیستەمی نادیموکراسی ئامرازی توندوتیژی و سەرکوتکردن بۆ دەستەبەرکردنی پشتیوانی و ڕەزامەندی ڕواڵەتی بۆ سیستەمی سیاسی بەکاردێنێت، کە ئەم شێوازە گرژی و قەیرانی گەورەتر دەخولقێنێت (**المواسي**، ٢٠١٣: ص٨).

سیستەمێکی سیاسی کە ئاستێکی بەرز لە ڕەوایەتی هەیە توانای ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ کێشە و گرفتە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بەرزە و دەتوانێت لەم ڕێگەیەوە بە پاڵپشتی هاووڵاتیان ڕووبەڕووی قەیرانی ئابووری یان مەترسی شۆڕش و جەنگی ناوخۆیی ببێتەوە و ئەگەر دەوڵەتێك ئەم ڕەوایەتییەی نەبێت، ئەوە ڕێگە بۆ دەستێوەردانی دەرەکیش خۆش دەکرێت و تەواوی دەوڵەت بەهۆی جەنگی ناوخۆیی و ناڕەزایەتی یان دژایەتی سیستەم دەکەوێتە قەیرانەوە و هەموو تواناکانی سیستەم لاواز دەبێت (جی مارتین، ٢٠١٣: ص١٤). لەلایەکی ترەوە نەتەوە لە توانای دەستەبەرکردنی ڕێککەوتن لەسەر دەسەڵاتێکی ڕەوا و دامەزراوەیی و سەقامگیر بەرجەستە دەبێت، کەواتە نەهێشتنی ئەم قەیرانە، بونیاتنانی نەتەوەیە (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص١١٦).

سیستەمەکانی دیموکراسی لەوەدا هاوبەشن کە دەبێت کە سیستەم لەلایەن زۆرینەی جەماوەر پاڵپشتی و پشتیوانی بکرێت و ڕەوایەتی پێبدرێت، هەرچەندە هەندێکجار دەسەڵاتە ستەمکارەکانیش بەناوی گەلەوە قسە دەکەن بە دەربڕینێکی دیموکراسیانە، بەلام جیاوازییان لە بەشداری و کاریگەری هاووڵاتیانە بەشێوەی ڕاستەقینە لە دروستکردنی بڕیار و پێدانی ڕەوایەتی بە سیستەم (بومبر، ١٩٩٩: ص٢١). ئەو سیستەمە سیاسیانەی کە ڕەوایەتیان لەدەست دەدەن، لەهەمان کاتدا یەکگرتوویی کۆمەلایەتیان تێکدەچێت، بۆیە ئەوە دەبێتە مایەی ئەوەی کە ئاسایش بکەوێتە ژێر هەڕەشەوە و ئەم جۆرە سیستەمانە ئاسایشی دەسەڵاتداران و یان ڕژێمەکانیان پێ گرنگترە لە ئاسایشی نەتەوەیی بە مانا مۆدێرنەکەی و هەوڵی پاراستنی ئەم سیستەمە دەدەن بە هەموو میکانیزمێك،

لە ڕابردوودا تەنیا دەوڵەت خۆی پێ پارێزەری خاك و سەروەری و یەكگرتوویی دەوڵەت بوو، بەڵام ئێستا ئەكتەری تر سەریهەڵداوە كە بەشدارن لە دابینكردنی ئاسایش و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان (رسول شینكی، ٢٠١١: ل٢١).

كاتێك قەیرانی سیاسی و ئابووری ڕوودەدات لەو هەلومەرجە تێچووی چاكسازی زیاتر دەبێت و ڕۆڵی دەوڵەت لاواز دەبێت و هەندێكجار ڕەنگە قەیرانی سیاسی و ئابووری ببێتە هۆی دروستبوونی توندوتیژی و ئاژاوە كە ناسەقامگیری و نائاسایشی لێ دەكەوێتەوە، كە دواجار ڕووبەڕووی ڕەوایەتی دەوڵەت دەبێتەوە بەم مانایە كە كارامەیی سیستەم دەتوانێت یارمەتیدەری بەدەستهێنانی ڕەوایەتی و سەقامگیری بێت و كاریگەری لەسەر ئاسایشی دەوڵەت هەبێت (ڕۆز ئەیكەرمان، ٢٠٠٧: ل٣٠٠).

لە ڕاستیدا كاتێك بەها و بەرژەوەندییە باڵا نەتەوەییەكان دەتوانن ئاسایشی نەتەوەیی و سەربەخۆیی و یەكپارچەیی دەوڵەت دەستەبەر بكەن، كە توانیبێتی پاراستنی گیانی هاووڵاتیانی، باشتركردنی خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان و گەرەنتی كردنی ماف و ئازادییە سیاسییەكان و ڕەخساندنی دەرفەتی یەكسانی بۆ بەشداری كردنی هەموو تاك و گروپەكان و ... هتد، فەراهەم بكات و ئەو كاتە سیستەمی سیاسی دەتوانێت ئاسایشی نەتەوەیی دابین بكات كە ئەمەش لە ڕاستیدا بەسیستەمێك دەكرێت كە خاوەن ڕەوایەتی سیاسی و یاسایی بێت واتا سیستەمێكی دیموكراسی بێت. لە دەوڵەتانی نادیموكراسی و دواكەوتوو بەهۆی نزمبوون یان نەبوونی ڕەوایەتی سیاسی و یان ململانێ و توندوتیژی و لێكترازانە كۆمەڵایەتیەكان و هەروەها جیاوازی كلتووری سیاسی لەگەڵ سیستەمی سیاسی و بێ توانایی دامەزراوەكانی دەوڵەت بۆ وەڵامدانەوەی پێداویستییەكانی هاووڵاتیان بەردەوام هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ئاسایشی دەوڵەت دروست دەبێت و زۆربەی كات دەوڵەتانی نادیموكراسیش لە بری چارەسەركردنی ئەم كێشانە بە میكانیزمی دیموكراسیانە، پەنا دەبەنە بەر ئامراز و میكانیزمی نادیموكراسییانە

وەك سەركوتكردن و توندوتیژی و دروستكردنی دۆخێكی ئاسایش لەهەموو بوارەكان كە ئاسایشی نین (كاسیۆرۆسكی، ٢٠٠٧: ل٩٠).

بەگشتی ڕەوایەتی پەیوەندی هەیە بەو سیستەمە سیاسییەی كە لەلایەن هاوولاتیانەوە لە پرۆسەیەكی دیموكراتیك و ئازادانە هەڵدەبژێردرێت، بەڵام لەمەش گرنگتر ئەوەیە كە سیستەمە سیاسییەكە دان بە فرەیی ناسنامە و كلتوورە جیاوازەكاندا بنێت. هەروەها ماف و ئازادی و بەرژەوەندییەكانیان بپارێزێت. بەم هۆیەشە كە لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا فرەیی و پەیوەندییەكانی هاوولاتیان لەسەر ئاستی تاك و گروپ و ناسنامە كۆمەڵایەتییە جیاوازەكان لێكترازانی لێ ناكەوێتەوە، بەڵكو بەشداری سیاسی هاوولاتیان لە پرۆسەی سیاسییدا بەشێوازێكی یەكسان و بەبێ جیاكاری دەبێت كە ئەوەش دەبێتە هۆی ڕەوایەتی سیستەمی سیاسی. لێرەوەیە كە ڕەوایەتی سیستەمی سیاسی بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ كاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت هەیە، چونكە ئاسایشی نەتەوەیی لە بنەمادا پێویستی بە یەكگرتوویی نەتەوەیی هەیە و هەر لێكترازانێك لە نێوان هاوولاتیان یان گروپە كۆمەڵایەتییەكان لەلایەك و لە نێوان كۆمەڵگە و دەسەڵات لەلایەكی ترەوە دەبێتە هۆی ناسەقامگیری، كە ئەمەش توندوتیژی یان جەنگی ناوخۆیی لێدەكەوێتەوە، دەوڵەت دەكەوێتە ناو دۆخێكی نائاسایشی. لێرەوەیە دەردەكەوێت كە سیستەمە سیاسییە دیموكراسییەكان چونكە خاوەن ڕەوایەتین ئەم جۆرە هەڕەشە و مەترسییانەیان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی نییە. وەك لە ڕوانگەی باری بۆزان كە باس لە ئاسایشی كۆمەڵگەیی دەكات و پێی وایە دەبێت گرنگی بە ئاسایشی كۆمەڵگە بدرێت وەك سەرچاوەی ئاسایش لەتەك دەوڵەت بۆ دروستكردن و پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی. لێرەوەیە كە پەیوەندی نێوان ڕەوایەتی، دیموكراسی و ئاسایشی نەتەوەیی بەرجەستە دەبێت.

**٦-١-٥- سەروەری:**

مشتومڕ لەسەر چەمكی یاسایی سەروەری دەگەڕێتەوە بۆ كۆمەڵێك هۆكار، یەكێكیان پەیوەندی نێوان سەروەری و سەربەخۆیی و بنەمای دەستێوەرنەدان كە لە بنەمای یەكسانی سەروەرییەوە هاتووە بۆ هەموو دەوڵەتان، دووەم لە گۆڕانكارییەكان لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەكان و خستنەڕووی پرسی سەروەری بەشێوەیەكی نوێ لەم ساڵانەی دواییدا، كە پەیوەندی بە پرسەكانی دەستێوەردانی مرۆڤیەوە هەیە، كە ئەمەش لایەنگران و دژبەرانی خۆی هەیە، سێیەم، لەسەر بنەمای سەروەری لە ماوەیەكی نزیكدا كۆمەڵێك ڕێكخستنی نێونەتەوەیی تر دروست بوو، وەك: كۆمەڵەی گەلان و نەتەوە یەكگرتووەكان كە ئەمەش ویستیەكی دروستكرد بۆ گۆڕانكاری لە زۆربەی بنەما و یاساكانی نێونەتەوەیی، چوارەم، شوێنەوار و كاریگەری دیاردەی بەجیهانیبوون لە ڕووی یاسایی، سیاسی، كۆمەڵایەتی و كلتووری كار و كاردانەوەی لە گواستنەوەی هەندێ پرس كرد لە تایبەتمەندی ناوخۆیی بۆ تایبەتمەندی نێونەتەوەیی، بەم مانایە كە ئەم گۆڕانكاریانە كۆمەڵێك چەمك و پرس و تێگەیشتنی نوێی هێنایە ناو ئەدەبیاتی سەروەری، وەكو: كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی، ڕێكخستنی نێونەتەوەیی، پەیوەندی نێونەتەوەیی و .... هتد (جابر مهدی، ٢٠٠٤: ص٢٥).

پێناسە كلاسیكییەكان بۆ سەروەری كە لەلایەن بیرمەندانێك وەكو جان بۆدان (١٥٣٠-١٥٩٦) و تۆماس هۆبز (١٥٨٨-١٦٧٩) كراوە جەخت لەسەر ئەوە دەكەنەوە كە سەروەری هاوتا و یەكسانە لەگەڵ دەسەڵات و بەپێی بیروڕای گرۆسیۆس سەروەری لە جەوهەردا وەكو یەكەیەك وایە كە دابەش ناكرێت و بەپێی ئەم بۆچوونە دەوڵەت بریتییە لە سەروەری و دەوڵەت بێ سەروەری بوونی نییە، بەڵام سەرەڕای ئەم ڕوانگە ڕەهایە، گرۆسیۆس بڕوای بە چەند هەڵاوێردەیەك هەیە، واتا سەروەری دەكرێت دابەش بكرێت لە جێبەجێ كردنیدا (**الصديقي**، ٢٠٠٨: ص٤٨).

پێناسەی چەمکی سەروەری یەکەم جار لەلایەن (هۆگۆ گرۆسیۆس) لەساڵی (١٦٢٥)ــی زایینی داڕێژراوە و دیاریکراوە کە سەروەری دەسەڵاتێکی باڵایە، لێك جیاناکرێتەوە، کە دەوڵەت هەیەتی بۆ دەرکردنی بڕیارەکانی و جێبەجێ کردنی لەسەر هەمووان لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەت. ئەم چەمکە بەرجەستە بوو و بەدیارکەوت بە دروستبوونی دەوڵەتی نوێ بەتایبەت لەسەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە بەجەستە بوو (**جابر مهدي**، ٢٠٠٤: ص٢٧). سەروەری دەوڵەت یەکەیەکە دابەش نابێ هەرچەندە دەسەڵاتەکانی جۆراوجۆربن، چونکە دەسەڵاتەکان سەروەری دابەش ناکەن بەڵکو تەنها تایبەتمەندییەکان دابەش دەکەن (**الخضر، ٢٠١٣: ص١**). سیستەمی نوێی جیهانی و سەردەمی بەجیهانیبوون بەهۆی شۆڕشەکانی پەیوەندی و زانیاری و تەکنەلۆژیدا، بوونەتە هۆی گۆڕانکاری نوێ و خێرا لە چەمکە کلاسیکیەکان و چەمکی نوێ هاتۆتە ئاراوە، ئەمە وایکردووە کە بنەمای سەروەری و دەستێوەرنەدان پێکەوە هەڵنەکەن بەشێوەیەکی ڕەها، لەگەڵ پەیوەندی نێوان هەموو بەشەکان لە ئاستی جیهانیدا، بەتایبەت لە بارودۆخی ئەمڕۆ کە گۆڕانی خێرا و چاوەڕواننەکراو دێنە ناو پەیوەندی نێونەتەوەیی (**جابر مهدي**، ٢٠٠٤: ص٤٨).

بەدەستهێنانی سەربەخۆیی و پاراستنی لە ئامانجە باڵاکانی دەوڵەتان و نەتەوەکانە لە ڕووی سیاسییەوە و هەبوونی سەربەخۆیی بە مانای پاراستنی سەروەری و دەسەڵاتە، بەم مانایە کە دەوڵەتان بتوانن بەبێ دەستێوەردان و گوشاری دەرەکی لە کاروباری ناوخۆیاندا ئەو هێزە ڕەوایە بەکاربێنن، بەڵام ئەمڕۆکە بەهۆی ئاڵوگۆڕەکان و پرۆسەکانی بەجیهانیبوون و شۆڕشی زانیاری و تەکنەلۆژی دەبینین دەوڵەتان وەکو پێشتر ناتوانن ئەم کۆنتڕۆڵ و دەسەڵاتەیان هەبێت، ئەمە جگە لە مافی مرۆڤ و دیموکراسی کە بۆتە بەهایەکی باڵای جیهانی و دەوڵەتان دەخاتە ژێر گوشارەوە (عسکری، ٢٠٠٢: ص١٨٢)، چەمکی سەروەری مانایەکی ناوخۆیی و مانایەکی دەرەکی هەیە، مادام ئەم چەمکە

پەیوەندی بە سەربەخۆیی هەیە لە سیاسەتی دەرەوە، تایبەتمەندییەکی دیاریکراوە بۆ دەوڵەت لەناوخۆ، کەواتا سەروەری دوو ڕەهەندییە، لەسەر ئاستی ناوخۆدا، دەوڵەت لەچوارچێوەیەکی دیاریکراو دەسەڵاتێکی بەرز و باڵای هەیە کە ناکرێت ململانێ لەگەڵی بکرێت، کە دەسەڵاتی بەسەر ژیانی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیدا هەیە، لە ڕێگەی دروست کردنی یاسا و دەرکردنی ڕێسا و فەرمانەکان و گەرەنتی کردنی جێبەجێ کردنی لە ڕێگەی بەکارهێنانی میکانیزمەکانی زۆرلێکردن بەپێی ڕوانگەی مۆنۆپۆلی بەکارهێنانی هێزی ڕەوا، لەسەر کۆی چالاکیە کۆمەڵایەتیەکان لەناو هەرێمێکی دیاریکراو هەروەها چالاکیە ئابوورییەکان، هەروەکو زانانی کۆمەڵناسی ئەڵمانی ماکس ڤیبەر گوزارشتی لێ دەکات (**الصديقي**، ٢٠٠٨: ص٥٠).

لەلایەکی تر کاتێك ململانێیە ناوخۆیی و دەرەکییەکان قوربانی لێ دەکەوێتەوە و ئەمەش پێشێلی ئازادی و سەربەخۆیی و سەروەری دەکات و هەروەها ئەمەش چەمکی سەروەری لە مانا ڕاستەقینەکەی بەتاڵ دەکاتەوە و بۆتە هۆی گۆڕانکاری بەتایبەت لە دەوڵەتانێك کە لە دۆخی قۆناغی گواستنەوە و پەرەسەندندان، کە بەناوی سەروەری هەستاون بە سەرکوتکردن و زۆرداری سیاسی و سەربازی و سیستەمی تاکەپارتی و سڕینەوەی نەتەوەیی و ئایینی و تەنانەت گەیشتۆتە ئاستی جینۆساید، لەبەر ئەوە ئەم بابەتە تەنیا بە ئیدانەکردن کۆنتڕۆڵ نەدەکرا، بۆیە چارەسەرکردنی ئەم کێشانە بووە پێویستی کە نابێت تەسلیمی ڕەها بوونی سەروەری بین و ناکرێت سەروەری ڕەها بوونی هەبێت. پاساوی ئەم دەوڵەتانە بەرەنگاربوونەوەی دەوڵەتانی زلهێز و دەرەکییە، لەکاتێکدا ئەمانە پاساوی ڕەوا نین، بۆیە چارەسەرکردنی ئەم پرسانە بوونە داواکاری جیهانی و پرسی دەستێوەردانی مرۆیی بووە داواکاری جیهانی (**جابر مهدي**، ٢٠٠٤: ص٦٥).

سەروەری ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە دەوڵەت، بۆیە ناتواندرێت دەوڵەت بوونی هەبێت بەبێ ئەوەی کە خاوەن سەروەری بێت، چونکە سەروەری بریتییە لە هێما و

شكۆی دەوڵەت، لەبەر ئەوە دەوڵەت مافێكی یاسایی هەیە كە كۆمەڵگە و هاووڵاتیان بەڕێوە ببات و كۆنترۆڵیان بكات، بەڵام لە ڕێگەی دەسەڵاتێكی ڕەوا و یاسایی. بەگشتی سەروەری كۆمەڵە سیمایەكی هەیە بۆ نمونە: ڕووی یەكەمی بریتییە لە سیمای ناوخۆ، كە بریتییە لە دەسەڵاتی سیاسی، كە دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی هەرێمی دەوڵەتێكی دیاریكراوی هەیە و دواجار تیایدا دەوڵەت خاوەن بڕیارە و سیمای دووەم كە بریتییە لە سیمای دەرەوەی سەروەری، بریتییە لەوەی كە دەوڵەت تیایدا سەربەخۆیە و ملكەچ نابێت بۆ هیچ لایەن یان دەوڵەتێكی تر، كەواتا سەروەری لە سیمای دەرەوەیدا، بەستراوەتەوە بە سەربەخۆیی (**الخضر، ٢٠١٣: ص١**).

پرەنسیپی سەروەری كە لە بڕگەی (١)ـی مادە (٢) لە پەیماننامەی نەتەوە یەكگرتووەكاندا هاتووە، ئاماژە بەوە دەكات كە پێویستە هەموو دەوڵەتان پابەندبن و ڕێزی لێ بگرن، سەروەری یەكێكە لەو ستونانەی كە سیستەمی نێونەتەوەیی لە سەری ڕادەوەستێت كە لەلایەن یاسای نێونەتەوەیی كلاسیكەوە پاڵپشتی دەكرێت، بەڵام لەژێر كاریگەری گۆڕانكارییە بەرفراوانە جیهانییەكاندا، ئەو مانایە ڕەهایەی سەروەری گۆڕانی بەسەر داهات، لەژێر كاریگەری ڕێكخراو و دامەزراوە نێونەتەوەییەكان، بەشێوەیەكی ڕێژەیی سیمای سەروەری گۆڕدرا و بە كۆمەڵێك ڕێككەوتنامەی نێونەتەوەیی سنووردراكرا (كامل محمد، ٢٠٠٨: ص٥٤).

ڕۆڵی ئەكتەرە خوارنەتەوەیی و سەروونەتەوەییەكان وایكرد كە نارەزاییە ناوخۆییەكان دەوڵەت ناچار بكەن بۆ دابینكردنی داخوازی و پێداویستیەكانی تاك و گروپە جیاجیاكان و هەروەها چارەسەركردنی كێشەكان هاوكاری لەگەڵ ئەكتەرەكانی تر بكات، كە ئەمەش كاریگەری لەسەر سەروەری دەوڵەت هەیە و ئەم تاقانەبوونەی دەوڵەت لاواز دەكات و ئەمەش وایكرد جۆری نوێ لە ئاسایش بێتە ئاراوە، وەك: ئاسایشی ژینگە، ژنان، ئابووری، پیشە، كەمە نەتەوەیی و ئایینییەكان، مافەكانی مرۆڤ و ... هتد (قەوام، ٢٠٠٩: ل٧٧-٧٨).

لەسایەی سیستەمی نوێی جیهانی و جیهانگیریدا دەوڵەت بەشێکی زۆری چەمکە کلاسیکیەکانی لە دەستدا بەتایبەت ڕەگەزی سەروەری ناوخۆیی کە بە یەکێك لە ڕواڵەتەکانی سەروەری دەوڵەت دادەنرێ، ئامانج لە کۆتکردنی سەروەری ناوخۆیی دەوڵەت ئەوەیە هەندێ لە دەوڵەتان بەهۆی کار و هەڵسوکەوتی دوژمنکارانە بەرامبەر بە هاووڵاتیانی خۆی دەبنە سەرچاوەیەکی مەترسی بۆ سەر هێمنی و ئاسایشی نێودەوڵەتی، لەبەر ئەوە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناتوانێ وەك تەماشاکەر بمێنێتەوە بە پاساوی پاراستنی سەروەری دەوڵەت (قەوام، ٢٠٠٩: ل٤٣). بەگشتی لە چەرخی ئێستادا سەروەری دەوڵەتەکان لەبەر چوار هۆکار لاواز بووە، یەکەم: ئەوەیە کە دەوڵەتان بەشێك لە ئەرکەکانی خۆیان بە دامەزراوە ناوخۆیی و دەرەکییەکان دەسپێرن، دووەم: ئەوەیە کە بازنەی بەکارهێنانی دەسەڵاتی دەوڵەتێك زۆرجار لەگەڵ بازنەی دەوڵەتەکانی تردا تێکەڵاو دەبێ (ملا عمر عیسی، ٢٠٠٨: ل١٠٨-١٠٩). سێیەم: بازاڕی ئازاد و ئابووری کراوە کاریگەری لەسەر سەروەری دەوڵەتان و دەسەڵاتی دەوڵەت هەیە، چوارەم: لە پاش کۆتایی هاتنی جەنگی سارد ژمارەی دەوڵەتان ڕوو لە زیاد بووندایە.

بۆیە دەتوانین بڵێین لەو دەوڵەتانەی کە خاوەن سیستەمی دیموکراسیین سەروەرییان پارێزراوترە، چونکە سەروەری دەوڵەت لە سیستەمی دیموکراسییدا بریتییە لە سەروەری هاووڵاتیان و کۆمەڵگا. لەلایەکی تر لە سەردەمی نوێ دا بەهۆی کرانەوەی جیهان دەوڵەتان ناتوانن خاوەن سەروەری ڕەها بن، بەم مانایە کە ئەگەر ماف و سەروەری هاووڵاتیان نەپارێزن یان پێشێلی بکەن لەلایەن ئەکتەرەکانی تری نێونەتەوەیی بۆ نمونە وەك ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان تووشی گوشار و لێپرسینەوە و تەنانەت تووشی سزادان دەبنەوە کە هەندێکجار سزاکە سەربازییە، بۆیە سەروەری ئەو دەوڵەتانە کە نادیموکراسیین دەکەوێتە ژێر پرسیار، چونکە دەرفەت بۆ دەستێوەردانی دەرەکی دەڕەخسێنن و ئەمەش کاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانە هەیە. کەواتە

دەوڵەتێك کە خاوەن سیستەمێکی دیموکراسی بێت هەم خاوەن سەروەرییە هەمیش ئاسایشی نەتەوەیی پارێزراوە.

**٧.١.٥ـ ناسنامە:**

قەیرانی ناسنامە کاتێك دروست دەبێت کە تاك یان کۆمەڵگە هەست بە گومان و نائارامی و نەبوونی ئاسایش بکات، پرۆسەی بەجیهانیبوون کە هەوڵی بەرفراوانکردنی پانتایی ژیانی کۆمەڵایەتیە، جیهانی کۆمەڵایەتی تاکەکان زۆر بەرفراوانتر دەکات، بۆیە کۆنترۆڵکردنی ئەو پانتاییە فراوانە لەلایەن دەوڵەت ئاسان و مومکین نییە، جیهانی گەورە و کۆنترۆڵنەکراویش، پڕە لە دژایەتی، ئاڵۆزی، گومان و ترس و دڵەڕاوکێ و نەبوونی ئاسایش و سەقامگیری، بۆیە پرسی ناسنامە لە سەردەمی بەجیهانیبوون پێویستی بە دووبارە پێناسەکردنەوە و دانپێنانەوە لەسەر بنەمای فرەیی و داننانە بە ئەویتر، کە ئەوەش خۆی لە دەستەبەربوونی بنەماکانی سیستەمێکی دیموکراسیدا دەبێتەوە (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٢٤٤).

ناکۆکی و پێکدادانەکانی ناسنامەیی لە هەر دەوڵەتێك، کاریگەری نەرێنی لەسەر یەکپارچەیی هەرێمی دەوڵەت و هەروەها یەکگرتوویی کۆمەڵگە و تەنانەت ڕەوایەتی ڕژێم دادەنێت و ئەو کۆمەڵگایانەی کە لە ڕووی ئایینی و نەتەوەیی جیاوازیان کەمترە، سەقامگیرترن و لەو کۆمەڵگە فرە نەتەوە و ئایینیانەی کە سازان و پێکەوە ژیانی ئاشتیانە و قبوڵکردنی یەکتری هەیە و سڕینەوە نییە، ئەوە دەوڵەت ئاسایشی نەتەوەیی پارێزراوە، بەڵام بە پێچەوانەوە ناکۆکی و توندوتیژی ئایینی ـ نەتەوەیی، یەکپارچەیی دەوڵەت دەخاتە ژێر هەڕەشەوە، هەروەها جیاکاری ڕەگەزی لە دەوڵەتانی نادیموکراسی دیسانەوە کاریگەری لەسەر یەکپارچەیی و سەقامگیری و ڕەوایەتی دەوڵەت هەیە (جی مارتین، ٢٠١٣: ص١٥).

قەیرانی ناسنامە پەیوەندی بەهێزی هەیە لەگەڵ پەرەپێدانی سیاسی، چونكە زۆربەی دەوڵەتە نوێیەكان گرفتیان لەگەڵ كۆمەڵگە هەیە كە وەفاداریان دابەش بووە بۆ عەشیرەت، هۆز، كۆمەڵە ئەتنیكیەكان و كۆمەڵە زمانییەكان و ... هتد، ئەم پابەندی و وەفاداریانە، ناكۆكی هەیە لەگەڵ ناسنامەی نەتەوەیی، لێرەوە ئەگەر سیستەمی سیاسی، سیستەمێكی سەردەمیانە بێت، پێویستە كە هەستێكی هاوبەش دروست بكات لەنێوان تاكەكانی كۆمەڵگەیەكی هاوبەش و دیاریكراو و سەركەوتوویی سیستەم لە چارەسەركردنی ئەم قەیرانە، بە مانای توانای وەڵامدەرایەتی دەوڵەتە بۆ ویست و داواكارییەكانی هاووڵاتیان (صادق **الشريفي**، ٢٠٠٧: ص١٣١).

كاتێك تاك دەتوانێت بڵێت كە خاوەن ناسنامەیە، كە لە بەردەوامی و ئاسایشی خۆی دڵنیا بێت، چونكە بەردەوامی و ئاسایش وادەكات كە تاك هەست بە كەسایەتیەكی جێگیر بە درێژایەتی زەمەن بكات، ناسنامە لەسەر بەردەوامی مانا پەیدا دەكات، كەواتا هەر جۆرە ناسنامەیەك، تاك یان كۆمەڵایەتی پێویستی بە بەردەوامی و ئاسایشی ناسنامەییەكەی هەیە (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٢٣٥). ناسنامە لە سیستەمە نادیموكراسییەكاندا و یان لە كۆمەڵگە نەریتیەكاندا، بەهۆی هێزەكانی وەكو: نەریت، سروشت، گوتاری زاڵی دامەزراوە كۆمەڵایەتیەكان وەك دامەزراوە ئایینی و سیاسییەكانی سنووردار و كۆنترۆڵكراوبوون. بۆیە تاك نەیدەتوانی بە سەربەستی و ئازادی گوزارشت لە ناسنامەی خۆی بكات و ئەو هێزانە بوون كە پێناسەی ناسنامەی تاكیان دەكرد، بۆیە لە ڕاستیدا ناسنامەكە بریتی نەبوو لە ناسنامەی تاك بەڵكو بە ویست و گوشار و هێزی دەرەكی یان ئەویتر دروستكرابوو، لەسەردەمی بەجیهانیبوون بەهۆی گۆڕانكارییەكان و كەمبوونەوەی دەسەڵاتی ڕەهای دەوڵەت و ئەو دامەزراوە نەریتیانە وایكردووە كە تاك و گروپە كۆمەڵایەتیە پەراوێزخراوەكان تاڕاددەیەك ئازاد و سەربەخۆ بن لە دەستنیشانكردن و گوزارشتكردن لە ناسنامە

و بەرژەوەندی خۆیان، بۆیە پرۆسەی بەجیهانیبوون وایکرد ناسنامە دروستکراو و دەستکردەکان بگۆڕێن، بۆیە لە ئێستادا تاك و کۆمەڵگە و گروپە جیاجیا کۆمەڵایەتییەکان خەریکی بونیاتنانەوەی ناسنامەی خۆیانن (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٢٥١).

ئاسایشی مرۆڤی تەنیا پرس و بابەتێکی سەربازی و ژینگەیی و ئابووری نییە، بەڵکو ڕەهەندی دەروونی و کلتووریشی هەیە، لەم ڕووەشەوە، پرسی ئاسایش و ناسنامەی تاك و گروپە جیاجیاکان بۆ ئاسایشی تاك و کۆمەڵگە گرنگی لەڕادەبەری هەیە، بەجیهانیبوون، بوار و دەرفەتی ڕەخساندووە بۆ ناسنامەکان بەهۆی لاوازبوونی ڕۆڵی هەرێمی بەهۆی پەیوەندییەکان و ئامرازەکانی گەیاندن و شۆڕشەکانی زانیاری، واتە بەجیهانیبوون گۆڕانکارییەکی لە ڕوانگەی تاك ڕەهەندی یان سەپێنراوی ناسنامەی نەتەوەیی بۆ ناسنامەی ڕەگەزی، کەمە نەتەوەکان، چین، نەوە (جیل)، پیشە، نەژاد، مەزهەب و .... هتد، دروستکردووە. کە ئەمەش پرسی ئاسایشی نەتەوەیی کە تاك ڕەهەندی بوو گۆڕیوە بە پرسێکی ئاڵۆزی کۆمەڵایەتی و چەند یان فرە ڕەهەند (شولت، ٢٠٠٣: ص٩١١).

لە سیستەمێکی نادیموکراسیدا، دەوڵەت هەوڵدەدات هەموو بوارەکانی کۆمەڵایەتی و کلتووری و ئابووری و ... هتد. بە ئاسایشی بکات و هەوڵدەدات سیستەم کۆنترۆڵی مرۆڤ بکات و ڕێگە نادات بەوەی کە ئۆپۆزیسیۆن و میدیای ئازاد و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی دروست بن یان ئەگەریش هەبێت ڕواڵەتیە و هەموو ئامانجی ئەوەیە کە نایەوێت تاك ناسنامەی سەربەخۆی هەبێت. چونکە دەوڵەت لە سیستەمێکی تۆتالیتەر هەوڵی دزەکردنی لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ وەك ژیانی ئابووری، پەروەردە، کلتوور، ئایین، خێزان و .... هتد، دەدات، ئەم جۆرە سیستەمە سیستەمێکی گشتگیر و هەوڵی قۆرخکاری دەدات لە ڕێگەی ئایدیۆلۆژیایەکی دیاریکراو و لە ڕێگەی چاودێری توند و هەروەها تایبەتمەندی تیرۆریستیەوە دەناسرێتەوە کە هەوڵی تۆقاندنی تاك و گروپەکان و لایەنە نەیارەکان

دەدات و توندوتیژی دەكاتە بنەمای سیاسەت و بەم ڕێگەیە ناسنامەی ویستراوی سیستەم دەسەپێنێت بەسەر تاكەكاندا (هێیورد، ٢٠٠٧: ل١٤٠).

بەپێی ئامارێك لە (١٣٢) دەوڵەتی جیهان لە ساڵی (١٩٧٢)ـدا تەنیا (١٢) دەوڵەت یەكپارچە بوون و (٩٠٪)ـی ئەوانی تر خاوەن فرەیی بوون و ئەمڕۆكە ئەمە لە توندوتیژییە سیاسییەكان لەناوخۆیی دەوڵەتاندا دەبینن، جیاوازیەكانی نێوان گروپە جیاجیاكان بواری بۆ فرەیی بوونی پێویستی و بەهاكان و بەرژەوەندییەكان ڕەخساندووە، بۆ نمونە: بەها و بەرژەوەندی كوردەكان لە عیراق جیاوازن لەگەڵ سیستەمی فەرمی (پێش ڕووخانی) یان لە سریلانكا لە نێوان (تامیل) و سیستەمی ناوەندی و ... هتد، كە ئەمانەش دەبنە هۆی هەڕەشە و مەترسی بۆ یەكپارچەیی و یەكگرتوویی دەوڵەت، نمونەكان لە ئاستی نێونەتەوەش ئەو ڕاستیە دەردەخەن، بۆ نمونە: كشمیر لە نێوان هیندستان و پاكستان، كێشەی عەرەبەكان و ئیسرائیل، قوبرس، ئەریترە، لوبنان، ئۆگاندا، سۆماڵ، كوردەكان، سریلانكا و ... هتد، كە كۆی ئەم كێشە ناوخۆییانە تواناكانی ماددی و ئابووری سیاسی دەوڵەت وێران دەكەن و سەرچاوەی توندوتیژی و دەستێوەردانی دەركی و دوژمنایەتییە لەو دەوڵەتانە، كەواتە قەیرانی ناسنامە یەكێك لە سەرەكیترین هەڕەشە و مەترسیەكانە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی لە دەوڵەتانێك كە ئەم كێشە و جیاوازیانە بەشێوەی دیموكراتیك بەڕێوە ناچێت (**آذر و جونگ**، ١٩٩٨: ص٤٨).

هەروەها ڕەهەندی كۆمەڵگەیی ئاسایشی نەتەوەیی پەیوەندی هەیە بە ئاستی هەستكردنی تاك و گروپە كۆمەڵایەتیەكان بە پابەندی و وەفاداری بۆ دەوڵەت، لێرەوەیە كە نادادپەروەری كۆمەڵایەتی كە لە جیاوازی قووڵی چینایەتی و هەروەها نەبوونی خزمەتگوزاریە سەرەتایی و بنەڕەتییەكان دەبنە هۆی مەترسی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی و ئەم ڕەهەندەش پەیوەندی هەیە بە ئاست و ڕێژەی یەكگرتوویی نەتەوەیی و نیشتمانی كە پێویستیەكی سەرەكییە بۆ دەوڵەت و پاڵپشتی لە ویست و ویستی نەتەوەیی دەكات كە هەموویان لەسەر بەرژەوەندی و

ئامانجەکانی ئاسایشی نەتەوەیی کۆ دەکاتەوە، بۆیە چەوساندنەوەی چین یان گرووپێکی دیاریکراو یان ناسنامەیەك و یان زیادبوونی هێڵی هەژاری دەبنە هۆی هەڕەشە و مەترسی ڕاستەقینە لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی کە کۆنترۆڵ کردنی کارێکی دژوارە (**ذكي** ابراهيم، ٢٠١٢: ص٣).

دادپەروەری و یەکسانی ئەو بەها بنەڕەتیانەن کە لە نەبوونیاندا کەشوهەوای سیاسی ـ کۆمەڵایەتی لە گەلێك لە ناوچەکاندا تێکچووە و بووەتە هۆی نەمانی ئاسایش، ئێستا دادپەروەری و یەکسانی بنچینەی ئاسایشی جیهانی پێکدەهێنن و هەر لەسەر ئەم بنەمایە گرنگترین زیان لەم لایەنەوە تووشی هاوولاتیانی جیهان دەبێ، پەرەسەندنی تەکنەلۆژیایی پەیوەندییەکان، نادادپەروەری و نایەکسانییەکان لەسەر پێوەری جیهانی هەڵدەسەنگێنی و پێناسەی دەکات، هەر بۆیە هەستکردن بەبێبەشی نەك لەقەڵەمڕەوی نەتەوەیی، بەڵکو لە پانتایی جیهاندا خۆی دەنوێنێ (ملا عمر عیسی، ٢٠٠٨: ل١٣٠). نایەکسانی لەهەر کۆمەڵگەیەکدا دەرئەنجامی قۆرخکاری و دەستبەسەرداگرتنی، بەگشتی سەرچاوە ماددی و بەهاییەکان دروست دەبێت، هەروەها ئەم نایەکسانە سەردەکێشێت بۆ نایەکسانی قووڵی چینایەتی، ڕەگەزی، نەتەوەیی و ئایینی و ... هتد، کە ئەمەش دەبێتە هەڕەشە بۆ سەر یەکگرتوویی کۆمەڵگە و دەوڵەت و هەروەها سەقامگیری و ئاسایش (کیللی، ٢٠١٠: ص١٨٥). بۆیە پرسی ئاسایشی ناسنامە و یان ئاسایشی کۆمەڵگەیی پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە دیموکراسییەوە هەیە.

بۆیە لە دەوڵەتێکدا کە خاوەن سیستەمێکی دیموکراسییە ناسنامەی دەوڵەت بریتییە لە ناسنامەی هەموو پێکهاتە و لایەنە جیاوازەکانی کۆمەڵگا، بەپێچەوانەوە لە سیستەمێکی نادیموکراسی دەوڵەت هەوڵ دەدات ناسنامەیەکی تایبەت لە ڕێگەی هێز بەسەر پێکهاتەکانی کۆمەڵگە بسەپێنێت، بۆ ئەوەی کە ناسنامە جۆراوجۆرەکان بسڕێتەوە و لەناو ناسنامەیەکی ویستراوی دەسەڵات بتوێنێتەوە. ئەم جۆرە سیاسەتەش پێکدادان و توندوتیژی و ناسەقامگیری لێ

دەكەوێتەوە و لە كۆتایشدا دەبێتە دروست بوونی نائاسایشی لە دەوڵەت. بۆیە تا دەوڵەت دیموكراسیتر بێت و دان بە ناسنامە جیاوازەكان بنێت، ئەوا ئاسایشی كۆمەڵگەیی پارێزراوتر دەبێت و لە ئەنجامدا ناسنامە و ئاسایشی نەتەوەیی لە سیستەمێكی دیموكراسییدا بریتییە لە ناسنامە و ئاسایشی دەوڵەت و كۆمەڵگە.

### ٢.٥- بەجیهانیبوون:

لەسەردەمی ئێستادا ناتوانین باس لە ئاسایشی نەتەوەیی و تەنانەت دیموكراسیش بكەین بەبێ ڕەچاوكردنی كاریگەرییەكانی پرۆسەی بەجیهانیبوون، چونكە بەجیهانیبوون كاریگەری قوڵی لەسەر هەموو پرس و بابەتە ناوخۆیی و نێونەتەوەییەكان بەتایبەت ئاسایشی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی و دیموكراسی هەیە، بۆیە هەوڵ دەدەین كاریگەرییەكانی ئەم پرۆسەیە لەسەر دیموكراسی و ئاسایشی نەتەوەیی بخەینەڕوو و هەروەها باس لە پرسەكانی مافی مرۆڤ و دەستێوەردانی مرۆیی و ژینگە و تیرۆر بكەین.

### ١.٢.٥- بەجیهانیبوون و ئاسایشی نەتەوەیی:

لە سەردەمی بەجیهانیبوون قۆناغێكی نوێ دەستی پێكرد، ئەویش سیاسەت لەچوارچێوەی ئاسایش و ئابووری و مافی مرۆڤ و دیموكراسی و ... هتد، بەڕێوەدەچێت. ئەم چەمكانە سیستەمە سیاسییەكان بەرەو لێكچوونی زیاتر یان بەرەو یەكێتی دەبات و ئەو دەوڵەتانەی كە سیستەمەكەیان نادیموكراسییە تووشی گرفت و قەیران بوون لە بواری جۆراوجۆردا، بۆ نمونە، یەكێك لە خاڵە لاوازەكانی سیستەمە نادیموكراسییەكان ئەوەیە كە ئاسایشی جیهان وەك پێویستیەكی سەرەكی بۆ ئاسایشی هەموو دەوڵەتان نازانن، بەڵام ئەم سیستەمانە ناتوانن بەهۆی پێكهاتە نادیموكراسییەكەیان خۆیان بگونجێنن و ئەم گۆڕانكاریە نوێیانە هەڕەشە لە ئاسایشیان دەكات و تووشی ناسەقامگیری و نارەزایەتی و لە كۆتاییدا

هەڵوەشانەوە یان ڕووخانی سیستەم دەبنەوە (ڕەسول شینکی، ٢٠١١: ل٤٠).
بەجیهانیبوون پرۆسەیەکە کە لە میانەیدا، کاڵا، خزمەتگوزاری، بیر، سەرمایە و مرۆڤ و زانیاری دەگوازرێتەوە لە سەرووی سنووری نەتەوەییەکان، کە بۆتە هۆی زیاتربوونی گرێدراوی و تەواوکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی لە نێوان دەوڵەتەکان و کۆمەڵگەکان، دەتوانین بڵێین کە بەجیهانیبوون دەبێتە هۆی زیادبوونی پەیوەندی دوولایەنە لە نێوان کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی (**محمد مسعد، ٢٠٠٩: ص١٣٠**).

ڕۆبەرت کۆهن و جۆزیف نای بڕوایان وایە کە لە سەردەمی بەجیهانیبووندا ئێمە ڕووبەڕووی دیاردەی سەروونەتەوەگەرایی بوینەتەوە، بەم مانایە کە بە هۆی دروستبوونی پەیوەندی سەروونەتەوەیی، دەوڵەتەکان بەرەبەرە کۆنترۆڵی خۆیان لەسەر دیاردەکان لە دەست دەدەن و ئەم بڵاوبوونەوەی پەیوەندییە سەروو نەتەوەییانە لە نێوان کۆمەڵگەکاندا کە ڕێگەی ئامرازی نوێ دەکرێت، دەبێتە هۆی گۆڕانکاری لە ڕوانگەی تاکەکان و کۆمەڵگەکان و لێرەوەیە کە سەروەری دەوڵەتان بەتایبەت دەوڵەتانی نادیموکراتیك تووشی گیروگرفت و کێشە دەبێت (ڕسولی **ثانی آبادی، ٢٠١٣: ص٥**).

سەردەمی بەجیهانیبوون سەردەمێکە تیایدا ڕووداو و گۆڕانکارییەکان بەخێرایی ڕوو دەدەن، ئەمەش وا دەکات کە دامەزراوەکانی ئاسایش لە ڕووی پراکتیزەکردنی ئەرکەکانیان ڕووبەڕووی بەرەنگاربوونەوە ببنەوە بەتایبەت لە دۆخێکی ناجێگیری ئاسایشی، بۆیە لەسەر دامەزراوەکانی ئاسایش پێویستە کار لەسەر ژینگە و دۆخێکی گۆڕاو بکەن بەم واتایە کە بەپێی گۆڕانکاری و پێشهاتەکان توانای گونجانیان لەگەڵ دۆخی نوێ هەبێت و پێویستە پێش ڕووداو و گۆڕانکاریەکان توانای پێشبینی و ڕووبەڕووبوونەوەیان هەبێت، چونکە هەڕەشە و مەترسیە ناکلاسیکیەکان زۆر زیادی کردووە و زۆر ئاڵۆزن کە جیاوازن لە هەڕەشە کلاسیکیەکان وەکو هێرشی دەرەکی، بەڵکو لە ئێستادا ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی هەڕەشە و مەترسی ژینگە و چەکی کۆکوژ و تیرۆر، ماددە

هۆشبەرەكان، قەیرانی ئابووری و دارایی، كۆچی نایاسایی، گروپەكانی مافیایی و توندوتیژی و قاچاغی مرۆڤ، هێرشی سایبەری دەبنەوە. هەروەها لە ئاستی ناوخۆیی ڕووبەڕووی داواكاری و ویستی گروپە كلتووری و كۆمەڵایەتی و كەمینەكان و بزوتنەوەكان دەبنەوە (موسی **البدانیة**، ٢٠١١: ص٣٥).

بەجیهانیبوون بەهۆی كاریگەریەكانی ئەو دەوڵەتە فرە ناسنامانەی كە لەسەر بنەمای یەك دەوڵەت و یەك نەتەوە، یەك ناسنامە و .... هتد، دروستبووە تووشی قەیران كردووە. بەهۆی خولقاندنی ڕەوشێكی نوێ لە بوارەكانی مافی مرۆڤ، ئازادی تاكەكەس، دادپەروەری كۆمەڵایەتی، كۆمەڵگەی مەدەنی، سیستەمی دیموكراسی و ... هتد، كەواتا چیتر ناتواندرێت ناسنامەكانی تری نەتەوەیی، ئایینی، ڕەگەزی پەراوێز بخرێت، بۆیە بەجیهانیبوون دەرفەتی بۆ دیاریكردنی چارەنووسی خۆیان ڕەخساندووە (ڕەسول شینكی، ٢٠١١: ل٤٤٨). یەكێك لە تایبەتمەندییەكانی بەجیهانیبوون زیاتربوونی ڕۆڵی ئەكتەرەكانی سەروونەتەوەیی و خوارنەتەوەییە، لەم سەردەمەدا بەشێك لە سەروەری دەوڵەتان بەرەو سەرەوەی نەتەوە (دامەزراوەكانی ئابووری جیهانی و سیاسی و سەربازی) و بەشێك بۆ خوارنەتەوە (گروپەكانی نەتەوەیی و هاووڵاتیان) گوازراوەتەوە، وەكو ڕێكخراوی ئابووری جیهانی و بانكی جیهانی و سندووقی نێونەتەوەیی دراو و كۆمپانیا فرە ڕەگەزەكان و ڕیكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان و ناتۆ (عسكری، ٢٠٠٢: ص١٨٧).

بەهۆی زۆربوون و بڵاوبوونەوەی چەك بەتایبەت چەكی ناوەكی، ئەگەری جەنگی گەورە هەیە كە ڕووبدات، كە ناكرێت هیچ لایەنێك تێدا چاوەڕوانی سەركەوتن بێت، بەهۆی ئەو گۆڕانكاریانە و دەركەوتنی هەڕەشە و مەترسی نوێ دەوڵەت ناتوانێت بەهێزی سەربازی ڕووبەڕووی هەڕەشە و مەترسییەكان ببێتەوە، ئەمەش وایكردووە ئابووری جوگرافی دەوڵەتان بەڕووی یەكتر بكرێنەوە و پەیوەندی

زیاتریان پێکەوە هەبێت، ئەمەش دواجار وادەکات کە گۆڕان بەسەر بەرژەوەندی نەتەوەیی و دەسەڵاتی نەتەوەییدا بێت (ڕەوشەندڵ، ۲۰۰۹: ل۲۳).

گۆڕانکاری و پێشکەوتنەکان لە سەردەمی نوێ کاریگەریان لەسەردروستکردنی بڕیار و مۆنۆپۆلکردنی ئەرکەکانی دەوڵەت بە مانای ڕووخان و کۆتایی دەوڵەت نییە، بەڵکو ئەم گۆڕانکارییانە، گۆڕانکاریان لە ئەرکەکان و بڕیارەکانی دەوڵەتدا دروستکردووە و ڕای گشتی لە دەوڵەتانی دیموکراسی پێشکەوتوو نفوز و کاریگەرییان هەیە لەسەر دەوڵەت. لەژێر سایەی سەردەمی نوێ، گۆڕانکاری لە ئەرکەکانی دەوڵەت لە ڕووی سیاسی و ئابووری کراوە، بۆ نمونە یەککگرتوویی بازاڕەکانی جیهانی لە ڕووی مافەکانی بازرگانی و وەبەرهێنان و گواستنەوەی ماڵ و دارایی و کلتوور و ئازادی بازاڕەکان، هەموو ئەوانە کاریگەرییان لەسەر پرسی دەوڵەت لەمیانەی نفوز لەسەر سنووری نەتەوەیی دەوڵەت هەیە (**جابر مهدي**، ۲۰۰٤: ص٥٦).

لەسەردەمی بەجیهانیبوون دەوڵەت توانای کۆنترۆڵ کردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی لاواز بووە، پێشتر سنوورەکانی کۆمەڵگە لەلایەن دەوڵەتەوە دیاریدەکرا و ماناشی پێ دەبەخشرا و بەردەوام سنوورە کۆمەڵایەتیەکان و سنوورە سیاسییەکان لە چوارچێوەیەکی سیاسیدا یەکیان دەگرتەوە، هەروەها سنوورە کلتووری و ناسنامەییەکان بەهۆی هەوڵە بەردەوامەکانی دەوڵەت بە میکانیزمی توندوتیژی لە سنوورە سیاسییەکە نەدەترازا، هەرچەشنە کلتووری یان نەتەوەیی یان ژێرنەتەوەیی بە هەڕەشە و مەترسی هەژمار دەکرا، بەڵام پرۆسەی بەجیهانیبوون سنوورەکانی دەوڵەتی کاڵ کردەوە و ئەمەش وایکرد سنووری سیاسی و کۆمەڵایەتی دەوڵەت لە یەکتری جیابکرێنەوە، کە پێشتر بەهۆی سەرکوتکردنەوە لەلایەن دەوڵەت دەستی بەسەرداگیرابوو. لەم دۆخەدا بارودۆخی کۆمەڵایەتی گۆڕانی بەسەرداهات و کۆمەڵگە توانی بە ئاستێکی ڕێژەیی خۆی لە کۆنترۆڵی دەوڵەت ڕزگار بکات و دووبارە هێز و گروپە کۆمەڵایەتیەکان توانای

خۆرێکخستنەوە و دووبارە پێناسەکردنەوەی خۆیان هەبێت و پەیوەندی بان نەتەوەیی و ژێر نەتەوەیی پەرەبسێنێت (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٧٥).

یەکێك لە دەرکەوتەکانی پرۆسەی بەجیهانیبوون لە بواری سیاسی بریتییە لە بڵاوبوونەوەی کۆمەڵێك پرەنسیپ و بەهای سیاسی کە پێویستە تەواوی دەوڵەتانی جیهان لە پرۆسەی سیاسی دەوڵەتەکەیان ڕەچاوی بکەن، وەك: ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و جێبەجێ کردنی میکانیزمەکانی دیموکراسی و فرەلایەنی سیاسی و ئازادی بیرورا لە ژیانی سیاسیدا (حەسەن شاکر، ٢٠١١: ل ٥١). لەسەردەمی بەجیهانیبوون دەوڵەت دەبێت بتوانێت بەجۆرێك کار بکات تابتوانێت خۆی لەگەڵ گۆڕانگارییەکانی سیستەمی ناوخۆ و دەرەکی بگونجێت و لە پاڵێشیدا پێکهاتەی بۆ ئاسانکاری ئەم دۆخە بگۆڕێت. ئەمرۆ لە پرۆسەی بەجیهانیبوون پەیوەندی نێوان هۆکاری ناوخۆیی و دەرەکی ئەوەندە زۆرە کە دەوڵەتان دەبێت سەبارەت بە پێکهاتەکانی خۆیان پرۆژە و ستراتیژی نوێییان هەبێت بۆ دابینکردنی پێداویستیەکانیان کە لە فراوانی ڕۆڵی هاووڵاتیان و سەرهەڵدانی بەرژەوەندی نوێ دا خۆی دەبینێتەوە، بۆیە دەبێت دەوڵەت لەگەڵ گۆڕانکاری و داخوازی و داواکارییە نوێییەکانی هاووڵاتیان بەردەوام خۆی نوێ بکاتەوە (قەوام، ٢٠٠٩: ل٦٩).

بەجیهانیبوون لە ڕووی کلتووری و سیاسییەوە، بۆتە هۆی ئەوەی کە کلتووری سونەتی بۆ کلتووری مۆدێرن و هاووڵاتیبوون بگۆڕدرێت، بەم مانایە (ڕەعیەت) ببێتە (هاووڵاتی) و ئەمەش وادەکات کە ئەو دەوڵەتانەی کە نادیموکراسین، واتە دیکتاتۆری یان تۆتالیتەرن تووشی قەیرانی ڕەوایەتی ببن، کە ئەمەش کاریگەری لەسەر سەقامگیری و هەروەها ئاسایشی نەتەوەیی ئەو دەوڵەتانە هەیە (امامی، ٢٠٠١: ص٢٧٥).

بەجیهانیبوون هەڕەشە لە دەسەڵاتی دەوڵەتە دەسەڵاتخوازەکان دەکات، بەجۆرێك کە لە نەبوونی ڕێساکانی دیموکراسی و دامەزراوەیی بوون لەم دەوڵەتانەدا، بەجیهانیبوون گوشارێکی زیاتر دەخاتە سەر دەوڵەتەکان بۆ

بەکارهێنانی ستاندارده نێودەوڵەتیە نوێیەکانی سەروەری، بەتایبەت لە بواری شەفافیەت و بەرپرسیاربووندا، نەبوونی دامەزراوە دیموکراتیەکان بە سەرچاوەی یەکەمی لاوازی سیستەمی سیاسی دەوڵەتانی دواکەوتوو لە قەڵەم دەدرێ (ملاعمر عیسی، ٢٠٠٨: ل١٤٨).

شۆڕشەکانی پەیوەندی و زانیاری بەڵگەی ئەو قسەیەی لاوازکرد، کە دەوڵەتێکی دیاریکراو لە دزەکردنی نفوزی دەرەکی بۆ ناوخۆیی دەوڵەت پارێزراوە، بەهۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەی تیرۆر و چالاکییە نانیشتمانییەکان بووە هۆی ئەوەی کە ئەو دەسەڵاتە باڵا و پاوانخوازەی دەوڵەت وەکو تاکە هێزی دەسەڵاتدار لە دەوڵەت نەمێنێت یان لاواز بێت و لە ئەنجامدا ئاسایش کەوتە ژێر کاریگەری ئەم فاکتەرە نانیشتمانیانە کە بۆتە کێشەیەکی ناخۆیی و جیهانی (کامل محمد، ٢٠٠٨: ص٦٦).

لە ڕوانگە لیبرالەکانەوە، بەجیهانیبوون لە ڕێگەی سێ پرۆسەی کلتوور، سیاسەت و ئابووری کە پێکەوە کارلێك دەکەن کاریگەری لەسەر دەوڵەتان هەیە، لە بواری کلتووریدا کۆمەڵگەی تەقلیدی بەرەو کۆمەڵگەی نوێ دەچێت و لە بواری ئابووریدا بەهۆی ئازادبوونی ئابووری و بازاڕی ئازاد و بەهێزبوونی کەرتی تایبەت و لە بواری سیاسەتدا بەجیهانیبوون لە ڕێگەی پرۆسەی زیادکردنی بەشداری سیاسی هاووڵاتیان لە سیاسەت و بەهێزکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی، دەبێتە هۆی بەهێزبوونی دیموکراسی (روزنا، ١٩٩٩: ص٢١).

لەڕابردوودا یەکێك لە گرنگترین کارەکانی دەوڵەتی مۆدێرن بەهۆی هەبوونی هێز بریتی بوو لە ئاسایش لەچوارچێوەی سنوورە نەتەوەییەکەی، بۆیە دەوڵەت ئاسایشی نەتەوەیی و هەڕەشە و مەترسیەکانیشی پێناسەکراو بوو و هێزی پێویست بۆ لەناوبردنی بریتی بوو لە هێزی سەربازی، بەڵام بەجیهانیبوون بەهۆی گۆڕانکاری لەجۆری هەڕەشەکان و هاتنەئارای هەڕەشەی نوێ و بەرجەستەبوونی ڕەهەندی ناوخۆیی ئاسایش، بوو بەهۆی بێ واتابوونی یان کەمکردنەوەی ڕۆڵی

هێزی سەربازی لە دابینكردنی ئاسایشی نەتەوەیی بەتایبەت لە بواری ئاسایشی ناوخۆ، ئەمەش وایكرد كە كاریگەری هەموو هاوپەیمانییە سەربازییەكان لەسەر ئەم هەڕەشە و مەترسییە نوێیانە لەئاستی ناوخۆ بكەوێتە ژێر پرسیار.

كاریگەری میدیا و پێشكەوتنەكانی تەكنەلۆژیا و ئامرازەكانی پەیوەندی و شۆڕشەكانی زانیاری وایكرد كە ڕووداو و پێشهاتە و پرسەكانی ناوخۆیی ڕەهەندی نێونەتەوەییان هەبێت و بەپێچەوانەوە. ئەمەش وایكرد كە ڕۆڵی دەوڵەت لاواز بێت بەهۆی ئەوەی كە ئەكتەری تر لە ئاستی ناوخۆیی و سەروونەتەوەیی بێتەئاراوە. لێرەوەیە بارودۆخی ناوخۆیی لە ئاسایشی نەتەوەیی نوێدا بەرگری نەتەوەیی و ئاسایشی نەتەوەیی لە چوارچێوەی ئابووری و سیاسەتدا پێكەوە كۆكراونەتەوە و چیتر تەنیا سەربازی نییە بەڵكو بەهۆی گۆڕانكاری لە سروشتی هێز و هەڕەشە و مەترسیە ناوخۆییەكان و دەرەكییەكان بەهۆی پرۆسەكانی بەجیهانیبوونەوە وایكردووە كە دەبێت فرەلایەن بابەتەكان بخوێندرێتەوە، بۆ نمونە: هەڕەشەكانی تیرۆریزم و تاوانی سایبەری، شوشتنەوەی پارە، قاچاغی ماددە هۆشبەرەكان، قاچاغی چەك، قاچاغی كاڵا، دزینی زانیاری و تێكدانی ئابووری، كەمبوونی بوودجەی دەوڵەت، كەمبوونەوەی ئاستی گەشەسەندنی دەوڵەت بەتایبەت لە ڕووی ئابووری، بێكاری، هەژاری و كەمبوونەوەی ئاستی سەلامەتی، دواكەوتوویی لە بواری تەكنەلۆژیا، ناسنامە نوێیەكان یان گۆڕانكاری لە ناسنامەكان، جەنگ و بەرزبوونەوەی تێچووی چەكداری و بەگشتی هەر جۆرە مەترسی و هەڕەشەیەك بۆ بەها سیاسی و ئابووری و كلتووریەكانی دەوڵەت (شكوە، ٢٠١٢: ص٩٥).

لە ڕاستیدا بەجیهانیبوون پرۆسەیەكە یەكێك لە ڕەهەندەكانی دیموكراسییە، چونكە پرۆسەی بەجیهانیبوون سنوورە داخراوەكانی دیكتاتۆرە سیاسییە لۆكاڵیەكانی لاواز كردووە. زاڵبوون و باڵادەستی سیستەمە نادیموكراسییەكان بەسەر ژیانی هاوولاتیان چیتر مومكین نییە لەژێر هەر پاساوێك بێت، دامەزراوە

ئایدیۆلۆژییەکانی دەوڵەت لەم نێوەندەدا دەسەڵاتەکانی پێشتری خۆیان لە دەستداوە و هەژموونی کلتووری و ئایدیۆلۆژیان لاوازبووە و چیتر چینی فەرمانڕەوا لە ئاستی ناوخۆ ناتوانن تەنیا بە حەز و ویستی خۆیان فەرمانڕەوایی بکەن، بەجیهانیبوون وایکردووە کە کەمبوونەوەی سنووری دەسەڵاتی دەوڵەت بە قازانجی داخوازییە دیموکراسییەکانی چین و توێژە جیاوازەکان تەواو بووە، چونکە پڕۆسەی بەجیهانیبوون لاوازی ناسیۆنالیزمی فەرمی دەوڵەتانی لێکەوتۆتەوە و هەندێك جار ئەم سیستەمە نادیموکراسیانە و داخراوانە بوونەتە هەڕەشە بۆ سەر ئاشتی و ئاسایش لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە (باسام، ٢٠٠٩: ل٢٨١).

### ٢.٢.٥- میدیا و زانیاری:

سەردەمی بەجیهانیبوون بە سەردەمی زانیاری ناسراوە، کە تیایدا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی لەچوارچێوەی یەك کۆمەڵگە کە پێی دەگوترێت (گوندی جیهانی) یان پێناسەی گوندی بۆ دەکرێت و لە ڕێگەی کرانەوەی جیهان بەهۆی کەناڵەکانی پەیوەندی و ڕاگەیاندن و زانیاری، وایلێهاتووە کە دیموکراسییەت و مافەکانی مرۆڤ ببنە دوو پرەنسیپی گەردوونی. بۆیە لە ئێستادا سیستەمە سیاسییەکان ناتوانن وەکو پێشتر پێشێلی مافەکانی مرۆڤ بکەن و ویست و داخوازییەکانی هاوولاتیان پشتگوێ بخەن یان بە واتایەکی تر تەنانەت ڕژێمە دیکتاتۆریەکانیش باس لە دیموکراسی دەکەن (بوبکر، ٢٠١١: ص١٩٤).

بەجیهانیبوونی میدیا سروشتێکی نوێی بۆ هێز دروست کردووە کە دەتوانین بەهێزی نەرم پێناسەی بکەین. خێرایی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە تێکەڵبوونی ئایدیا و هێماکانەوە سەرچاوەی گرتووە، هێزی میدیا بە پێچەوانەی هێزی ڕەق (Hard Power) خاوەن ئاسەواری درێژخایەن و لەسەرخۆیە. میدیا دەتوانێت بارودۆخەکە نیشان بدات هەروەها دەتوانێت بەم نیشاندان و گواستنەوەیە بارودۆخی ناوخۆیی بە یارمەتی دەرەکی باشتر یان بەرەو دەستێوەردانی ببات و تا

میدیا چالاكتر بێت و لەژێر دەستی لایەنێكدا بێت، ئەوە هێزی قەناعەت پێهێنانی ئەو لایەنە زیاتر دەبێت.

لە لایەكی ترەوە میدیا دەتوانێت ببێتە هۆی یەكگرتوویی نەتەوەیی و ئاراستەكردن و دروستكردنی ڕای گشتی بەهۆی دروستكردنی بەها هاوبەشەكان، بۆیە لەم هەلومەرجەدا سیستەمە دەسەڵاتخوازەكان دەبێت پابەندبن بە بیروبۆچوونی هاووڵاتیان و ڕای گشتی. بەم جۆرە دەتوانین جۆرێك لە بزاڤی جیهانی ببینین بەرەو بە دیموكراسیبوون، هەرچەندە ئاسەواری ئەم كاریگەرییە لە هەموو شوێنێكی جیهان یەكسان نییە، لەسەردەمی بەجیهانیبووندا دەوڵەت بۆ كۆنترۆڵكردنی زانیاری توانای لاواز بووە و دەسەڵاتی بەسەر فەزا و زەمەندا كورت بۆتەوە، چونكە پێشتر زانیاری لە چوارچێوەی جوگرافیای دەوڵەت گەمارۆ درابوو، لە ئێستادا بەهۆی پێشكەوتنەكانی تەكنەلۆژی و ئامرازەكانی پەیوەندی و شۆڕشی زانیاری گۆڕان بەسەر مەودا و تێچوونی كات و شوێندا هاتووە. ئەمەش وایكردووە لەو بۆشاییە فراوانەدا نەتوانێت كۆنترۆڵی هەموو زانیارییەكان بكات، هەرچەندە دەوڵەت تا ئێستاش دەتوانێت بەشێكی زۆر لە سەرچاوە ماددیەكان لە سنووری دەسەڵاتی خۆیدا كۆنترۆڵ بكات، بەڵام كۆنترۆڵكردنی زانیاری پرۆسەیەكی ئاڵۆز و دژوارە، بۆیە هەتا كۆمەڵگەكان زیاتر كۆمەڵگەی زانیاری بن، كۆمەڵگەی چالاك دەبن و پەیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانی بان نەتەوەیی زیاتر دەبن و ئەمەش زیاتر بوار بۆ كۆمەڵگە دەرەخسێنێت كە ئازاد بێت لە كۆنترۆڵی دەوڵەت (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٨٣).

لەم سەردەمە زانیاری بۆتە ئامراز و ئامانج، هەروەها بەهایەكی بەرزی هەیە لە بەدەستهێنانی ئامانجە كۆمەڵایەتیەكان، بۆیە بۆتە بەهایەكی ئاسایشی و سیاسی و كارگێڕی، لەلایەكی تر پاراستنی زانیاری لەم سەردەمەدا بەهۆی كرانەوەی جیهان بەڕووی یەكتر كارێكی ئەستەمە، بۆیە زۆرجار گروپ و لایەنەكانی تر وەكو تیرۆریستان سوودیان لە تۆڕەكانی زانیاری بۆ ئامانجەكانیان

وەرگرتووە و ئێستا جەنگێکی نەرم لە بواری زانیاریدا هەیە، بۆیە دەوڵەت هەوڵی پاراستنی ئاسایشی تۆڕەکان و زانیاری لە دژی سیخوڕی و هاککردن دەدات، بۆیە چەمکی ئاسایشی زانیاری هاتۆتە ناو ئەدەبیاتی ئاسایش و ئەمەش دەرخەری ئەو ڕاستیەیە کە چیتر دەوڵەت بە تەنیا ناتوانێت ئەم بۆشاییە کۆنترۆڵ بکات (**موسي البدانية**، ٢٠١١: ص٧٠).

هەروەها گرنگی ئاسایشی تۆڕەکان لەوەدایە کە دەوڵەت پێویستە پارە و بازرگانی ئەلیکترۆنی و گەیاندنی خزمەتگوزاری بۆ بەکارهێنەران و زانیارییەکان و هەروەها بڵاوکراوە ئەلیکترۆنییەکان لە دەستێوەردان لەلایەن گروپە ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان بپارێزێت کە ئەمانەش کاریگەرییان لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە و وەکو مەترسی بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی هەژمار دەکرێن (گەنجی، ٢٠٠٧: ل١١).

بەجیهانیبوون بەناردنی هەڕەشەکان لە ئاستی جیهانی بۆ ناوخۆیی، زەمینەی بۆ گۆڕان لە چەمك و بیٚ واتایی هێزی سەربازی دروستکردووە و بەدوای ئەم مەسەلەیە هاوپەیمانی سەربازی دوو لایەنەی کە زۆرتر هۆی ناسەقامگیری ناوچەیی بوون، خستۆتە ژێر پرسیار و ڕێگەی بۆ هاوپەیمانی چەند لایەنە ئاوەڵاکردووە، هەڵبەت نابێت لە بیری بکەین کە ئەم هاوپەیمانیانەش دەتوانن کێشەی ئاسایش بەتایبەت لە ڕەهەندە ناوچەییەکاندا تووشی گۆڕان بکەن. بڵاوبوونەوەی میدیاکانی جیهانی و پەیوەندییەکان دەبنە هۆی ئەوەی کە زۆربەی ڕووداوەکان کە لە ناوچەیەك ڕوودەدەن ڕەهەندی جیهانی بەخۆیان بگرن و لەلایەکی تر ئەم مەسەلەیە دەبێتە هۆی فشار لەلایەن کۆمەڵانی هاووڵاتیانەوە (قەوام، ٢٠٠٩: ل٧٧).

کۆمەڵگەی زانیاری، پەیوەندی هەیە بە هەردوو پرەنسیپی زانین و زانیاری، ئەو جۆرە کۆمەڵگەیەش بەبیٚ سیستەمێکی دیموکراسی کە مافی هاووڵاتیان فەراهەم دەکات، وێنا ناکرێت، ئەمەش پێویستی بە سیستەمێکە کە بڕوای قوڵی

بە دیموکراسی بێت و لە پرەنسیپەکانی تێگەیشتبێت و دامەزراوەی پێویستی بۆ دەستەبەر کردبێت، چونکە ئازادی و گفتوگۆ بەهایەکن ناکرێن لە کۆمەڵگەی زانیاری جیابکرێنەوە (عەبدوڵلا کەلاری، ٢٠٠٩: ل٨٣).

هەروەها هەڕەشەی سایبەری بەو هەڕەشانە دەگوترێت کە لە ڕێگەی مرۆڤەکانەوە کاریگەری لەسەر فەزای مەجازی دادەنێت و ئەم بۆشاییە لە ڕێگەی کۆمپیوتەر، تۆڕەکان، زانیاری، ئامرازە ئەلیکترۆنییەکان و تۆڕەکانی زانیاری دروستبووە، هەروەها کۆمەڵێك ئەکتەر ئەمڕۆکە بەشدارن و کاریگەرییان لەسەر ئەم بۆشاییە هەیە وەکو: تاکەکان، ڕێکخراوەکانی تاوانکاری، گروپە تیرۆریستیەکان، کۆمپانیاکانی تایبەت و فرەڕەگەز و حکومی و دەوڵەتان (خلیلی پوررکن ابادی، ٢٠١٢: ص١٦٩).

دەوڵەت لە پێشتردا کۆنترۆڵی هەموو زانیارییەکانی دەکرد، لە ئەنجامدا دەستی بەسەر بیرکردنەوەی هاووڵاتیاندا دەگرت بۆ ئەوەی وا لە هاووڵاتیان بکات گوێڕایەڵی دەوڵەت بن، بەڵام لەسەردەمی بەجیهانیبوون بەهۆی بەرفراوانبوونی بوارەکانی گەیاندن و پەیوەندی، دەوڵەت بە تەواوی ناتوانێت کۆنترۆڵی جۆر و بڕی ئەو زانیاریانە بکات کە دەگەنە هاووڵاتیان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە دەوڵەت چیتر ناتوانێت ئەرکە کلاسیکییەکانی جێبەجێ بکات و ئەمەش کار دەکاتە سەر ئەرکی دەوڵەت و وایلێهاتووە کە دەسەڵاتدارانی دەوڵەت نەتوانن ئایدیۆلۆژیای خۆیان بسەپێنن بەسەر هاووڵاتیان. هەروەها سنوورە جوگرافیاییەکانیشی کاڵ کردۆتەوە و گۆڕانکاری بنەڕەتی دروستکردووە لە بونیادی سیستەمی نێونەتەوەیی و بنەمای نوێی داهێناوە لەسەر ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتی (عەبدوڵلا کەلاری، ٢٠٠٩: ل٧١).

تۆڕەکانی پەیوەندی و زانیاری و گەیاندن دەنگی گەلانی ژێردەست و چەوساوە دەگەیەنەتە ئاستی نێونەتەوەیی و ڕای گشتی نێونەتەوەیی و ئەمەش وایکردووە کە زۆر لەو پێکهاتانە ببنە خاوەنی دەوڵەتی خۆیان بە پشتبەستن بە بەهاکانی

دیموكراسی لەپێناو بەرقەراربوونی ئاشتی و ئاسایش و سەقامگیری (رەسول شینكی، ٢٠١١: ل٤٤٠).

هەڕەشەكانی سایبری و ئاسایشی سایبری بەهۆی فرەیی ئەكتەرەكان و تێچوویی كەم و خێرایی زۆر و نەناسراوبوونی ئەكتەرەكان وەكو ژیانی ڕاستەقینە و كاریگەری زۆر و مەترسیدار و كەمڕەنگ بوون یان كاڵ بوونەوەی جوگرافیا و پێكهاتەی بۆشایی ئینتەرنێت و .... هتد، ئەمڕۆكە كاریگەری لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتان و تاكەكان هەیە و بۆیە ئەمڕۆكە باس لە (جەنگی سایبری) و (هەڕەشەی سایبری) و (تیرۆریزمی سایبری) و (تاوانەكانی سایبری) و (سیخوڕی سایبری) دەكرێت. دەرفەتەكانی فەزای مەجازی و ئینتەرنێت و تۆڕەكانی كۆمەڵایەتی وایكردووە كە بزووتنەوە كۆمەڵایەتیەكان و نارەزایەتیەكان لەم ڕێگەیەوە خۆیان ڕێكبخەن، بۆ نمونە: شۆڕشەكانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باكووری ئەفریقیا (بەهاری عەرەبی) هەروەها گروپە توندڕەو و تیرۆریستیەكانیش ئەم ئامرازە بەكاردێنن و بۆیە دەكرێت ئاسایشی سایبری بەشێوەیەكی گشتی بە پاراستنی ژێرخانەكانی زانیاری و پرۆسەكان و ناوەڕۆكیان پێناسە بكەین و ئەگەر ئاسایش پەیوەندی بەهێزەوە هەیە و هێزیش ئەمڕۆكە سەرچاوەی گۆڕاوە و ئاڵۆزە، ئەوە ئەمڕۆكە ئاسایشی سایبری لە ڕێگەی سەربازی ناپارێزرێت (خلیلی، پوررکن ابادی، ٢٠١٢: ص١٨٦).

هەرچەندە هیچ دەوڵەتێك ناتوانێت بە ڕەهایی ئاسایشی خۆی دابین بكات، بەڵام ئەوەش پێویستە دەوڵەتان بەردەوام هەوڵی دابینكردنی ئاسایش بدەن، چونكە ئاسایش جگە بۆ دەوڵەتەكە بۆ دەوڵەتەكانی تریش هەر گرنگە، لە دەوڵەتانی دیموكراسیدا هاووڵاتیان بەشدار دەبن لە دیاریكردنی ئەولەویەتەكانی ئاسایش، كە لە هەندێك دەوڵەتی دیموكراسی وای لێهاتووە كە لە ژێر گوشاری هاووڵاتیان تێچووە سەربازییەكان كەم بكەنەوە، بۆیە دەوڵەت بۆ بەهێزكردنی

خۆی لە سیستەمێكی دیموكراسیدا پێویستی بە ڕای هاووڵاتیانە (ڕەوشەندڵ، ٢٠٠٩: ل٢٦).

لەم كۆمەڵگە زانیارییە جیهانییەدا كە خەریكە سەرهەڵدەدات ئیتر ڕەفتاری نەگونجاوی دەوڵەتەكان لەگەڵ هاووڵاتیان و هەڵسوكەوتی دەسەڵاتگەرایانە لەگەڵیاندا بە ئاسانی ناكرێت. گەشەی ئابووری و سیاسی دەوڵەتەكان لەم جیهانەدا بەبێ بەشداریكردن دەوڵەتەكان لە كۆمەڵگەی جیهانیدا زۆر قورسە، هەر لەبەر ئەمە بووە كە ڕژێمی تۆتالیتێری سۆڤیەت كە كاتێك لە پێگەیشتنی كۆمەڵگەی پیشەسازیدا ئامادەییەكی بەهێزی هەبووە، بەسەرهەڵدانی كۆمەڵگەی زانیاری جیهانی و ئابووری زانست تەوەر هەڵوەشایەوە (گیدنێز، ٢٠٠٩: ل١٩٠). لە ڕابردوودا سیستەمە نادیموكراسییەكان دەیانتوانی ڕێگە لە بڵاوكردنەوەی زانیاری بگرن، واتا ئازادی ڕاگەیاندن و ڕادەبڕین سنووردار بكەن، بەڵام ئەمڕۆكە چیتر ئەو سیستەمانە ناتوانن لە ڕێگەی ئەم سەركوتكردنی ئازادیانە بەتایبەت ئازادی ڕاگەیاندن و ڕادەربڕین بەشێوەیەكی كاتی سەقامگیری جێگیر دەستەبەر بكەن، چونكە ئەم سنووردارکردنەی ئازادی لەماوەی كورتیشدا دەبێتە هۆی ناسەقامگیری و نەبوونی ئاسایش، ئازادی ڕاگەیاندن دەبێتە هۆی زیاتر شەفافیەت و دەربڕی سروشتی سیستەمی سیاسییە، بۆیە لەسەردەمی بەجیهانیبووندا سەركوتكردنی ئازادییەكان و پێشێلكردنی مافەكان دەرئەنجامی پێچەوانەی لێی دەكەوێتەوە و ئەمەش ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەت دەخاتە مەترسییەوە (باسام، ٢٠٠٩: ل٢٨٦).

كۆمەڵگەیەك كە خاوەن زانیارییە ئاستێكی بەرزی لە وشیاری هەیە و دەتوانێ ئەم وشیارییە ببێتە بنەمایەك بۆ گەشەكردنی دیموكراسی و هەروەها ببێتە سەرچاوەیەك بۆ ئاسایشی نەتەوەیی، بەم مانایە كە لە سیستەمە دیموكراسییەكاندا دەرفەت و زەمینە بۆ بەدەستهێنانی زانیاری لە ڕێگەی كەناڵە جۆراوجۆرە ئازادەكان فەراهەم دەكرێت. بەڵام لە سیستەمە نادیموكراسییەكان كە

ڕێگە دەگرن لە هاوولاتیان لە بە دەستهێنانی زانیاری. هەولیش دەدەن هەڕەشە و مەترسی یان دوژمنێکی وەهمی بۆ درێژەدان بە مانەوەی خۆیان دروست بکەن. بۆیە بوونی ئازادی بەدەستهێنانی زانیاری و وشیاری لەلایەن هاوولاتیان وادەکات کۆمەلگا هەست بە مەترسی و هەڕەشەی ڕاستەقینە بکات، کەواتە لە سیستەمێکی دیموکراسییدا ئازادی میدیا و زانیاری دەبێتە بنەمایەك بۆ سیستەمێکی دیموکراسی و سەرچاوەیەکیش بۆ ئاسایشی نەتەوەیی.

**٥.٢.٣. دەستێوەردانی مرۆیی:**

دەتوانین بلێین کە لە سەردەمی ئێستا چەمکی مافی مرۆڤ هاو واتای دیموکراسییە و نەبوونی دیموکراسی بە مانای نەبوونی میکانیزمێکە بۆ پاراستنی ڕاستەقینەی ئازادی و مافەکانی مرۆڤ. کەواتا دیموکراسییەت بەبێ دەستەبەرکردن و ڕێزگرتنی تەواو لە کەرامەتی مرۆڤ و پاراستنی ئەو کەرامەتە بوونی نییە، بۆیە سیستەمە نادیموکراتیکەکان هەلدەستن بە بێ ڕێزی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، بۆیە دەتوانین بلێین دیموکراسی سیستەمێکە زیاتر توانانی هەیە گەرەنتی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و ئاسایشی مرۆڤی بکات.

پرسی مافەکانی مرۆڤ پێشکەوتنی گەورەی بەخۆیەوە بینی، چونکە مافەکانی مرۆڤ بوو بە بنەمایەکی یاسای نێونەتەوەیی، بەپێی بەلگەنامەی کۆنگرەی هلسینکی بۆ ئاسایش و هاوکاری ئەورووپی لە (١-٨-١٩٧٥) و ڕووداوەکانی نێونەتەوەیی و ڕووخانی بلۆکی ڕۆژهەلات و کۆتایی جەنگی سارد و سەرکردایەتی کردنی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ سیستەمی نوێی جیهانی، پرسی مافەکانی مرۆڤ چووە قۆناغێکی ترەوە، لە میانەی کۆنگرەی پاریس لە تشرینی دووەمی سالی (١٩٩٠)، میکانیزمی نوێ بۆ چاودێری و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ دیاریکرا (أحمد يحيى، ٢٠٠٩: ص١٠١).

مرۆڤ بنەڕەتیترین بایەخی سیستەمێكی سیاسی دیموكراسییە، چونكە لە سیستەمێكی دیموكراسیدا، دەبێت مرۆڤ ئازاد بێت، بتوانێت بڕیاری سەربەخۆ بدات بە مەبەستی گەشەكردن و دەستەبەركردنی كەسایەتی و بەرژەوەندییەكانی، هەروەها ناكرێت بێ ڕێزی و سوكایەتی بە مرۆڤ بكرێت و یان دەستدرێژی بكرێتە سەر ماف و ئازادییەكان بۆیە لە سیستەمی دیموكراسی دا مرۆڤ ئامانجە (مەعروفی، ٢٠١١: ل٩). بەبێ دیاریكردنی مافە بنەڕەتییەكانی هاوولاتی لە هەر كۆمەڵگەیەكدا دیموكراسییەت مانای نییە و ئەوەی مافە بنەڕەتیەكانی هاوولاتیان دیاری دەكات، لەسەر بنەمای ئەوەنییە كە سەر بە چ گروپ و نەتەوە و ڕێكخراو یان پارتێكن بەڵكو مافی هاوولاتیبوون زیاتر مەدەنی ـ سیاسی و بنەمایەكی ئەخلاقی و یاسایی هەیە و تەنیا ئەم مافە لە دەنگداندا كورت ناكرێتەوە، بەڵكو كۆمەڵێك بنەمای یاسایی تایبەت هەیە كە زیاتر خۆشگوزەرانی و ئازادی و بەشداریكردن و كاریگەری تاك لە كۆمەڵگە مسۆگەر دەكات (عەلی، ٢٠٠١: ص٢٠).

مافەكانی مرۆڤ پێ لەسەر ئەوە دادەگرن كە هەموو مرۆڤەكان بایەخی وەك یەكیان هەیە، هەر بۆیە وەك پێوانەیەكی جیهانی لە خەبات بە دژی جیاوازی دانان و لێك هەڵاوێردندا بەكاردێن، ژنان، منداڵان، كەمایەتیەكان و ئاوارەكان، لەو دەستە و تاقمانەن كە مافەكانی مرۆڤ سەرنجێكی تایبەتییان پێ دەدەن، جیاوازی نێوان هەژاران و دەوڵەمەندان، پرسەكانی پێوەندیدار بە ژینگە، پرسی چۆنییەتی ڕێگەگرتن لە سەرهەڵدان و پەرەگرتنی كێشە چەكدارییەكان، تەنیا بەشێك لەو پرسانەی سەردەمی ئێمەن كە دەكەونە چوارچێوەی ئەو بابەتانەی كە مافەكانی مرۆڤ پێیان لەسەردادەگرت. (بەرگەم، ٢٠١١: ل١٠). بەگشتی مافەكانی مرۆڤ لەسەر بنەمای پرەنسیپی مافی وەك یەك بۆ هەموو مرۆڤەكان و بەبێ جیاوازیكردن لە نێوانیان دارێژراوە كە بریتین لە:

١- مافە مەدەنییەکان: ئەو مافانەن کە مافی ژیان، ئازادی، ئایین، مەزهەب، ئاسایشی دادوەری و یاسایی، ئازادی ژیانی تایبەت و خێزانداری، ئازادی ڕادەربڕین و ڕێکخستنی کۆبوونەوە، ئازادی پێکهێنانی سەندیکا و کۆڕ و کۆمەڵ و پارت، ئازادی هاتوچۆ دەیانپارێزن.

٢- مافە سیاسییەکان: مافی مرۆڤ بۆ بەشداریکردن لە بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت وەکو مافی دەنگدان، خۆکاندیدکردن بۆ پۆستە گشتییەکان.

٣- مافە ئابوورییەکان: واتا مافەکانی مرۆڤ لەبارەی ئابوورییەوە دەپارێزرێن وەك مافی خاوەندارییەتی، مافی کارکردن و مافی دروستکردنی سەندیکا و یەکێتییە ئابوورییەکان و مافی مانگرتن و مافی هەبوونی ئاستێکی ستاندەری ژیان کە شایانی مرۆڤ بێت.

٤- مافە کۆمەڵایەتییەکان: ئەو مافانەن کە مافی تاکە کەسی وەکو ئەندامانی کۆمەڵگە لەکاتی بێکاری و نەخۆشی و پەککەوتەیی و .... هتد، دەپارێزێت.

٥- مافە کلتوورییەکان: ئەو مافانەن کە مافی هاوولاتیان بۆ خوێندن و فێربوون و بەشداریکردن لە ژیانی کلتووری و هەروەها کەڵك وەرگرتن لە زانست و زانیاری و چاپ و بلاوکردنەوە دەپارێزن (بەرگەم، ٢٠١١: ل٢٢).

دەتوانین بڵێین لە ڕاستیدا ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادیەکانی دیموکراسی و بەهێزکردن و پەرەپێدانی مرۆڤ جیاناکرێتەوە لە پاراستنی ئاسایشی مرۆڤ و لە ڕاستیدا ئەمانە بەرزکردنەوەی ئاستی پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و پەرەپێدانی مرۆڤ و ئاسایش پێکەوە گرێدراو و پەیوەندارن و تەواوکەری یەکترن کە بوونەتە بنەما بۆ سیستەمی نوێی جیهانی و ناکرێت ئەمانە بێنەدی لە کۆمەڵگەیەك کە دیموکراسی تێدا نییە، چونکە دیموکراسی بە مانای ڕزگاربوونە لە هەڕەشە و مەترسی و دڵەڕاوکێیەکان (أحمد یحیی، ٢٠٠٩: ص١١٢).

رێزگرتن لە مافی مرۆڤ دەبێ بەشێوازی تاك و كۆمەڵ، بە پشت بەستن بە یاسای هەڵبژاردنی ئازاد و بەشداری سیاسی بێت كە رەهەندێكی جیهانیان بەخۆیانەوە گرتووە، بۆ رژێمە دەسەڵاتگەراكان دژوارە وەك رابردوو بەهەر جۆرێك كە حەزیان لێ بێت هەوڵی كۆنترۆڵكردنی یەك لایەنە و زاڵبوونی سیاسی بدەن بەسەر ناسنامە كۆمەڵایەتییەكانی هاووڵاتیاندا و فەرمانرەواییان بەسەردا بكەن، ئەمڕۆ دەوڵەتەكان ناتوانن بەپشت بەستن بە مافی سەروەری خۆیان لە پابەندبوون بە رێزگرتنی مافی مرۆڤ و مافی كەمینەكان بدزنەوە (ملا عمر عیسی، ٢٠٠٨: ل ٨١). ئەزموونەكانی دەوڵەتان و ئامارەكان ئەوەیان دەرخستووە كە ئەو دەوڵەتانەی كە لەسەر بنەمای مافەكانی تاك و كۆمەڵگە، ئازادی لە بەرامبەر یاسا، ئازادی رادەربڕین و بەگشتی ئازادییە مەدەنی و سیاسییەكان و سیستەمی نوێنەرایەتی بەرێوەدەچن، هیچ ئاماژەیەك لە جەنگ، ململانێ و شۆڕش نابینرێت، بەهۆی ئەوەی كە ئاشتی لەسەر بنەمای رەوایەتی ناوخۆیی دانراوە (رسولی **ثاني آبادي، ٢٠١٣: ص٧**). داتاكان ئەوە دەردەخەن كە لەو دەوڵەتانەی كە بنەماكانی دیموكراسی و یان سیستەمێكی دیموكراسی بوونی هەیە، سەقامگیری سیاسی و كۆمەڵایەتی و بەگشتی ئاسایشی نەتەوەیی پارێزراوە و دەوڵەتانی نادیموكراتیكی باكووری ئەفریقیا و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست نزمترین ئاستیان هەیە (Democracy Index: 2012).

پاش ڕووخانی بلۆكی كۆمۆنیستی، سیستەمی دیموكراتیك بۆتە پارادایمی زاڵ، هەروەها مافی مرۆڤ بۆتە پرسێكی جیهانی، بەم مانایە كە بەهۆی لاوازبوونی سنوورەكانی سیاسی، بازرگانی و كلتووری دەوڵەت ـ نەتەوە، سەروەری و پاڵپشتی كۆمەڵگەی نێونەتەوەیی و زاڵبوونی بنەماكانی مافی مرۆڤ وەكو مافی ژیان، مافی ئازادی رادەربڕین و بیروبڕوا و قەدەغەبوونی ئەشكەنجە و كۆیلایەتی و بەرپرسیاریەتی دەوڵەتان لەهەمبەر مافەكانی مرۆڤ، بۆ نموونە: بڕیارەكانی (٦٨٨ و ٧٠٦ لەبارەی عیراق و ٧٣٣ و ٧٤٦ و ٧٩٤ لەبارەی سۆماڵ و ٧٥٢، ٧٥٨،

٧٦٤، ٧٧٠، ٧٧١، ٧٨١، ٧٩٨ لەبارەی یوگسلافیای پێشوو)، لەلایەن ئەنجومەنی ئاسایش بۆ ڕێگەگرتن لە پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و جینۆساید و بۆ دروستکردنی حکومەتی یاسا و هەڵبژاردنی ئازاد و پاراستنی ئاسایشی هاووڵاتیان دەربڕی ئەو گرنگیەی مافی مرۆڤن (عسکری، ٢٠٠٢: ص١٩١).

دەستێوەردانی مرۆیی یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانی یاسای نێونەتەوەیی کە بۆتە هۆی پێشکەوتن لە بواری مافەکانی مرۆڤ، ئەوەش وا دەکات کە دەوڵەتێك یان چەند دەوڵەتێك گوشار بخەنە سەر ئەو دەوڵەتەی هەڵدەستێت بە کردەوەی دژی مافەکانی مرۆڤ، ئەویش لە ڕێگەی گوشاری ئابووری، سیاسی، سەربازییەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین کە دەستێوەردانی مرۆیی ڕێگەدەگرێت لە پێشێلکارییەکانی دژ بە مافەکانی مرۆڤ، لەو کاتەی کە ویژدانی مرۆڤایەتی لەسەر ئاستی جیهان دەجولێت، لە پێناو وەستاندنی ئەم کردەوانە (أحمد يحيى، ٢٠٠٩: ص١٠٠).

ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بەگوێرەی مادەی (٣٩)ـی پەیمانی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیار وەردەگرێت، مادە (٣٩) دەڵێت: ((ئەنجومەنی ئاسایش خۆی بڕیار دەدات کە داخوا هەڕەشە لە ئاشتی کراوە، یان لادان لە ئاشتی بووە، یان کارێکی دەستدرێژکاری ڕوویداوە، لەم بارەوە ئەنجومەن ڕاسپاردەگەلێك دەخاتەڕوو یان بڕیاردەدات کە چ ڕێوشوێنێك بەپێی بنەماکانی هەردوو مادەی (٤١ و ٤٢) بۆ پاراستنی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی یان بۆ هێنانەوەی ئەم دوانە بۆ سەر باری جاران بگرێتەبەر)). کەواتا بەم پێیە ئەنجومەنی ئاسایش ڕۆڵێکی گەورە و دەسەڵاتێکی فراوانی سەبارەت بەئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی هەیە (غازی هورمزی و ئەحمەد ئەلسەیید، ٢٠٠٥: ل١٤). ئەنجومەن ئەو دەسەڵاتە بەخۆی دەدات کە دەستێوەردان بکات لە بواری کێشە مرۆییەکان و پەنابەران کە دەبێتە هۆی ناسەقامگیری کۆمەڵگەکان و دەبنە هەڕەشە لەسەر ئاشتی و ئاسایشی نەتەوەیی و ئەم هەڕەشە و مەترسیانە وادەکات

ئەنجوومەنی ئاسایش دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتان بکات (کامل محمد، ٢٠٠٨: ص٥٠).

بەیانی کۆتایی ئەنجومەنی ئاسایش لەساڵی (١٩٩٢)، بابەتی مافی مرۆڤی کردە بەشێك لە ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی، کە ڕێگەدەدات ئەنجومەنی ئاسایش مومارەسەی دەسەڵاتەکانی بکات بەپێی فەسڵی (٧) لە ڕێککەوتنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەو مانایەی کە هەر سوکایەتی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ دەچێتە خانەی خستنە مەترسی ئاشتی و ئاسایش. هەروەها ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەم بەرپرسیاریەتیە دەکەوێتە ئەستۆی تاك، واتە مافەکانی مرۆڤ و پاراستنی دەبێتە بەرپرسیاریەتی تاکەکەس و نێونەتەوەیی، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ سیستەمی نوێی جیهانی و ڕەهەندەکانی کە مافەکانی مرۆڤ ببێتە بنەمایەك بۆ جێبەجێکردنی دروشم و ئامانجەکانی (کامل محمد، ٢٠٠٨: ص٤٠). دەکرێت پرسی دەستێوەردان بەهۆی مافەکانی مرۆڤ ببێتە هۆی بەرەنگاربوونەوەی ستەم و قەڵاچۆکردن و تەنانەت جینۆساید، بۆ نمونە بڕیاری (٦٨٨)ـی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لەسەر عیراق (الصدیق، ٢٠٠٨: ص٩٩).

دیارترین دەرهاویشتە و کاریگەرییەکانی دەستێوەردانی مرۆیی دەستبردنە بۆ سەروەری دەوڵەتان و ئەو بنەمایە بۆتە بنەمایەك لە پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان کە لە ڕێککەوتنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ماددەی (٢) بڕگەی (٧)ـدا هاتووە، کە ڕێگەی داوە بە دەوڵەتان کە لە ڕێگەی سەروەریانەوە مافی یاسایی خۆیان لە بەڕێوەبردنی کاروباری ناوخۆیی بە سەربەخۆیی و ئازادی هەبێت و ڕێگەی گرتووە لە دەستێوەردانی دەوڵەتانی زلهێز لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتانی لاواز، بەڵام لە پاش جەنگی سارد و گۆڕانکارییەکانی سەردەمی بەجیهانیبوون وایکرد کە دووبارە خوێندنەوە و تێگەیشتن بۆ مادەکانی ڕێککەوتنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکرێت، کە ڕێگە بە دەستێوەردان بدرێت لە کاتێکدا کە

دەستدرێژی و پێشێلکردنی ئاشکرای مافەکانی مرۆڤ ڕوو دەدات (الصديق، ٢٠٠٨: ص٩٧).

بەپێی بڕگەی (٧) لە ماددەی (٢)ـی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆیی دەوڵەتان قەدەغەکراوە، بەڵام لە ڕێگەی ئەنجومەنی ئاسایش بۆ سزادانی دەوڵەتان لەکاتی تێکدانی ئاشتی نێونەتەوەیی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ ڕێگەپێدراوە، بەهۆی ئەوەی کە دەوڵەتان لە ماددەکانی (٥٥) و (٥٦)ـی ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکاندا بەڵێنیان داوە کە هەنگاوی کردەیی دەنێن بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە هەمبەر بنەماکانی مافی مرۆڤ و لەم ڕوانگەیەشەوە دەستێوەردانی سەربازی بە مەبەستی پاراستنی گیان و مافەکانی تاکەکان، لەگەڵ ئامانجەکانی ئەم ڕێکخراوە و لەگەڵ بەڵێنی ئەم دەوڵەتانە هەماهەنگە و پابەندبوونیان بە یەکپارچەیی دەوڵەت و سەروەری دەوڵەتان گرنگترە و لەم ڕویەشەوە دەتوانین بڵێین بە گشتی دیموکراسی بۆتە بەهایەکی جیهانی، بەم مانایە کە لە نێوان ئاشتی و دیموکراسی و ئاسایشی نێونەتەوەییدا پەیوەندی دروست بووە (احتشامی، ٢٠٠٩: ص٣٢).

لە ڕوانگەی کلاسیکییەوە، دەستێوەردان لە کاروباری ناوخۆ تەنیا کاتێك دەکرێت کە ئەو دەوڵەتە لەسەر بابەتێك ئاسایشی نێونەتەوەیی خستبێتە مەترسیەوە و ئەو کاتە دەکرێت سەروەری دەوڵەتێك پێشێل بکرێت بەڕێگەی ئامرازی زۆرلێکەر و هێزەوە، یان دەوڵەتەکە خۆی داوا دەکات بەهۆی یاخیبوون لە دەوڵەتەکە و نەبوونی توانای دەوڵەت بۆ کۆنترۆڵی دەوڵەت بەڵام ئەمڕۆ لەژێر پاساوی پاراستنی مافی مرۆڤ دەکرێت بۆ پارێزگاری لە دانیشتوانی دەوڵەتێکی دیاریکراو، بۆ نموونە: لە ڕێککەوتننامەی نەتەوە یەکگرتووەکان ئەم دەسەڵاتە دەداتە ئەنجومەنی ئاسایش بۆ دەست نیشانکردنی هەڕەشە یان دەستدرێژی بۆ سەر ئاشتی کارێکی دوژمنکارانە، ئەگەر هەڕەشەکان لەلایەن ئەنجوومەنی

ئاسایش دیاریكرا، ئەوە پاشان ئەنجومەن دەتوانێت دەستپێشخەری بكات بۆ جولاندنی هێزی پێویست بۆ پاراستنی ئاسایش (جاكسۆن، ٢٠٠٣: ل٤٥٩).

**٤.٢.٥. تیرۆر:**

تیرۆر لە سەردەمی ئێستادا بەهۆی شۆڕشەكانی زانیاری و پێشكەوتنەكانی تەكنەلۆژیا و گەیاندن بۆتە دیاردەیەكی جیهانی و بەشێوازێكی ڕێكخراو مەترسی و هەڕەشەی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی دروست كردووە، بۆیە ئەمڕۆ دەوڵەتان گرنگییەكی زۆر بە خۆپاراستن لە تیرۆر دەدەن و سەرچاوەیەكی ماددی و نامادی زۆری بۆ تەرخان دەكەن. بۆیە دەوڵەتانی دیموكراسی لە داڕشتنی ستراتیژیەتی ئاسایشی نەتەوەیی خۆیان بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر دەكەن بە یەكێك لە ئەولەویەتە سەرەكییەكانیان.

بۆیە ئەو توندوتیژییانەی كە تیرۆر بەرهەمی هێناوە لە چەند دەیەی ڕابردوو، بووە هۆی گۆڕانكاری لە چەمكی ئاسایشی نەتەوەیی دەوڵەتان (**ذكي ابراهيم**، ٢٠١٢: ص٢). تیرۆر بریتییە لە بڵاوكردنەوە و بەكارهێنانی ترس و تۆقاندن بە ئامانجی بەدیهێنانی گۆڕانكاری سیاسی، هەموو كارێكی تیرۆریستی توندوتیژی یان هەڕەشەی بەكارهێنانی توندوتیژی لەخۆ دەگرێت، ئەم كردارە توندوتیژانەش لەلایەن ئەو كەسانەوە ئەنجام دەدرێت كە ناحكومین واتا بەشێك نین لە چەكدارەكانی دەوڵەت یان دەزگاكانی سەپاندنی یاسا، یان دامەزراوەكانی تری حكومی (هۆفمان، ٢٠٠٦: ل٥).

تیرۆر ئەمڕۆ دیاردەیەكی نێونەتەوەییە و مەترسی و هەڕەشەیە بۆ سەر گیانی هاوڵاتی سڤیل و یەكێكە لەو مەترسیە ترسناكانەی كە ئاراستەی سیستەمی نێونەتەوەیی دەكرێت، هەروەها شەڕێكی وێرانكەری ناڕاگەیەندراوە لە نێوان مرۆڤەكان هەروەها لە نێوان تاك و دەوڵەتیش، كە مەترسی لەسەر ئاشتی جیهانی دادەنێت، كە زیان بە گیان و دارایی و ئازادییەكانی هاووڵاتیان دەگەیەنێت، لە

ڕاستیدا تیرۆری نێونەتەوەیی دەستدرێژی ڕاستەوخۆیە لەسەر مافەکانی مرۆڤ وەکو: مافی ژیان، مافی ئاشتی و ئازادی ڕادەربڕین بەشێوەی بڵاوکردنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ، تیرۆر هەڕەشەیەکە لەسەر هەموو جیهان، کەواتا دیاردەیەکی سنوور بەزێنە (أحمد يحيى، ٢٠٠٩: ص١٠٩).

ئەگەر پەرەپێدانی مرۆیی فەراهەم نەبێت لە هیچ دەوڵەتێك ئاسایش و ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر دەستەبەر نابێت چ لە ئاستی ناوخۆ و چ لە ئاستی دەرەوە، بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە کە ڕووبەڕووی هەژاری و برسیەتی ببێتەوە و میکانیزمی گونجاو بۆ پەرەپێدانی مرۆیی لە ڕووی ماددی و مەعنەوی دەستەبەر بکرێت و ئەمەش بە سیستەمێك دەکرێت کە دیموکراسی بێت و توانای سیستەم بەرز بکرێتەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە و گرفتە ناوخۆییانە و باشترکردنی ژیانی تاکەکان (توندرات، ٢٠١٢: ص٢). تێکەڵبوونێك هەیە لە نێوان تیرۆر و توندوتیژی سیاسی بەهۆی نزیکی توندوتۆڵ کە لە نێوانیاندا هەیە، کە هەردووکیان ئامانجی سیاسیان هەیە و بەشێوەیەکی ڕێکخراو بۆ دەستەبەرکردنی ئەو ئامانجە لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێز یان هەڕەشەکردن، بەڵام لە نێوانیاندا جیاوازی ڕوون و ئاشکرا هەیە، بۆ نمونە چالاکیە تیرۆریستیەکان کردەوەکانیان بە ئاشکرا دەکەن، بەڵام توندوتیژی سیاسی بریتییە لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئامانجێك بەبێ گوێدان بە ڕای گشتی یان سەرنجی هاووڵاتیان و هەروەها ئامانجەکانی توندوتیژی سیاسی تەسك و سنووردارن، بەڵام تیرۆر دوژمنایەتیەکی ڕاستەوخۆیە وەکو پەیامێکی ئاشکرا و ڕوون بۆ لایەنی بەرامبەر، بۆیە جیاوازی جەوهەری لە نێوان توندوتیژی سیاسی و تیرۆردا هەیە، بەپێی ئامراز و میکانیزمەکانیان، هەرچەندە تیرۆر بەرهەمی توندوتیژیە و تیرۆرکردنی کەسایەتی سیاسی دیار و گرنگ جۆرێکە لە توندوتیژی کە بە ئامانجی سیاسی دەکرێت، هەروەها دروستکردنی ترس و دڵەڕاوکێ و تێکدانی سەقامگیری سیاسی و کۆمەڵایەتی جۆرێکە لە تیرۆر (السلمو، ٢٠٠٨: ص١).

دیاردەی تیرۆر دەبێتە هۆی بەرهەمهێنانی توندوتیژی و دەمارگیری، چونکە توندوتیژی و تیرۆر کلتوورێکی ڕەشە کە لە پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی کە خاوەن بەهای توندوتیژە، چ ماددی چ مەعنەوەی سەرچاوە دەگرێت. لەبەر ئەوە پەروەردەکردنی تاك و هاوولاتیان لەسەر بنەمای بەها شارستانییەکان و سەردەمیانە وەك دیموکراسی و بەهاکانی، پێویستیەکی گرنگە بۆ چارەسەرکردنی هزری مرۆڤ، چونکە دیموکراسییەت گرنگی زۆری هەیە بۆ بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر و توندوتیژی، لە سەردەمی ئێستادا زۆر بابەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی جۆراوجۆر هەن کە بە هێز و تۆقاندن خۆیان بەسەر کۆمەڵگەدا دەسەپێنن، یەکێك لەو دیاردانە کە مەترسی زۆری لەسەر کۆمەڵگە هەیە و کاریگەری نەرێنی لەسەر کۆمەڵگە هەیە و لە شوێنە جیاجیاکانی کۆمەڵگە وەکو نەخۆشیەك بلاوبۆتەوە و بکەرەکانی ئەم دیاردەیە ڕوانینیان بۆ ژیان و ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ پرسەکان ڕەشبینانە و کوێرانەیە، لێرەوە دەتوانین بڵێین بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە (دیاردەی تیرۆر) باشترین میکانیزم سیستەمێکی دیموکراسییە کە وادەکات هاوولاتیان بەشێوەیەکی ئازاد بەشداربن لە بونیاتنانی بەهاکانی شارستانی و مرۆڤایەتی، چونکە دەتوانێت چارەسەری دیاردەی تیرۆر بکات بەشێوەیەك کە پرۆژە و بەرنامەی سیاسی دەبێتە بنەمایەك بۆ پاراستنی ئاسایشی هەموان وەکو پێویستیەکی سەرەکی ژیان (**الصغير، ٢٠١٣: ص١**).

لەدوای جەنگی سارد دەوڵەتانی شکستخواردوو بوونەتە کێشەیەکی گەورە بۆ ئاسایشی سیستەمی نێونەتەوەیی و دەوڵەتانی ناوچەیی، چونکە دەوڵەتانی شکستخواردوو پێشێلکاری مەترسیداریان لە بواری مافی مرۆڤ ئەنجامداوە و هەندێکجار بوونەتە هەڕەشە بۆ سەر دراوسێکانیان و یان هێرشکردنە سەر دەوڵەتانی تر، دیاردەی کۆچی نایاسایی و پەنابەران هۆکاری ئەو کارەساتە مرۆییانەن کە لەو جۆرە دەوڵەتانە ڕوودەدەن و لەلایەکی تر لە ڕووداوەکانی یازدەی سێپتەمبەر ڕوون بۆتەوە کە ئەو دەوڵەتانەی کە داڵدەی تیرۆریستەکانیان

داوە، ئەو جۆرە دەوڵەتە شکستخواردووانە بوونە کە سیستەمێکی نادیموکراسییان هەیە و لە هەموو بوارەکاندا وەکو ئابووری، مافی مرۆڤ، یەکگرتوویی، ئاسایش و سەقامگیری و پەروەردە و تەندروستی و ... هتد، تووشی شکست هاتوون (فۆکۆیاما، ٢٠٠٩: ل٢٠٠).

تیرۆر چەندین هۆکاری جۆراوجۆری وەکو هۆکارەکانی ئابووری، سیاسی، مێژوویی، کۆمەڵایەتی، کلتووری یان ئایینی و ... هتد، هەیە و هەندێکجار ئەو هۆکارانە بەیەکەوە کاریگەرییان هەیە لەسەر سەرهەڵدانی تیرۆر و بەردەوامی ئەم دیاردەیە و هەندێك جار بەهۆی نادادپەروەری و سەرکوتکردنی سیاسی یان بارودۆخی خراپی ئابووری هەروەها جیاکاری ڕەگەزی و چەوسانەوەی ئایینی یان نایەکسانی لە دابەشکردنی دەسەڵات و سەروەت و سامان دەبنە هۆکاری سەرهەڵدانی تیرۆر، بۆیە دەتوانین بڵێین سیستەمێکی سیاسی کە هەوڵی چارەسەرکردنی دەدات دەتوانێت ببێتە ڕێگر لەبەردەم سەرهەڵدانی دیاردەی تیرۆر. بۆ ڕێگەگرتن لە تیرۆر دەبێت چارەسەری هەندێك دیاردە بکرێت لە ناوخۆ بەشێوەیەکی یاسایی، وەکو: چارەسەرکردنی سیاسەتی پەراوێزخستن یان هەژاری و گەندەڵی یان چەوساندنەوە و سەرکوتکردنی ئایینی و نەتەوەیی و زمانی یان نادادپەروەری کۆمەڵایەتی و ... هتد، چونکە تیرۆریستان سوود لەو بارودۆخە وەردەگرن کە ئەو دیاردانەی تێدابێت، لە جێگەی ئەوە دەبێت سیستەمێکی دیموکراسی لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری و گرنگی بە ئاسایش و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان بدات بەبێ جیاوازی (هۆفمان، ٢٠٠٦: ل٦٤). بەگشتی دەتوانین بڵێین کە دیموکراسی دەتوانێت ڕۆڵی کاریگەری هەبێت لە چارەسەرکردنی تیرۆر بەم شێوەیە:

١- بۆ چارەسەرکردن و یان ڕووبەڕووبوونەوەی توندوتیژی و تیرۆر نابێت دەوڵەت هەمان ئامرازی توندوتیژی بەکاربێنێت، چونکە توندوتیژی، توندوتیژی زیاتر بەدوای خۆیدا دێنێت و هەر کاتێك دەوڵەت خەسڵەتی تۆڵەسەندنەوەی

تێدابوو وەكو چەتەى لىێ دێت، كەمكردنەوە و چارەسەرى توندوتيژى و تيرۆر بەشێوازێكى نەرم گەرەنتى ئاسايش و سەقامگيرى دەكات.

٢- دەوڵەت نابێت بێتە ناو ململانێيە كۆمەڵايەتيە يان چينايەتيەكان، بەڵكو ئەركى دەوڵەت ئەوەيە وەكو ميكانيزمێك لە چوارچێوە و بەپێى ياسا چارەسەرى ئەو ململانێيانە بكات بەبێ لايەنى نەك لە بەرژەوەندى لايەنێكدا كار بكات و لايەنەكەى تر پەراوێز بكرێت.

٣- هەندێك جار، هەندێك ئاراستەى فيكرى يان بەرژەوەندى توند لە كۆمەڵگەدا دروست دەبێت، كە دەبنە جێگەى مەترسى و دەبنە هۆكارێك بۆ نائارامى و ناسەقامگيرى كۆمەڵگە، پێويستە دەوڵەت بەهۆى ئەو ڕەوايەتييەى كە هەيەتى ئەم ئاراستە يان گروپانە بێنێتە ناو سيستەم و بەرژەوەندييەكانيان دابين بكات و لە چوارچێوەى ياسا و ڕێساكانى دەوڵەتدا پێناسەيان بكات و پەراوێز نەخرێن بەڵام بەپێى بەرژەوەندى گشتى.

٤- دەوڵەت دەبێت دان بە فرەيى، كۆمەڵايەتى، كلتوورى، ئابوورى، ئايينى، نەتەوەيى و ... هتد، بنێت و بۆ چارەسەركردنى كێشەكانيان سياسەتێكى درێژخايەن دابڕێژێت و ناسنامەيان بپارێزرێت و لە ڕێگەى چارەسەركردنى كێشە و ململانێيەكانيان، دژايەتى و توندڕەوييان كەمبكاتەوە و لە چوارچێوەى ياسادا كاروبارييان ڕێكبخات، چونكە كاردانەوەى توندوتيژى لە هەمبەر ئەم جياوازييانە، كاريگەرى نەرێنى لەسەر ئاشتى و سەقامگيرى و ئاسايشى كۆمەڵايەتى دەبێت (غليون، ٢٠٠١: ص١٤٦-١٤٧).

بۆيە باشترين ڕێگە بۆ بەرەنگاربوونەوە و لەناوبردنى تيرۆر، بڵاوكردنەوە و پەرەپێدانى ديموكراسييە، لەسەر ئاستى تاك و لەسەر ئاستى كۆمەڵگە، پەيڕەوكردنى سيستەمێكى ديموكراسى دەبێتە هۆى ژيانى ئاسوودە و پڕ لە ئاسايش بۆ هاووڵاتيان. ديموكراسى كە بەهاكانى لێبووردەيى و پێكەوەژيانى ئاشتيانە و كۆكردنەوەى بەرژەوەندييەكان لەخۆ دەگرێت، بەپێچەوانەى بەهاكانى

تیرۆر کە لەسەر تۆقاندن و توندوتیژیە ڕادەوەستێت، بۆیە پەروەردەی دیموکراسی لەچوارچێوەی سیستەمێکی کراوە باشترین میکانیزمە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی تیرۆر (**الصغير، ٢٠١٣: ص١**). هەروەها بەرگری کردن و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ و دیموکراسی دەبێتە بەردی بناغە بۆ جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر، بۆیە لە ئێستادا بەهێزکردنی دیموکراسی بۆتە بەرنامەی دامەزراوەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بۆ ئەم مەبەستەش لە ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا هاتووە کە یارمەتی ئەو دەوڵەتانە بدەن کە ئاراستەیان بەرەو دیموکراسییە (بارانی، ٢٠١٢: ص٣٦٥).

دەتوانین بڵێین کەمکردنەوەی گرژییەکان و کۆنترۆڵکردنی توندوتیژی و تیرۆر، پێویستی بە چارەسەری دیموکراسیانە هەیە، چونکە هەندێکجار لە نەبوونی دیموکراسییە کە ئەو توندوتیژیانە سەرهەڵدەدەن لە ئەنجامی ململانێ لەسەر بیروبۆچوون و بەرژەوەندی و جیاکاری و دەمارگیری و دابەشکردنی نادادپەروەرانەی داهاتەکان و .... هتد. دیموکراسی دەتوانێت ئەم کێشە و ململانێیانە بەشێوازێکی ئاشتیانە چارەسەر بکات و لە نەبوونی دیموکراسیدایە کە تیرۆر لە کۆمەڵگە دەبێتە ئامرازی هێز و گروپە تیرۆریستییەکان، لەلایەکی ترەوە تیرۆر لەگەڵ ژیانێکی مەدەنی و سیاسی دیموکراسیانە ناتوانێت پەرەبسێنێت و گروپە تیرۆریستیەکانیش سوود لە تاك و گروپە پەراوێزخراوەکان وەردەگرن (غليون، ٢٠٠١: ص١٤٥).

**٥.٢.٥. ڕێکخراوەکان:**

لە سەردەمی بەجیهانیبووندا ڕێکخراوە ناحکومییەکان و کۆمپانیافرەڕەگەزەکان لە بواری جۆراوجۆر کاردەکەن وەك یونسکۆ (UNESCO) و یونیسێڤ (UNICEF) کە یارمەتی دەوڵەتان دەدەن، تاوەکو بتوانن بە دروستکردنی کۆمەڵگەی مەدەنی لە دەوڵەتاندا، کۆمەڵگەکان بەرەو پێشەوە بڕۆن و شارستانیان بکەن لە بڕی ئەوەی کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان پەنا بۆ هێزی

سەربازی و توندوتیژی بەرن. بەكارهێنانی هێزی ڕەق دەوڵەتانی تووشی قەیران كردووە. بۆیە هێزی نەرم بەدەستهێنانی زۆر ئاسانترە، بۆیە پێویستە دەوڵەتان ئاسایشی نەتەوەییان پێناسە بكەنەوە و خۆیان لەگەل ئەو گۆڕانكارییانە بگونجێنن و پەنانەبەنە بەر هێزی سەربازی بەڵكو پێویستە ئەو سەرچاوە داراییانە بۆ مەبەستی تری ئاشتیانە بەتایبەت پەرەپێدانی ئابووری دەوڵەت تەرخان بكەن كە ببێتە مایەی سەقامگیری و خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان و هەر دەوڵەتێك بیەوێت چارەسەری كێشەكان بەهێزی سەربازی بكات، ئەوە ڕووبەڕووی كاردانەوە و بەرپرچ و سزای ڕێكخراوە نێونەتەوەییەكان دەبێتەوە (قەوام، ٢٠٠٩: ل٨٨).

لەلایەكی ترەوە ڕێكخراوە ناحكومیەكان ئەركیان كۆكردنەوەی زانیارییە و ئامادەكردنی ڕاپۆرتی جۆراوجۆرە سەبارەت بە مافەكانی مرۆڤ و پێشێلكارییەكان و هەوڵ دەدەن دەوڵەتەكان بخەنە ژێر گوشار بۆ ئەوەی كە سیاسەتەكانیان لە هەمبەر مافەكانی مرۆڤ بگۆڕن. ئەو ڕێكخراوانە ڕاگەیاندن وەك ئامرازێكی كاریگەر بۆ ئاشكراكردن و شەرمەزاركردنی پێشێلكردنی مافەكانی مرۆڤ لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە بەكاردێنن، هەندێك لەو ڕێكخراوانە تەنیا لەسەر ئاستی ناوخۆیی دەوڵەتان كاردەكەن و هەندێكی تر نێونەتەوەیین، هەر بۆیە ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان بڕیارێكی تایبەتی لەم بوارەدا دەركردووە كە بەپێی بڕیارەكە، ئەو ڕێكخراوە ناحكومیانە ڕۆڵێكی بەرچاویان لە پەرەپێدانی دیموكراسی و ئازادی و خزمەت بە مافەكانی مرۆڤ دەگێڕن، هەر بۆیە مافی كاركردنیان هەیە و لە ساڵی (١٩٩٨) كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتووەكان بڕیارێكی سەبارەت بەم ڕێكخراوانە پەسەندكرد (بەرگەم، ٢٠١١: ل١٣٣).

ڕێكخراوە ناحكومییەكان لە سەردەمی بەجیهانیبووندا، ڕۆڵێكی كاریگەریان هەیە لە بواری پاراستنی مافەكانی مرۆڤ و ئازادییەكان كە هەندێجار لەلایەن دەوڵەتەوە هەوڵی سنووردار كردنیان دەدرێت، لە سەردەمی بەجیهانیبوون ئەم ڕێكخراوانە چ لە ڕووی هێز و چ لە ڕووی ژمارەوە ڕوو لە زیادبوونن و كار لەسەر

پرۆسەی دیموکراتیزاسیۆن دەکەن، هەندێك لەم ڕێکخراوانە بۆ نمونە چاودێری باش بەڕێوەچوونی هەڵبژاردنی دەوڵەتەکان دەکەن و هەندێ تر کار لەسەر دیموکرسی بوونی کۆمەڵگەکان و نەهێشتنی جیاکاری ڕەگەزی و ئەتنی یان کەمینە نەتەوەییەکان و ئایینییەکان و یان بابەتی ژینگە دەکەن (باسام، ٢٠٠٩: ص٢٨٥). هەرچەندە دەوڵەتان تائێستاش لە ڕووی یاساییەوە نوێنەرایەتی نەتەوەکان دەکەن بەڵام لە ئێستادا لەتەك دەوڵەت ڕێکخراوە ناحکومی و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان ڕۆڵیان هەیە لە بواری جیاجیا وەك: سیاسی، ئابووری، کلتووری، کۆمەڵایەتی و ژینگەیی و ... هتد، لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە کاریگەرییان هەیە، چونکە دەوڵەتان تێگەیشتن کە بە تەنیا ناتوانن ئەم ئەرکانە بەڕێوەببەن و چارەسەری کێشەکان بکەن و تاکە نوێنەری نەتەوەیی بن، لەو ڕووەوە دەوڵەتانیش دەستیان بە پێکهێنانی ڕێکخراوی حکومی نێونەتەوەیی کرد (IGO)، تاوەکو بەشێك لە ئەرکەکانی خۆیان بەوان بسپێرن، هەرچەندە بە تێپەڕبوونی کات ڕێکخراوە حکومییە نێونەتەوەییەکانیش نەیانتوانی لە پاڵ دەوڵەتان بە تەواوی سیستەمی نێونەتەوەیی کۆنترۆڵ بکەن و لێرەوە ئەوە بوو ڕێکخراوە نێونەتەوەییە ناحکومییەکانیش دروست بوون وەکو ئەکتەرێکی نێونەتەوەیی ڕۆڵیان لە سیاسەتی نێونەتەوەیی و تەنانەت بواری ناوخۆی دەوڵەتانیش پەیدا کرد (قەوام، ٢٠٠٩: ل١٠٣).

ئەنجوومەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی نەتەوە یەکگرتووەکان وا پێناسەی ڕێکخراوە ناحکومییەکان دەکات کە بریتین لەو ڕێکخراوانەی کە لە ڕێگەی سیستەم و ڕێککەوتنی دەوڵەتان دروست نابن، ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان دوو جۆرن حکومی و ناحکومی (NGO-IGO)، ڕێکخراوە حکومییەکان لەبواری کاروباری جیاوازی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و یاسایی، زانست و وەرزشی، ئایینی و مرۆڤی کاردەکەن. ڕێکخراوە ناحکومییەکان کاتێك دیارکەوتن کە کێشە و گرفتی مرۆیی و ژینگەیی سەریانهەڵدا بە ئامانجی دەستێوەردان لە

سیاسەتی دەوڵەتان، وەکو ڕێکخراوی لێبووردەیی نێونەتەوەیی، ڕێکخراوی پزیشکە بێ سنوورەکان و ڕێکخراوی ئاشتی سەوز و ... هتد، کە لەسەر بنەمای پشت بەستن بە ڕای گشتی جیهانی کار دەکەن، لەسەدەی بیستەم ئەم ڕێکخراوانە لە ڕووی ژمارەوە پێشکەوتنی گەورەیان بەخۆیەوە بینی، بە پێچەوانەوە کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان ئامانجیان قازانجە، لە چەندین ڕەگەز و لقی جیاواز لە دەوڵەتان پێك دێن و چالاکیەکان و بەرهەمیان جیهانییە، بەڵام ناوەندی بڕیارەکانیان هاوبەشە، هەرچەندە ئەم کۆمپانیایانە ئامانجیان قازانجە بەڵام ئەمڕۆکە کۆمەڵێك ئەرکی سیاسیشیان هەیە لە ڕێگەی میکانیزمە ئابوورییەکانەوە دەتوانن کاریگەرییان لەسەر سیاسەت هەبێت بەپێی ئەو توانا و قورساییە ئابوورییەی کە هەیانە، چونکە جیهانی سەرمایەداری لە دوو ڕەهەندی هێزی سیاسی دەوڵەتان و هێزی ئابووری کۆمپانیا فرەڕەگەزەکان پێکدێت (الصدیق، ٢٠٠٨: ص٧١).

نەتەوە یەکگرتووەکان سەرچاوەی گەورە و زۆری بۆ بەهێزکردنی دیموکراسی لە دەوڵەتاندا تەرخان کردووە، کە ئەویش لە ڕێگەی ڕێکخراوی نوێیەوە بەو پێیەی کە دیموکراسییەت گرنگی زۆری هەیە بۆ پەرەپێدانی مرۆیی. بانکی نێونەتەوەیی و سندوقی دراوی نێونەتەوەیی وادادەنێن کە ململانێیە نێونەتەوەییەکان پەیوەندی بە جۆری سیستەمی سیاسی دەوڵەتانەوە هەیە (بارانی، ٢٠١٢: ص٣٦٥).

ڕێکخراوە نێونەتەوەییەکان وادەکەن کە بەرژەوەندی نەتەوەیی بۆ ئاستی بەرژەوەندی گشتی نێونەتەوەیی بگوازنەوە و وادەکەن دەوڵەت لە سنووری قۆرخکراوی خۆیان ڕادەکێشنە بازنەی هاریکارییە نێونەتەوەییەکان، ئەمەش دەبێتە هۆکارێك بۆ کەمکردنەوەی ململانێ و سەقامگیری و ئاشتی (قەوام، ٢٠١٢: ل٣٦١). چەمکی ئاسایش ئیمرۆکە تەنیا سنووردار نەکراوە، لە پاراستنی گیان و داراییەکان و ماڵ یان ڕێگەگرتن لە تاوان، بەڵکو درێژکراوەتەوە بۆ چەند بوار و ڕەهەند و شێوازێکی گشتگیر، ئاسایشی تاك و کۆمەڵگە دەگەڕێتەوە بە هەموو دامەزراوە حکومی و ناحکومییەکان، ئەرکەکانی ئاسایش

لە بنەڕەتدا، بەردەوام دەگۆڕێت و پێشدەکەوێت و سەرکەوتنی ئەم ئەرکانە لەسەر دەستکەوتەکانە، چونکە ئاسایش بریتییە لە پێداویستیەکی مرۆڤایەتی و پێویستیەکی بنەڕەتییە بۆ تاك، کۆمەڵگە، دەوڵەت، لە ئێستا و داهاتووە (صادق الشريف، ٢٠٠٧: ص١٣٦).

هەروەها ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان و هەموو دام و دەزگا و بەشەکان بەپێی بەڵگەنامە ڕاگەیاندراوەکانی ئەم ڕێکخراوە کار بۆ پاراستنی ئاشتی نێونەتەوەیی لە ڕێگەی بەرگری لە دیموکراسی و پاراستنی مافەکانی مرۆڤ دەکات، ڕێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتیەکان لە ئامانج و ئەرکەکانی ئەم ڕێکخراوەیە. ئەمەش لە ڕێگەی دەرکردنی ڕاگەیاندراو و بڕیار لەبارەی چۆنییەتی هەڵسوکەوتی دەوڵەتان لەگەڵ هاووڵاتیەکانیان و ڕەچاوکردنی ئازادییە سیاسییەکانیان و یان سزادانیان، چونکە پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و ئازادیە سیاسییەکان و بوونی سیستەمە سیاسییە دیکتاتۆریەکان بنەماکانی سەرەکی ئاشتی و ئاسایشی نێونەتەوەیی دەخەنە ژێر هەڕەشە و مەترسیەوە (غالی، ١٩٩٨: ص١٣٦). بڕوا و متمانەی هاووڵاتیان بە دامەزراوە سیاسییەکانی دیموکراتیك و کاریان لە چوارچێوەی دامەزراوە مەدەنییەکان دەبێتە هۆی سەقامگیری و پێشکەوتن و گەشەپێدانی سیاسی و ئابووری و بەرزبوونەوەی متمانەی هاووڵاتیان بە یەکتری و بە دەسەڵات کە ئەویش وادەکات کێشە و گیروگرفت کەمتر ببێتەوە و چارەسەرکردنیشی ساناتر بێت (عباس زادە و کرمی، ٢٠١١: ص٤٩). کردەوەکانی نێونەتەوەیی دەربڕی ئەو ڕاستیەن کە زۆربەی ئۆپراسیۆنەکانی پاراستنی ئاشتی لەخۆگری دامەزراندنی دیموکراسی و پشتیوانی لە مافەکانی مرۆڤە، کە ئەمەش بەتایبەت لە پاش ساڵی (١٩٩١)ـەوە لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئەنگۆلا، مۆزەمبیك، ئیکوادۆر، کەمبۆدیا، یوگسلافیا و عیراق و ... هتد، دەبینین (غالی، ١٩٩٨: ص٢٩١).

هەروەها ڕاگەیاندراوی هەزارەی ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان ( United Nations: Millennium Declaration) لە ساڵی (٢٠٠٠)ــدا، كە جەخت لەسەر ئازادی، یەكسانی، یەكگرتوویی، ڕێز لە سروشت و ژینگە، بەرپرسیاریەتی هاوبەش و لە بواری ئازادیدا جەخت لەسەر سیستەمی دیموكراتیك لەسەر بنەمای بەشداری هاووڵاتیان و ویستی گەل و مافەكانی پەیوەندیدار بە ئازادی بە باشترین شێوە دەكاتەوە (احتشامی، ٢٠٠٩: ص٢٥).

### ٥.٢.٦ـ ژیـــنگە:

پرسی ژینگە لە سەردەمی بەجیهانیبوون بۆتە پرسێكی جیهانی، چونكە هۆكار و مەترسییەكانی ژینگە كاریگەری و دەرئەنجامی جیهانیان هەیە، وەكو: گازی ژەهراوی بەرهەمهاتوو لە سوتەمەنییەكان، كونبوونی ئۆزۆن، گەرمبوونی زەوی، پیسبوونی دەریا و زەریاكان، بارانە ئەسیدیەكان، كەمبوونەوە و لەناوچوونی گیاندار و ڕووەك و .... هتد، كە كۆمەڵێك هۆكارن كە ئاووهەوا و خاك، ڕووەك و گیانداران بكەونە مەترسییەوە، كە ئەمەش لە دەرەوەی توانای دەوڵەتە بۆ چارەسەركردنی ئەم كێشە و پرسانە، كە ئەمەش دیسان سنووری دەسەڵاتی دەوڵەت دەبەزێنێت و دەبێتە كێشە و پرسی مرۆڤی و كۆمەڵایەتی و كاریگەری لەسەر هەژاری و برسیەتی دەبێت بەهۆی پەیوەندی بە دابینكردنی خۆراك بۆ مرۆڤەكان و دواتر پرسی ئاسایشی خۆراك (گوڵمحەمەدی، ٢٠٠٧: ل٨٦).

زنجیرە كۆبوونەوەی (گۆی زەوی) لە ساڵی (١٩٩٢) بە هاوكاری ڕێكخراوی نەتەوە یەكگرتووەكان لە شاری ڕیۆدۆجانیرۆی بەرازیل بە بەشداری (١٧٨) دەوڵەت سەلمێنەری ئەم بابەتە بوو، لەم كۆبوونەوەیە ڕایانگەیاند كە ژینگە سیاسەتێكی بەرفراوانە و هاوتایە لەگەڵ ئابووری نێودەوڵەتی و ئاسایشی نەتەوەیی، ئەم كۆبوونەوەیە یارمەتی ئەوەیدا ناوەندی سەرنجەكان لە ئاسایشی یەكلایەنەوە بەرەو ئاسایشی فرەلایەنە ئاراستەكەی بگۆڕێت، واتە ڕوون بۆوە

هەوڵی ناهەماهەنگ و یەکلایەنەی دەوڵەتان بێسوودە و هەر دەوڵەتێك لە پێناو پاراستنی ژینگەکەی خۆی پێویستی بە هاوکاری دەوڵەتانی دیکە هەیە (حسێن تاشان، ٢٠٠٧: ل٢٠).

لەسەردەمی بەجیهانیبووندا کۆمەڵێك ناوەندی زانستی و ڕێکخراوی حکومی و ناحکومی و ناوچەیی و ناوخۆیی و نێونەتەوەیی جەخت لەسەر ژینگە و پاراستنی وەکو بەشێکی گرنگ لە ئاسایشی مرۆڤ دەکەنەوە و بەجیهانیبوون ئەم دەرفەتەی پەیوەندی لەم بوارە و هەروەها پەیوەست بوونی پرسە ناوچەیی و ناوخۆییەکان بە پرسە سەروونەتەوەییەکانی خولقاندووە و ژینگەش یەکێك لە پرسە گرنگەکانە و بەجیهانیبوونی ئابووری و پیشەسازی هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ژینگە دروستکردووە و ئێمە دەبینین کە کۆمەڵێك پەیماننامە بۆ ڕێگەگرتن لە هەڕەشە بۆ سەر ژینگە و ژیانی مرۆڤ لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا ئیمزا کراوە، کە ئاسایشی دەوڵەتان پێکەوە دەبەستێتەوە (شولت، ٢٠٠٣: ص٩٠٠). ڕێککەوتنامەی گۆڕانکاریەکانی ئاووهەوا (١٩٩٢) و ڕێککەوتنامەی کیۆتۆ (١٩٩٧)، ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن کە گەرمتربوونی زەوی، ناسکتربوونی لایەی ئۆزۆن، بارانی ئەسیدی و لەناوچوونی بوونەوەرەکان و ژینگە و پیسبوونی، کاریگەری نەرێنی لەسەر ئاسایشی دەوڵەتان و تاکەکان و ئاسایشی نێونەتەوەیی هەیە (میتو و شامبوگ، ١٩٩٩: ص١٢).

لە بواری ژینگەدا ڕوانگەی نوێ بۆ سیاسەتدانان هاتۆتە ئاراوە، بەم مانایە کە بەکارهێنانی بەبێ چاودێری ژینگە، کۆمەڵگەی تووشی قەیران کردووە و ئەمە تەنیا بە دەوڵەت و بە زۆر و هێز ناکرێت بەڵکو پێویستە خوودی هاووڵاتیانیش ئەو مەترسیانە بڕەوێننەوە و پاڵپشتی لە سیاسەتە ژینگەییەکان بکەن کە هەڕەشەیە بۆ ژیانی تاك و کۆمەڵگەی ناوخۆ و نێودەوڵەتی، بۆ نموونە: پاڵپشتی لە کۆنترۆڵ و کەمکردنەوەی دانیشتوان، بەشداری لە پاککردنەوەی ژینگە، بەشداری لە پڕۆژەکانی سیستەم لەهەمبەر کەمکردنەوەی پیسکردنی ژینگە و

دروستكردنی رێكخراوی سەربەخۆ بۆ ژینگە و .... هتد (اسوليوان، ٢٠٠٩: ص٣٤٢). رەهەندی ژینگەیی ئامانج لێی پاراستنی ژینگەیە لەو هەڕەشە و مەترسیانەی كە هەیە، هەروەها پیس بوونیان بەتایبەت ئەو دانیشتوانانەی كە نزیكن لە كارخانەكان، دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە ئاو و خاك و رووەك، هەروەها پیس بوونی دەریاكان كە زیان لە ژیانی ئاویی و سامانی ماسی دەدات، ئەمانەش سەرچاوەی داهاتی نەتەوەن (**الساعدي**، ٢٠٠٩:ل٧٠٩).

لە روانگەی باری بۆزانەوە ئاسایشی ژینگە لوتكەی ئاسایشی دەوڵەت و كۆمەڵگەیە و ئەو دەوڵەتەی گرنگی بە پاراستنی ئاسایشی ژینگە دەدات دەوڵەتێكە كە گرنگی بە پاراستنی سروشت و بوونەرەكان بەگشتی و مرۆڤ بەتایبەت دەدات، پێی وایە پیسبوونی ژینگە پەیوەندی هەیە بە مامەڵەكردنی نابەرپرسیارانەی دەوڵەتان لەگەڵ ژینگە و هەروەها گرنگی پێنەدان بەو پرەنسیپە مرۆییانەی كە بوونەتە بەهایەكی باڵای جیهانی. پرسی ژینگە لە روانگەی بۆزانەوە بریتییە لە رەهەندێكی سەرەكی ئاسایشی كۆمەڵگەیی كە ئەویش رەهەندێكی سەرەكی ئاسایشی نەتەوەییە. بەشێوەیەكی گشتی پاراستنی ژینگە یەكێكە لە پرس و پرەنسیپەكانی سیستەمێكی دیموكراسی. بۆیە لەو دەوڵەتانەی كە خاوەن سیستەمێكی دیموكراسیین زیاتر گرنگی بە ئاسایشی ژینگە وەكو رەهەندێكی سەرەكی لە ئاسایشی نەتەوەیی دەدەن.

## ٦- دەرئەنجام:

لە كۆتاييدا گريمانەكەمان سەلمێنرا كە بريتى بوو لەوەى كە ((لە ئێستادا ديموكراسى ڕەگەزێكى نوێيە لە ئاسايشى نەتەوەيى، بەهۆى ئەوەى ئەمڕۆكە ئاسايشى نەتەوەيى فرەڕەهەندە و تەنيا بريتى نييە لە ڕەهەندى سەربازى، بۆيە لە سيستەمێكى ديموكراسيدا هاوولاَتيان و كۆمەڵگە باشتر ئاسايشيان پارێزراوە)).
هەروەها گريمانە لاوەكيەكان بريتى بوون لە: لە ڕوانگەى نوێ ئاسايشى نەتەوەيى بريتييە لە دەستەبەربوونى ماف و ئازادييەكانى هاوولاَتيان كە بريتييە لە ئاسايشى هەموو كۆمەڵگە بەبێ جياوازى. لە سيستەمێكى ديموكراسى سەرچاوەى ئاسايش و سەقامگيرى كۆمەڵگەيە و ئاسايشى نەتەوەيى ڕەنگدانەوەى ويست و داواكارى و پێداويستى ماددى و مەعنەوى هاوولاَتيانە كەواتە ڕەنگدانەوەى ديموكراسييەتە، لە سيستەمێكى ديموكراسى باشتر ئاسايشى نەتەوەيى دەپارێزێت.

هەروەها بەم شێوەيە وەلاَمى پرسيارەكان درايەوە كە لە چەند خالێكدا دەيخەينەڕوو: ئاسايشى نەتەوەيى ڕاستەقينە پێويستى بە سيستەمێكى ديموكراسى هەيە، بەو پێيەى كە ديموكراسى لەسەر بنەماى بەشدارى هاوولاَتيان بەبێ جياوازى لە پرۆسەى سياسى بۆ درووستكردنى بڕيار دەبێتە هۆى ئەوەى كە هاوولاَتيان ببنە سەرچاوەى هێز بۆ ئاسايش، چونكە لە سيستەمێكى ناديموكراسى بە پێچەوانەوە، ناڕەوايەتى سيستەم و نادادپەروەرى نارەزايى هاوولاَتيانى لێدەكەوێتەوە و چەندين كێشە و گرفتى قوول لە ناوخۆ و لە دەرەوە سەر هەلّدەدەن كە دواجار دەبنە مايەى ناسەقامگيرى و لەلايەكى تر، سيستەمێكى ديموكراسى دەتوانێت چارەسەرى ئەو مەترسى و هەڕەشە نوێيانە بكات وەك هەژارى، نەخۆشى، نەخوێندەوارى، تيرۆر، ماددەهۆشبەرەكان، بێكارى، جياوازى

ڕەگەزی، تاوان و تاوانکاری و پیس بوون و لەناوچوونی ژینگە و ... هتد، بەهۆی ئەوەی کە دیموکراسی کاریگەری لەسەر پەرەپێدانی ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتی و کەلتووری هەیە، چونکە زۆر لەو کێشە و گرفتانە لە دەرەنجامی دواکەوتووی دەوڵەت و کۆمەڵگە لەم بوارانەدایە، کە دواجار سەردەکێشێت بۆ هەڕەشە و مەترسی بۆ سەر ئاسایش.

بیر و بۆچوونەکانی باری بۆزان و هاوکارەکانی لە بواری ئاسایش پەیوەندی بەو گۆڕانکاریانەوە هەیە کە بەسەر چەمکی ئاسایشدا هاتووە، چونکە لەسەردەمی ئێستادا چەمکی ئاسایش، چەمکێکی فرە ڕەهەندە و لەپاڵ ڕەهەندی سەربازی، ڕەهەندی ئابوری، سیاسی، کەلتووری، ژینگەیی و کۆمەڵگەیی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی درووست بووە، بەهۆی ئەوەی کە جاران سەرچاوەی ئاسایش تەنها بریتی بوو لە دەوڵەت کە ئەویش لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزی سەربازی بۆ خۆ پاراستن و بەرگری کردن بوو لە بواری دەرەکی، بەڵام لە ئێستادا هەندێك پرس کە بوونەتە کێشەی ناوەخۆیی و کاریگەریان لە سەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە وای کردووە کە ئاسایشی کۆمەڵگەیی گرنگی پەیدا بکات، چونکە زۆربەی ئەو کێشانەی کە لەسەر ئاستی ناوخۆ دەبنە هۆی ناسەقامگیری و نەبوونی ئاسایش لە دەرئەنجامی پێکدادانی هێز و گرووپ و لایەنە ناسنامەییەکان و بەرژەوەندییە جیاوازەکانە کە بەهۆی جۆری سیستەمی سیاسی و شێوەی هەڵسوکەوتی سیستەم لەگەڵ ئەم ناسنامە و بەرژەوەندییە جیاوازانە، درووست دەبێت، بۆیە لێرەوەیە لە پاڵ دەوڵەت کۆمەڵگەش بۆتە سەرچاوەی ئاسایش، بۆیە دەتوانین بڵێین بەهۆی ئەوەی کە دیموکراسی گونجاوترین میکانیزمە بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشە و گرفتانە لە ڕێگەی ئاشتیانە و لەسەر بنەمای داننان بە ناسنامە و ماف و ئازادییە گشتییەکانی تاك و گرووپ لایەنە و کۆمەڵایەتییەکان، کە دواجار دەبێتە مایەی سەقامگیری و ئاشتی و ئاسایشی کۆمەڵگە و بەگشتی ئاسایشی نەتەوەیی.

وەك چۆن ناوەرۆكی دیموكراسی ئازادییە، بەهەمان شێوەش ناوەرۆكی ئاسایش هەستكردنە بە ئازادی، بۆ ئەوەی هاووڵاتیان لە كۆمەڵگەدا هەست بەئاسایش بكەن دەبێت لە بارودۆخێكی ئازاددا بژین و لێرەوە دیموكراسی دەتوانێت زەمینەیەكی ئازاد بڕەخسێنێت بۆ هاووڵاتیان كە لە ڕێگەی كەناڵە جۆراوجۆرەكان وەك: ڕاگەیاندن، ڕێكخراوەكانی كۆمەڵگەی مەدەنی، ڕای گشتی و ... هتد، بتوانن بە ئازادی و بەبێ ترس گوزارشت لە ناسنامە و بەرژەوەندییەكانی خۆیان بكەن، بوونی ئەم كەناڵانە لە سیستەمی دیموكراسیدا دەبێتە فاكتەرێك بۆ چارەسەركردنی كێشە و گرفتەكانی ناو كۆمەڵگە لە لایەك و لە نێوان دەسەڵات و كۆمەڵگە لەلایەكی تر. دابینكردنی ئاسایش هەمیشە پێویستی بە دروستكردنی هاوسەنگی بە شێوازێكی یاسایی و دادپەروەرانە هەیە لە نێوان هاووڵاتیان و گروپە جیاوازەكانی ناو كۆمەڵگە، نایەكسانی و نادادپەروەری كێشەی ئاسایشی لێدەكەوێتەوە، لەهەمانكاتدا ڕەوایەتی دەسەڵات دەخاتە مەترسی و ژێر گومان، بۆیە بنەماكانی دیموكراسی پێویستییەكن لە پێویستییەكانی دابینكردنی ئاسایشی نەتەوەیی.

یەكێك لە سەرەكیترین بنەماكانی دیموكراسی یەكسانییە و لەهەمان كات یەكسانی كاریگەری ڕاستەوخۆی لەسەر ئاسایشی نەتەوەیی هەیە چونكە هەر كاتێك سیستەمی سیاسی لەسەر بنەمای یەكسانی هەڵسوكەوت لەگەڵ هاووڵاتیان یان گرووپ و چینەكانی هاووڵاتیان ناكات، ئەوە لە مەودای نزیك یان دوور لێكترازانی كۆمەڵایەتی و سیاسی لێدەكەوێتەوە كە ئەمەش كاریگەری لەسەر یەكگرتوویی دەوڵەت هەیە. چونكە كاتێك كۆمەڵگە هەست بە نایەكسانی و نادادپەروەری دەكات لەلایەن دەوڵەتەوە، ئەمە دەبێتە هۆی درووستبوونی نارەزایی و هەندێك جاریش توندوتیژی و ناسەقامگیری لێدەكەوێتەوە، بۆیە تا دەوڵەت زیاتر گرنگی بە بنەمای یەكسانی بدات، زیاتر دەتوانێت یەكگرتوویی و ئاسایشی خۆی بپارێزێت، پێویستە سیستەمێكی دیموكراسی بۆ پاراستنی

